# بەهار و گولزار



کتێبێکە بە پەخشان و هەڵبەست
لە بارەی ڕەوشتی ئاینی و کۆمەڵایەتییەوە



خوا لێ خۆش بوو مامۆستا
مەلاعەبدولکەریمی مودەڕڕیس

«خزمەتگوزاری زانست و ئایین لە بارەگای
شێخ عەبدولقادری گەیلانی قدس سرە»
دایناوە

# بەهار و گوڵزار

کتێبێکە بە پەخشان و هەڵبەست
لەبارەی ڕەوشتی ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە

( بەهار و گوڵزار ) بۆ دۆستانە
بۆ سەیرانی دڵ باخ و پێستانە
بۆ تەمێی کۆمەڵ بە دەرسی ڕەوشت
دایم دەرگای خۆی خستوەتە سەر پشت

مەلا عبدالکریمی مدرس

خزمەتگوزاری زانست و ئایین
لە بارەگای ( شێخ عبدالقادری گەیلانی ) قدس سرە
داینــاوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٧

مدرس، عبدالکریم، ۱۹۰۵ ـ ۲۰۰۵ م modarris, abdol - karim

بەهار و گولزار / مەلا عبدالکریمی مدرس . ـ ـ سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸۵.

۳٦۷ص.

ISBN: 964-7638-42-6

فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.

کردی.

چاپ قبلی: محمدی، ۱۳۷٤.

۱. اخلاق اسلامی. ۲. اخلاق اسلامی ـ ـ شعر. ۳. شعر کردی ـ ـ قرن ٤ق. الف. عنوان.

۹ب۳۷م/BP۲٤۷/۸ ۲۹۷/٦۱

۱۳۸۵

کتابخانه ملی ایران ۱٤۷۳۵ ـ ۸۵م





انتشارات کردستان

Kurdistan Publication

سنه ـ پاساژی عیززەتی ـ تەلەفوون ۲۲۶۵۳۸۲


# بەهار و گوڵزار



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | بەهار و گولزار |
| ✓ دانراوی (تألیف): | مەلا عبدالکریمی مدرس |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول): ۱۳۸۷ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۲۰۰۰ دانه (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۳۶۸ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی: ۲۸۰۰ تمەنە

شابک: ۶ـ۴۲ـ۷۶۳۸ـ۹۶۴

ISBN: 964 - 7638 - 42 - 6

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، والصلوة والسلام على سيدنا محمد و آله وصحبه واتباعه باحسان الى يوم الدين .

پاش سوپاسی پەروەردگار و سەلام لە ڕەهبەری نازدار و یارانی فیداکار و خزم و کەس‌وکاری ، عەرزم ئەمەیە کەوا هەر کەس بەگوێرەی توانا و لێهاتنی خۆی خزمەتێك پێشکەش بکا بە هاوزمان و هاونیشتمانانی خۆی ، هەمیشە لە مەیدانی تێکۆشانا بۆ بەختیاری جێگە دەستی دیار ئەبێ . لەبەرئەوە وا منیش ئەم کتێبەم ڕازاندەوە بە ئامۆژگاری دینی و دنیایی بەگوێرەی ئوسـوڵی ئایینی ئیسلام و ، بە ئەستێرەی درەخشانی ئایەت و حەدیثی پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ نەخشاندم و ، گوڵ گوڵ ڕیزم‌کرد و ، بۆ هەر ڕەوشتێ گوڵێکم دانا . پاش باس‌کردنی هەر مەبەستێکیش بە بلاوێ ، بە شیعریش هۆندمـەوە و ، ناوم‌نـا ( بەهار ) . هیوادارم ببێ بە مایەی پیرۆزی و بـەختیاری بـۆ لاوان و پیرانی هاوزمان و هاونیشتمانم ( و من الله التوفیق ) .

## پێشـــەکێ

بەهـار و گوڵـزار شـیفای ئازارن جیلوەگـای ئـالای بـالای نـازارن
نیشاطن بـۆ ڕۆح ، شادین لە بۆ دڵ مایەی ئـازادین بـۆ نەوای بولبـوڵ
مژدەی تەماشـای ڕوی گوڵان ئەدەن نەشمەی ڕۆح‌ئەفزا بـە دڵان ئـەدەن
گوڵزار بـۆنی گوڵ ئـەدا بە شەماڵ شەماڵ ئەیگێڕێ و ئەیبـا ماڵ بە ماڵ
بەرەبـەیانان دەمـاخی یـاران پڕئەکا لـە بۆی خۆش‌بۆی گوڵزاران

★ ★ ★

بەهار بـە جیلوەی گوڵزاری ڕەنگین ئەڕازێتـەوە بـە لالـە و نەسـرین
ئەبێ بە بەهەشت سارا و دەرودەشت یارانیش ئەبن بـە حۆری بەهەشت

بەهار ڕۆباران لـە کێـو دێنە خـوار      پێچ لە خۆ ئەدەن بە وێنەی ڕەشمار
واتـە ڕۆبـــاریش دڵ پڕینـــدارە      دێوانـە و دەلـۆی دیـداری یـارە

★ ★ ★

ئاخ ئـەو دلبـەرە دلی دەلـۆ کـرد      دڵبیمـــارانی بـێ گفتـوگۆ گـرد
بۆ قەت جۆت نەبۆ لەگـەڵ دلداری      تیمـاری نـەکرد دڵـەی زامـاری
دیـارە ئەیـەوێ عاشـــق بکوژێ      تا خـاکی گوڵـزار خـوێنی بمـژێ
عاشقی دامـاو بەشـی کوشـــتنە      دلبەریش بەشـی لـە خوێن ڕشتنە

★ ★ ★

بەهار بـە بـاران گـوڵان ئەڕوێنێ      گوڵزار بـە گـوڵان بـاڵا ئـەنوێنێ
بەهـــار هێزێکـی تـــازە ئـەهێنێ      بەهەشتی جیهـان بـۆ گیان ئەنوێنێ
بە بێ تاریکێ سـەرچاوەی حـەیات      دەرئـەخا لـە بـۆ هـەمۆ نامیـات
ئەدا بـە گیاندار نەشـەی دڵشادێ      بە گیـایش ئـەدا گەشـەی زیـادێ
داری دارســـتان چـرۆ دەرئـەکا      خۆی بەســـەر ئەرزا جیلوە دەرئەکا

★ ★ ★

بەهار بـە شنۆی سـروەی بەیانێ      دڵ ئەکـاتــەوە بـــۆ ژینـــدەگانێ
خونچـە لـە ذەوقـا ئەگەشـێتەوە      بولبـول لـە عەشــقا ئەشـنێتەوە
دێتـە سەر ئەوا بە هەوای ڕۆی گوڵ      شەیدا ئەبێ بۆی مـەردی خاوەندڵ

★ ★ ★

بەهار بـە سـۆدە بـە باران و بـا      سارا و دەشت و دەر تۆزی لائـەبا
ڕۆبار دێتە جۆش لە ڕۆی کۆساران      سەرئەدا لە بـەرد وەکۆ سـاداران
تافان دائـەڕژێن بەســەر شـاخانا      جۆبار دێنـە جـۆش بەنـاو باخانا

★ ★ ★

بەهـــار بەشـێکی ژیواری جیهـــان      لە مل خۆ ئەگـرێ بـۆ گیانلەبەران
بێجگە لەمـانە بـە خۆشـێ بەهـار      ئـەڕوا مانـەمی زستـانی نـابـار
کورەی دۆزەخی گەرمی سـەرزەمین      ئەگۆڕێ بە باخ بە گـوڵ بە نەسرین

★ ★ ★

ئەم باسە لەســـەر مەعنـای بەهارە      لەسەر ئەو شێوە کـە بۆ عام دیارە
بەلام بە مەعنـای عینـوانی دەفتەر      بەهار ئوستادە بـۆ دەرسی بەشـەر
بۆیـان دەرئـەخا ڕێـی بـەختیارێ      تا پیادا بـڕوا خـاوەن هوشـیارێ
بۆ دیـن و بـۆ ژیـن بـۆ ئاوەدانێ      بۆ عیلم و زانست بۆ خۆی ئینسانێ

بـۆ بەرزکردنەوەی پایەی نیشتمان   بە عەقڵ و عیلـم و کردەوە و پەیمان
بـۆ ڕۆڵەی گـەنجم هـەتا تێبگەن   بـۆ خـاوەن ڕەنجـم هـەتا پێبگەن

★ ★ ★

جا ئـەم مامۆستا ئوسـوڵی وایـە   دەرسـێ دائـەدا پـڕ بێ لـە مایـە
سەرلەوحەی دەرسـی ئایەتی قورئان   یاخود فەرموودی ڕەهبەری جیهـان
یەعنێ ( محمـد ) ڕەهبـەری ئەمین   مەبعـوثی خـودا بـو لای عالەمـین
هەرکەس بۆ گەلی بەختیاری خـۆی   خزمەتێکی کـرد بەش‌بەحاڵی خۆی
منیش بـە نەشەی یـارانی سـامێ   بە ذەوقی (سعدی) و (جامی)و(نظامی)
هەرچەند بێ‌ناوم خۆم کرد بە (نامێ)   ئەم خزمەتەم کرد بۆ گەل بـە عامێ
دەرسی پیرۆزی خوا و ڕەوشتی چاك   لەسەر فەرموودەی سـەییدی (لولاك)
لەگـەڵ وتـاری پێشـینانی خـۆم   لەوانـەی بەنرخ دەرکـەوتوون بۆم
کردم بـە نامەی بەختیـارێ گـەل   بۆ ئەندێشەی پاك ، بۆ عیلم و عەمەل
پێشکەشم کردن بە بەچکەی مەردان   بە ڕۆڵەی هوشیار لە گەلی کوردان
دەس‌بەدەس ئـەگا تەختی فەیرۆزی   دەم بە دەم ئـەگا دەرسـی پیرۆزی
هەرکەسێ سەرێ،هەر سەر دەماخێ   بۆ هـەر دەمـاخێ ئامـانج و داخێ
ئامانجی ( نامێ ) لـەم ڕۆی دنیایـە   تەعلیمی چـاکە و عەفوی خودایـە
وا دەست پێ‌ئەکەم بە مەقصوودی خۆم   ڕەحمەت لەو کەسە دوعـا ئەکا بۆم
وەهای دائەنێـم بەهـار بـە بـاران   دار گوڵ ئەڕوێنێ لـە بـۆ دڵداران
هەر گوڵێ بـۆنی ئـەدا لـە دەماخ   بە وێنەی بـۆنی وەنەوشە و گوڵباخ

★ ★ ★

# گوڵی یەکەم ـ گوڵی ئایین پەرستێ

## انَّ الدیـنَ عندَ الله الاسـلامُ

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی ئایینێ کە بەلای خواوە بەنرخ‌بێ ئایینی بەرزی ئیسلامە . ئیسلام بریتییە لە مل کەچ‌کردن بۆ فەرمـانی خـوای تەعالا بە هەمو جۆرێ و لە هەمو کات و شوێنێکدا بەو ئوسوڵە کە لە قورئـاندا هەیە و ڕەهبەری نازدار ڕای گەیاندوە پێمان .

ئایین‌پەرستێ پێویستە بـۆ ئادەمیزاد . هەرکەسـێ تۆزێ ورد ببێتەوە تێ‌ئەگا کەوا ئادەمیزاد لەم جیهانەدا بەتەنها ناژێ و ئیش‌وکاری ژیانی بەتەنهـا خۆی تەواو نـابێ . کەواتـە ئادەمیـزاد بە سروشـت ڕۆ لە کۆمەلایەتیـیە .

لەبەرئەوەش کە هەرکەس سوودی بۆ خۆی ئەوێ ، هەمیشە خەڵك لەناو خۆیانا ئەکەونە کێشمەنکێش . کەواتە یاسایەك پێویستە بۆیان بیکەن بە ڕێ پیشاندەری خۆیان و ئەبێ ئەوەنــدەش پیرۆز بــێ لەســەر فەرمــانی ئــەو بەڕێوەبچــن . یاسایەکی وایش ئەوەندە پیرۆز بێ خەڵك بە دڵ ڕاگیری کەن تەنها هەر ئایینە .

ئەگەر کەسێ بڵێت یاسای دانراوی ئادەمیزاد خۆی بۆ ئەم مەبەستە بەسە، کەواتە ئیتر پێویست بە ئایین نیە ، ئەڵێین ڕاستە یاسایەك ئادەمیزاد خۆی دابنێ ئازادەیەك سوودبەخشە ، بەڵام بەش ناکا . چونکە ئادەمیزاد هەرچەنــد لەســەر ئەو یاسایە بەعەقڵ و هۆش پایەدار بێ، هێشتا گەلێ جار ئارەزووی نەفس وکینەی دەروون هێرش دێنێ بەسەریا . لێرەدا پێویست بە زۆری زۆرداریێ هەیە ، بەڵکو گەلێ جار زۆری زۆرداریش چــاری مەسەلەکە ناکــا لەبەرئــەوە کە ئینســانە خراپەکەرەکە خۆیشی زۆرداره یاخود لە شوێنێکی پەنامەکی وادایە کە زۆردار پێی نازانێ . لەکاتی وادا بێجگە لە ئایین و پەیوەندی ئادەمیزاد بە ئایینەوە و ترسی دوارۆژ و هیوای بەختەوەری ئەو دنیا هیچی تر نیە تاوانبار لە تاوان بگێرێتەوە. سەرەڕای ئەمەش ئادەمیزاد بەهۆی ئایین پەرستییەوە دڵ و دەروونی بــە نوری ئیمان و خواپەرستی ڕوون ئەبێتەوە و ڕیشەی گەلێ ئارەزووی نەفس و تاوانباریێ لە وجودیا ئەسوێ یا کز ئەبێ و ڕۆ ئەکاتە کردەوەی باش و لە کردەوەی ناڕەوا خۆی لائەدا .

گەلێ لە زانایان وتویانە ئادەمیزاد بە بێ ئایین پەرستی لە گیاندارەکانی تر جیا نابێتەوە ، چونکە هەر ئایینە ئەڵێ دنیــایەکی تر هەیە لەپــاش ئەم دنیایــە ئادەمیزاد پرسیاری تیا لێ ئەکرێ و بە پاداشــی کردەوەی چــاك یا خراپی خۆی ئەگات و ، ئەگەر ئەو ڕۆژی لێ پرسینەوەیە نەبێ ئینســان وەکو گیانلەبەرانی تــر ئەمرێ و ئەبڕێتەوە و ئەمەیش لەگەڵ عەقڵ و هۆش و بیری ساغدا یەك ناکەوێ . تەماشا ئەکەی دوو ئادەمیزاد یەکی صەد ساڵ عومر ڕائەبوێرن ، یەکێکیــان لــە هەموو ماوەی ژیانیا خەریکی ئارەزووبازیێ و ئاشووب سازیێ و کوشتنی ئادەمیزادی پاکی بێ تاوانە و لە هەرچی ڕەوشــتی چاکەیە دوورە و لــە هــەموو خراپەیەکدا بەشدارە . ئەوی کەشیان بە گیان و شان و ماڵ خەریکی خزمەت کردنی گورۆهی ئادەمیزاد و ڕێکخستنی ناوبەینیــان و بەختیــو کردنی بێ کەسانــە و لە هەرچی ڕەوشتی خراپەوەیە دوورە و هــەموو خولق و ڕەوشتێکی پەســەندی ئەوەندەی خۆی هەیە . جا چ عەقڵ و وژدان و بیروباوەڕێ ئەساچێنێ بەوە کە ئــەم دوو کەســە وەکو یەك بمرن و لە پاداشدا وەك یەك بن . باوەڕ ناکەم کەســێکی ژیــر هەبێ لای وابێ ئەو خێرۆمەندە لە پاداشی کردەوەی چاکی خۆی نائومێد ببێ و ، ئەو پیاو خراپەیش سزای خۆی نەیەتەڕێ . کەواتە بیروباوەڕی ڕوونــاك ، وەك ئایینەکانی خوا ، دان بە پاداشی دوارۆژدا ئەنێ .

لە لایەکی ترەوە هەر ژیرێ وردببێتەوە ئەزانێ لە جیهانا هیچ شــتێ نیــە

به بێ‌هۆ پەیدا ببێ . کەس نیە نانی بە ڕەنجی شانی خۆی یا یەکێکی‌تر نەبێ پەیدا بکا . کەواتە چۆن ئادەمیزادی فامیدە باوەڕ ئەکا ئەم جیهانە ڕازاوەیە کە وەکو بالاخانەیەکی پڕ لە شەمع و چراخانە و ئەم‌دەزگا و بارەگا بەرزە کە بە ملیارەها ئەستێرەی پڕشنگداری تیا ئەسوڕێتەوە بەدرێژایی زەمان و هەر یەکێ لەوانە ئەندازەیەکی تایبەتی هەیە لەو ئەندازەیە کەم و زیاد ناکا ، چۆن باوەڕ ئەکا ئەم دەزگا و بارەگایە خاوەنێك و دروست‌کەرێکی نەبێ یا خاوەن و دروست‌کەرەکەی بێ فام و شوعوور بێ ، یا فام و شوعووری ببێ ، بەلام بۆ ڕاگرتنی ئەو دەزگا و بارەگایە ڕەسا نەبێ و بەش‌نەکا . ئەمەیش دیسان لە هۆش و فامەوە دوورە .

بێجگە لەوە کە تەماشا ئەکەین ئەم یاسای پاکی ئیسلامە لەسەر بناغەی قورئانێك دامەزراوە و پڕە لە خێر و سوودی ئادەمیزاد و بۆ هیچ‌کەس ئەوەندەی مثقالە ذەڕەیەك ستەم ڕەوا نابینێ و یاسای فەرمانڕەوایی و فەرمان‌بەرداریی و دابین کردنی ژیانی بەختەوەر و ڕاگرتنی ئارامی و هێمنیی ولات و بەرگریی کردن لە دەست‌درێژیی و نامەردیی کردنی ستەمکار و ڕاگرتنی حەقی هەر خاوەن حەقێك و ئەدەب کردن لەوانەی شایانی حورمەت گرتنن و تەمێ‌کردنی ئادەمیزاد بۆ پشتەسووریی بە جیهاندار و چاودێریی کردنی خزمەتی ئەوی تیا هەیە . کەواتە ئادەمیزادی فامیدە بە هەر بارێکا بڕوانێ باوەڕ بەوە ئەکا کە دین و ئایین پێویستن بۆ بەختیاریی ئادەمیزاد و ، دینی پیرۆزی ئیسلامیش یەکە دینێکە شایانی ئەوەبێ هەموو هوشیاریی فەرمان‌بەرداریی لێ بکات .

پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموویەتی :

**الايمانُ أنْ تؤمِنَ بِالله وَ ملائِكَتِهِ وَ كُتُبِهِ و رُسُلِهِ و بِاليَوْمِ الآخِرِ و بِالقَدَرِ خَيْرِهِ و شَرِّهِ .**

واتە : ئیمان ئەوەیە باوەڕت ببێ بە خودا و بە فریشتەکانی خودا و بە پێغەمبەرانی خودا و بە ڕۆژی قیامەت و بە قەزا و قەدەر لە چاکە و لە خراپە کە هەمووی لە خواوەیە .

وا وردە وردە یەکە یەکەی ئەم مەرجانەی ئیمان و باوەڕ لێك‌ئەدینەوە .

مەرجی یەکەم کە باوەڕ بە خودایە ، واتە موسولمان پێویستە باوەڕی ببێ بەوە کەوا ئەم جیهانە جوانە کە ڕازاوەتەوە بە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەی بەتاو و بەم ئەرزە کە ئێمەی بەسەرەوە ئەژین و پڕە لە کانی بەنرخ و سەرچاوەی بەسوود و دەریای پڕ لە گەوهەر و خێر و بێر ، هەمووی یەك پەروەردگاری هەیە کە هەر بوە و هەر ئەبێ و تاق و تەنیایە و لە هیچ شتێ ناچێ و پێویستی بە هیچ شتێ نیە و زیندوە و زانایە و خاوەن خواست و توانایە و هەموو شتێ ئەبینێ و هەموو دەنگێ ئەبیستێ و خاوەن ( کەلام )ە لەگەل پێغەمبەرانا کە فروستادەی ئەون

بۆ سەر ئەم خەڵکە و هەر صیفەتێ بەرز و بێعەیب بێ هەمۆی هەیە و لە هەمۆ عەیبێ دوورە .

هەروەك چۆن هۆش و فام باوەڕ بەوە ناکا کەوا خانۆیەکی بە نەخش و نیگار لەخۆیەوە پەیدا بۆبێ و ، چرایەك لەخۆیەوە داگیرسابێ ، هەروا باوەڕیش ناکا کەوا ئەم جیهانە جوانە لە خۆیەوە پەیدا بۆبێ و بێ خاوەن و بێپەروەردگار بێ ، یاخود پەروەردگارەکەی بێهۆش و فام و ناتەوان و داماو بێ .

بەرزترین گیانلەبەر ئادەمیزادە . لای زۆرۆی هێزی زانستی ئەمیش ئەوەیە ڕێ بە هەندێ ئەسرار و نهێنێ وا ببا کە خودا لەناو کان و ئاو و هەوا و غازا دروستی کردوە و ، بەهۆی ئەوانەوە هەندێ شت دابهێنێ و سوودیان لێ وەربگرێت . ئادەمیزاد لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ کەسێك لەمە گەیشتوە و زوربەی ئەوەشی بۆ لێك‌نەدراوەتەوە . لەمە زیادتر ناتوانێ شتێك بە بێ مادە و مایە پەیدا بکا و ناتوانێ کزێ و داماوێ و مردن و ناتەواوێ لە خۆی دەربکا بەتەواوێ . تا گرێیەك ئەکاتەوە دەیان گرێ و کۆلێتری بۆ پەیدا ئەبێ ، چین لەسەر چین دێن و دەچن و هێشتا هەر بەشێکی زۆر لە دڵخوازەکانیان بۆ جێ‌بەجێ نەبوە . بەم‌جۆرە ئادەمیزاد هەروا بە مەراقەوە سەر ئەنێتەوە و ئەمرێ. جا کە ئادەمیزاد ئەمە حاڵی بێ ئەبێ حاڵی گیان لەبەرانی‌تر چۆن بێ !

کەواتە لەئەنجامی وردبونەوەی ڕاستدا پێویست ئەبێ لەسەر ئادەمیزاد کەوا باوەڕ بکا بەوە کە ئەم بارەگا بەرزە بەهێزی توانایێ پەروەردگارێ پەیدا بوە کە هەر ئەو ( واجب الوجود )ە و پێویستە بێ و هەر ئەو بۆئەوە ئەشێ کڕنۆشی بەندەیێ بۆ ببرێ و هەر ئەو ئەتوانێ هەر شتێکی بوێ لە نەبونەوە دروستی بکا . مەعنای ( لا اله الاّ الله )یش هەر ئەمەیە .

| | |
| --- | --- |
| ڕەحمەت لە ( بەهار ) کە دێتە وتار | بانگ ئەکا ئەڵێ ئەی ڕۆڵەی هوشیار |
| نابوود ناتوانێ نابوودێ دەرکا | بەرگی پەسەندی بوونی لەبەرکا |
| مردوێش ناتوانێ قەت بێ بە هۆ | بۆ زیندوێەکی خاوەن ڕەنگ و بۆ |
| زیندوێ نەزان و بێهێز و قەوام | نە خۆی و نە کەس ناخاتە سەر کام |
| زیندوێ‌زانیاری بێخواستو بێ‌دەس | بۆ کەس نایێتە دەستی فریادڕەس |
| دەی تەبیعەتی بێهۆشی نەزان | چۆن ئەبێ بە هۆی ئەرز و ئاسمان ؟ |
| یا دروست‌ئەکا مەجموعەی شەمسێ | یا ئەبێ بە هۆی نیظامی قودسێ ؟ |
| چلۆن پێی‌ئەکرێ ئیدارەی هەمۆ | ئەم ئەستێرانە کاتی هات‌وچۆ ؟ |

★ ★ ★

| | |
| --- | --- |
| مەجبۆری بەهۆش ئەی ڕۆڵەی دانا | دان بنێی بە ذات خودای تەوانا |
| باوەڕت بێ کە پەروەردگار | زیندوە و زانا و تەوانا و بەکار |

خۆی بۆ بە تەنیا ویستی خۆی دەرخا   خۆی پڕتەو بدا بەسەر ئەم چەرخا
بەو شێوە ویستی لە باڵا و پەستێ   دنیای لە نەبوون هێنایە هەستێ
لەسەر ئەو یاسا شەش ڕۆژی دانا   پلە دابنێ بۆ عەقڵی زانا
ئەنجا فەرمانی بێ چەند و چوونە   عالەم بە خواستی ( کُنْ فَیَکُونُ )ە
بەو ئەندازەیەی بۆ ئەشیای دانا   دروستی کردن لە ڕۆی جیهانا
بۆ هەر ذەڕڕەیێ بە دڵ بڕوانێ   ئەزانێ لەگەڵ حیکمەتا هاتێ

★ ★ ★

ڕۆڵەم ئەم دەرسە وەربگرە بە دڵ   ئەگەی بە مراد بێ‌گرێ و موشکوڵ
پەروەردگارت ( واجب الوجود )   بە خواستی ئەوە دائیرەی مەوجوود
هەر بۆ ئەو ئەشێ ئینسان بەئیخلاص   عیبادەت بکا و بەندە بێ و حەق‌ناس
هەر ئەو خالیقە و پەروەردگارە   ئەو موئەثثیرە و باقێ ئاثارە
خواستی هەرچێ بۆ (آنا) مەوجوودە   کە خواستی نەما بوودیش نابوودە

★ ★ ★

خواستی وەهابۆ مەخلوقێ بێنێ   سەری بەندەیێ بۆ دانەوێنێ
لە مشتێ خاکی پاکی ئەم ئەرزە   ئادەمی هێنا بەو پایە بەرزە
ئەمجار بە حیکمەت لە پاڵوی ئادەم   حەووای دروست‌کرد بێ بەهاودەم
تاجی شوعوور و عەقڵی بە دیارێ   نارد لەبۆ ئادەم لەبۆ سەرداری
هەتا ئادەمێ لەسەر ڕۆی زەمین   بینە خەلیفەی ( ربّ العالمین )
چونکە خەلیفە بە عەقڵ و شوعوور   ئەبن بە مەظهەر بۆ تەجەللای نوور
تا جیاکەنەوە ڕۆژ لە نیوەشەو   هەتا بۆ بەرزێ بێنە هەوڵ و دەو

★ ★ ★

جا چونکە هوشیار نەخۆش‌ئەکەوێ   ڕۆژی ڕوناکی ئەبێ بە شەوێ
هوشیار نەخۆش‌کەوت هێزی نامێنێ   بە پایەکی سارد زوو دائەمێنێ
ئایینی بۆ نارد بۆ بەختیارێ   تا پایەدار بێ لەسەر سەرداری
لە ژینی خۆیا بێ بە ( نامێ )   بگا بە غایە و کام و مەرامی

★ ★ ★

مەرجی دوهەم لە مەرجەکانی باوەڕ ، باوەڕە بە مەلائیکە کە بە کوردی پێیان ئەوترێ فریشتە . فریشتە گیان‌لەبەرێکی لەطیف و ناسك و نورانین باوك و دایکیان نیە ، خوای تەعالا هەر بە خواست و توانای خۆی لە ماددەیەکی نورانی دروستی کردون . فریشتە نە نێرن و نە مێ . خواردن ناخۆن و خواردنەوە ناخۆنەوە . هەمیشە لە فەرمانبەرداری خوادان . هەرکام لەم

فریشتانه پله و پایەیەکی تایبەتیان هەیە لەو پله و پایەیە لانادەن . ئەشتوانن بە هەرجۆرێ خۆیان ئارەزۆیان لێ ببێ خۆیان پیشان بدەن .

فریشتە چەند بەشن و هەر بەشێکیان خەریکی جۆرە ئیشێکی تایبەتییە خوا پێی‌سپاردوە . ئەمەش جۆرێکە لە یاسای سەبەب‌سازێ کە خوای تەعالا بە ئارەزۆی خۆی هەر شتێکی کردوە بە سەبەب و هۆ بۆ شتێ . مەسەلا بەهۆی باوە هەور لە ئاسمانا کۆئەبێتەوە و باران ئەبارێ . بـەهۆی بارانیشەوە تۆو لە زەویدا ئەڕوێ و بەرز ئەبێتەوە و ئەبێ بە دەغڵ‌ودان و جۆتیـار درەوی ئەکا و ئەیکوتێ و پاکی ئـەکا و ڕزق و ڕۆزێ بۆ خۆی و ماڵ و منالی و بـۆ کۆمەڵ فەراهەم ئەکا ، لـەگەڵ ئەوەدا کە خوای تەعالا ئەیتوانێ جۆرێکی‌تر دابهێنێ بۆ پێگەیشتنی دەغڵ‌ودان و نان‌دانی خەڵك .

هەروەها خوای تەعالا هەندێ فریشتەی کردوە بە هۆ بۆ پاراستنی ئینسان لە گەلێ زیان و هەندێکیانی کردوە بە فەرمانداری با و باران و ڕوانـدنی گیا و گوڵ و شینایێ و هەندێکی‌تریان بـە کاربەدەستی گەیـاندنی ڕزق و ڕۆزێ بە گیان‌لەبەران. هەندێکیشیانی کردوە بە فەرمانداری گیان‌کێشان و هەندێکی‌تریان بە هۆی پەیوەندێ لەنێوان خۆی و پێغەمبەراندا و فەرمانی ئەو ئەگەیەنن بەوان.

هەرکەسێ ئەوەندە ژیر بێ بە ئادەمزادێکی چاوکراوە بناسرێ بەهۆی ورد بۆنەوەوە لە جیهان و دەرکەوتنی گەلێ شتی سەیر لـەم چەرخەدا ، باوەڕ بەوە ئەکا کە زۆر مەعقوڵ و موناسبە خوای تەعالا جۆرە مەخلوقاتێکی‌وا دروست بکا ماددەکەی ناسك و لەطیف بێ و بە چاوی سەر نەبینرێ و ببێ بەهۆی گەلێ کار و مەبەستی ئادەمیزاد و گەلێ شتی بەنرخ لە ئاسمان و ئەرزدا .

ئینسانی ژیر حەقی ئەوەی نیە بلێ ئەی بـۆچی خوای تـەعالا خۆی بە بێ‌کەس ئەو مەبەستە جێ‌بەجێ نەکا ! چونکە هۆی دانانی ئەسـباب لە جیهانا ئەوەیە ئینسان باش بژێ و لە ژیانی خۆیدا یاسایەك بۆ هەوڵ و تەقەلای خۆی دانێ وەکو دەرمان خواردن بۆ چارکردنی نەخۆشێ و ژن‌هێنان بـۆ منداڵ‌بۆن و درەخت ناشتن بۆ میوەگرتن و تەمێ‌کردنی منـاڵ بۆئەوە کە بـۆ کۆمەڵ ببێ بە مایەی سۆد و بەختیارێ وەکو خوا لە قورئانا فەرمۆیەتی : « وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا فَأَتْبَعَ سَبَبًا » واتە : لە هەمو بابەتێ و بۆ هەر شتێ ئەوەی کە سەبەب و هۆی بەجێ‌هاتنی دڵخواز بێ دامان بە ئەسکەندەری ذی‌القرنین .

| | |
|---|---|
| بەهار بـەو هیوا بـاران ئەڕێـژێ | داری لەطافـەت بـۆ دڵ بنێـژێ |
| واتە ئـەو دڵەی ناسـك سروشتە | هاودەمە لە بـۆ ڕشـتەی فریشتە |
| بـاوەڕی وابـێ لـە هەمـو کاتـا | فریشـتە زۆرن لـەم کائیناتـا |
| بێ‌باوك و دایـکن ، نە نێـرن نە مێ | بە ( کُـنْ فیکون ) وجوّدیـان ئەبێ |

ماددەی ئەوانە جیسمی لەطیفە — ذاتیان لە تاوان پاك و نەظیفە
دوورن لە هەوا و ئارەزووی نەفسی — پڕ نوورن لەبەر ئەنواری قودسی
وان لە فەرمانی ذاتی خودادا — کەسیان لە فەرمان بە مۆ لانادا
هەریەك پایەیێ مەعلوومی هەیە — شێوە و مایەیێ مەرسوومی هەیە
لە ئاسمانا و لەناو هەوادا — لەسەر زەویدا و لەناو دەریادا
لەسەر ئەو یاسا خودا دایناوە — هەریەك ئیشێکی پێ سپێرراوە
بۆ پاراستنی ئینسان و حەیوان — لە دەر و ماڵ و لە دەشت و کێوان
لەبۆ یارمەتێ کردەوە چاکان — بۆ هێنانی نوور بۆ دڵ ڕووناکان
لەبۆ نووسینی کردەوەی ئینسان — لە خێر و لە شەڕ لە چاکە و ئیحسان
بۆ هێمنێ دان بە تەنگ ئەحواڵان — بۆ موژدەهێنان لەبۆ ڕاساڵان
بۆ وەرگرتنی گیانی گیان‌لەبەر — چ لە ئاسمانا و چ لە دەریا و بەڕ
بۆ پرسیاری مردوو لە گۆڕا — چۆن بۆ باوەڕی و چلۆن هەڵسووڕا
بۆ دڵدانەوەی شەخسی خۆش‌ڕەفتار — بۆ ئازاردانی نامەردی نابار

★ ★ ★

ئەم فریشتانە چوار بەشیان تیایە — زیاتر لە هەموان جێیان باڵایە
یەکەم ( کَرُوبیِ ) دووهەم ( روحانی ) — سێهەم هەڵگری عەرشی ڕەحمانی
چوارەم مەشهوورن بە (مقرَّبین) — زۆر گەورەن لەلای ( ربّ العالمین )
لەمانا چواریان بە شێوەی ڕەئیس — ناویان بردوون قورئان و حەدیث
یەکەم ( جبرئیل ) لە موعتەبەران — پەیام وەرئەگرێ بۆ پێغەمبەران
دووهەم ( میکائیل ) مەئمووری ئەرزاق — بۆ گیان لەبەران لە کورەی ئافاق
سێهەم (عزرائیل) لەبۆ گیان کێشان — بەردەستی زۆرە لەبۆ دڵ‌ئێشان
چوارەم ( اسرافیل ) لەبۆ نەفخی صوور — ئازا و ئامادە بۆ ئەمر و دەستوور
ئەمانە ناویان لامان دیارە — باقی حەواڵەی پەروەردگارە
ئەوەند بزانە کە سوپای خودا — بەندی ژمارە قەت دەورەی نادا
کەس نەیزانیوە و کەسیش نایزانێ — موسوڵمان ئەبێ دان بەمەدا نێ
عیلمی کەس نەگا بە کائیناتا — بە مەخلوقاتێ لە سەماواتا
کەمی مەکشووفە و زۆری مەکتوومە — ئەمە لای مەردی زانا مەعلوومە
هەر کەس لەم بابا بێ بە دەمیا — تەم ئەدا بەسەر دڵەی پڕخەمیا
هەر عیلم و فەننە ئەبێ بە حەکەم — پێت ئەڵێ بڵێ ( اللهُ اعلَم )
( وما اوتیتُم ) وا لە تەنزیلا — لەگەڵ ئیستیثنای ( الا قلیلا )
بڕوانە مەعنای تەنزیلی سامێ — بڕۆ بۆ کەهفی عیرفانی ( نامێ )

★ ★ ★

مەرجی سێهەم باوەڕە بەو کتێبانەی کە خوای تەعالا بە ڕێگای حەزرەتی جوبرەئیلدا ناردوونی بۆ پێغەمبەران ·

بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر ( درودی خـوای لێ بێ ) خـوای تەعالا سێصەد و سیازدە پێغەمبەری ناردوە بۆ سـەر خـەڵق و ئـەم پێغەمبەرانە فەرموودە و سپاردەی خوایان بە ئادەمیزاد گەیاندوە . لەناو ئەمانەشدا صەد و چواریان کتێبیان بەهۆی حەزرەتی جوبرەئیلەوە بۆ هاتوە . ئـەو کتێبانەی خوا ناردوونی بۆ پێغەمبەران بەمجۆرەن : دە کتێب بۆ حەزرەتی ئادەم ، پەنجا کتێب بۆ حەزرەتی شـیث ، سێ کتێب بۆ حەزرەتی ئیدریس ، دە کتێب بۆ حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل . ئەم کتێبانە هـەموویان لە قورئـانی پیرۆزدا بە ( صحف ) ناوبراون . تەوراتیش هاتوەتە خوار بۆ حەزرەتی موسا و زەبـوور بۆ حەزرەتی داوود و ئینجیل بۆ حەزرەتی عیسـا و قورئان بۆ پێغەمبەری خـوامان حەزرەتی ( محمد المصطفی ) علیهم الصلاة والسلام .

قورئان پێکهاتوە لە شەش‌هەزار و شەش‌صەد و شەصت و شەش ئایەت . ئەو بابەتانەی ئەم ئایەتانە باسیان لێ ئەکـەن جۆرجۆرن ، هـەر لە کاروباری ئاینەوە تا کاروباری ژیان و پەیوەندی خەڵك بە خواوە و لەناو خۆیانا و ژیانی ئەو دنیا . .

قورئان لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا خوا بەهۆی حەزرەتی جیبرەئیلەوە ناردویە بۆ پێغەمبەر بەگوێرەی پێویست . قورئان حوکمی هەموو کتێبەکانی پێش خۆی هەڵوەشاندوەتەوە تەنها لە مەسەلەی ئیمان و باوەڕدا نەبێ ، واتە هەرچی ئەحکامی ڕەفتار و کردەوەی ئینسـانی موکەللەفە ئەبێ بەپێی ئـەوە بێ کـە لە قورئاندا هەیە .

قورئان لەلایەنی لەفظ و مەعناوە لە هـەموو کتێبێکی ئاسـمانی و ئەرزی بەرزترە بە چەند دەلیل . یەکەم ئەوە کە قورئان موعجیزەیە ، واتـە لەوکاتەوە کە هاتوە بۆ سەر زەوی هەتا هەتایە ئەگەر هەرچی ئادەمیزاد و پەریە کۆببنەوە ناتوانن نە وێنەی هەمووی و نە وێنەی هەندێکی دابهێنن و ، لەوڕۆژەوە هاتوەتە خوار تا ئەمـڕۆ هەرکەسـێ ویسـتبێتی بەرابەرکێی بکـات ، بـە نـائومێدی گەڕاوەتەوە و دانی بە داماوی خۆیدا ناوە . دوهەم ئەوەی بۆ بەختیاری دنیـا و قیامەتی ئادەمیزاد پێویست بێ تیا هەیە وەك خواناسی و دڵ و دەروون پاکی و میهرەبانی لەگەڵ خـزم و بێگـانە و یاسـای ژیـان و پاراستنی نیشـتمان و پیشەسازی و خوێندن و ڕاگرتنی گەورە و بچوك و . . تاد .

قورئانی پیرۆز مەیدانی ئەوەی داوە کەوا زانا بەرزەکانی ئیسلام کە پێیان ئەڵێن ( مجتهدین ) بەگوێرەی پێویست و بۆ خزمەتی موسوڵمانان و بەپێی ئەو ڕێ و شوێنەی قورئان دایناوە و پێغەمبەر فەرمویەتی بڕیاری ئەو شتانە بدەن کە قازانج و سوودی خەڵکیان تیایە . خەڵکیش بـەپێی ئـەو بڕیارانەی ئەوان بجوڵێنەوە .



مەرجی چوارەمیش لە مەرجەکانی باوەڕ ، باوەڕە بە پێغەمبەرانی خودا . ( بزانن ) کەوا لەوڕۆژەوە ئادەمیزاد لەسەر زەوی بڵاو بوەتەوە ، لە هەمو چەرخێکا خوا یەکێ یا چەند کەسێکی لە ئادەمیزادی سروشت پاك و خۆ و ڕەوشت چاك و دڵ ڕۆناك و سەربەرز هەڵبژاردوە و بەهۆی فریشتەی سرۆش ( وەحی ) حەزرەتی جیبرەئیلەوە نامەی تایبەتی خۆی بۆ ناردوون کە بیگەیەنن بە خەڵك بۆ ڕێپیشاندان و ئامۆژگاری کردنیان و ، کردونی بە پێغەمبەری خۆی بۆ سەر خەڵکی ئەو ناوچەیە ، وەك لە قورئاندا ئەفەرموێت : « وَاِنْ مِنْ اُمَّةٍ اِلاّ خَلا فیها نَذیرٌ » واتە : هیچ کۆمەڵە ئادەمیزادێ نەبوە خوا پێغەمبەرێکی بۆ نەناردبن موژدەی بەهەشتیان بداتێ ئەگەر فەرمان بەرداری فەرمانی خوا بکەن و ترسی دۆزەخیان بخاتە بەر ئەگەر سەرپێچی لێ بکەن .

ئەم پێغەمبەرانە هەندێکیان پایەیان لە هەندێکی‌تریان بەرزترە . لە قورئان و حەدیثا ناوی سێصەد و سیازدە کەسیان براوە ، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا تەنها ناوی ئەم بیستەیان هاتوە : ئادەم ، ئیدریس ، نوح ، هود، صالح، ئیبراهیم ، لوط ، ئیسماعیل ، ئیسحاق ، یەعقوب ، یوسف ، ئەیوب ، یونس، شوعەیب ، موسا ، هارون ، ذولکیفل ، ئیلیاس ، ئیلیەسەع ، داوود ، سولەیمان ، زەکەریا ، یەحیا ، عیسا و حەزرەتی موحەممەد ( علیهم الصلاة والسلام ) . لەم بیستە پێنجیان بە ( اولوا العزم ) واتە خاوەن هیممەت و پایەی بەرز ناویان دەرکردوە . ئەمانە بریتین لە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و موحەممەد ( علیهم السلام ) . لەناو ئەم پێنجەشدا پێغەمبەری ئێمە کە حەزرەتی ( محمد المصطفى )یە درودی خوای لێ بێ لە هەمویان گەورەترە .

وتمان پێغەمبەری ئێمە لە هەمو پێغەمبەرەکان گەورەترە . ئەمە چەند بەڵگە و دەلیلی هەیە . یەکەم ئەوەیە ئەم ذاتە ڕەوانە کراوە بۆ سەر هەمو ئادەمیزاد و (جن) و مەلائیکە لە هەمو وڵاتێك و لە هەمو سەردەمێکدا . ئەمەش لە ئایەتی ( وَما اَرْسَلْناكَ اِلاّ كافَّةً لِلنّاسِ )ەوە دەرئەکەوێ کە واتە تۆمان نەناردوە بۆ هەمو ئادەمیزاد نەبێ . هەروەها لە ئایەتی ( وَما اَرْسَلْناكَ اِلاّ رَحْمَةً لِلعالَمين )ەوە کە واتە تۆمان نەناردوە بۆئەوە نەبێ کە ببی بە مایەی ڕەحمەت بۆ هەمو خەڵکی جیهان . هەروەها دەرئەکەوێ لەو نامانەوە کە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ ناردونی بو پادشاهان و گەورە گەورانی سەردەمی خۆی بۆ بانگ کردنیان بۆ موسوڵمانبون وەك نامەی بۆ پادشای قیبطیەکانی میسر و پادشای ڕۆم و ئێران و حەبەشە و گەورە گەورانی عەرەب ، وەك لە کتێبی مێژودا بەدرێژی باسی لێ‌کراوە .

دوهەم ئەوەیە کە ئایینی ئیسلام دامەزراوە لەسەر قورئانی پیرۆز کە لە هیچ ئایینێکی‌تردا یاسای وا نەبینراوە و نەبیسراوە کە لەمدا هەیە . قورئانیش

بەهۆی ئەوەوە کە ( معجزە )یە و کەس بەرامبەرکێی لەگەڵ پێ ناکرێ ، گومان لەوەدا نیە کە کەلامی خوایە و پەیوەندی بە ئادەمیزاد و فریشتەوە نیە . سێهەم ئەوەیە ئەم ذاتە دوا پێغەمبەرە لە جیهانا و پاش ئەو هیچ پێغەمبەرێکی‌تر نابێ و ئاینەکەی تا دنیا دنیایە پایەدار ئەبێ و لە هەر چەرخێکا کە لەبەر هەندێ هۆ لاوازێ و ڕەنگ زەردییەکی بەسەردا هاتبێ ، ئەوەندەی پێ نەچوە هەروەك ئاو بکەی بە نەوتی ئاگر گرتوێدا ، گەلێ لە جاران توندتر گڕی بەرز بوەتەوە و کۆمەك و یارمەتی‌دەر و هۆی بڵاوبونەوەی هاتوەتەڕێ .

ئەم پێغەمبەرە ڕەهبەرە ناوی ( محمد )ی کوڕی ( عبدالله )ی کوڕی ( عبدالمطلب )ی کوڕی ( هاشم )ە و لە هۆزی ( قُرَیْش ) و لە نەوەی حەزرەتی ( اسماعیل )ی کوڕی حەزرەتی ( ابراهیم الخلیل )ە . دایکیشی ناوی ( آمنە )ی کچی ( وَهَب )ی کوڕی ( زُهرە )یە . لە شاری مەککەی موکەڕەمە لە وڵاتی حیجاز لە ساڵی ٥٧٠ی میلادیدا لەدایك‌بوە لە ڕۆژی دوشەممەی ١٢ی نیساندا لەکاتی بەرەبەیاندا و بە تودومی پیرۆزی خۆی جیهانی نورانی کردوە . لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا خوا حەزرەتی جوبرەئیلی ناردوەتە لا و خەڵاتی پێغەمبەرێتی داوەتێ . پاش ئەمە بە سیازدە ساڵ مەککەی بەجێ‌هێشتوە و کۆچی کردوە بۆ مەدینە و دە ساڵیش لەوێ ماوەتەوە . پاشان لە تەمەنی شەصت و سێ ساڵیدا لە ڕۆژی دوشەممەی یەکی مانگی ( ربیع الاول )ی ساڵی ١١ی هیجری (٦٦٢ی میلادی)دا وەفاتی کردوە و لە ژورەکەی حەزرەتی ( عائشە )ی حەرەمیدا سپێرراوە بە خاك .

(ئاگاداربن) هەروەك چۆن پێویستە باوەڕمان بێ بەوە کەوا حەزرەتی (محمد) درودی خوای لێ بێ ڕەوانە کراوە بۆسەر ئادەمیزاد، پێویستە باوەڕمان بەوەش بێ کەوا ڕەوانە کراوە بۆسەر پەریانیش کە ئەوانیش جۆرێکن لە مەخلوقاتی خوا . فەرقی پەرێ لەگەڵ فریشتە ( مەلائیکە )دا ئەوەیە کەوا ئەمان نێر و مێیان هەیە و بە چەشنی گیان لەبەرانی‌تر زاوزێ ئەکەن و فەرمان بەردار و فەرمان نابەرداریان تیایە . لە قورئانی پیرۆزا لە گەلێ ئایەتدا باسی پەرێ هەیە و وتراوە کەوا حەزرەت درودی خوای لێ بێ بانگی کردون بۆ وەرگرتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و قورئانی بەسەردا خوێندونەتەوە .



مەرجی پێنجەم لە مەرجەکانی باوەڕ ، باوەڕە بە ڕۆژی قیامەت ، بەو دنیا .

پێویستە ئینسان ئیمان و باوەڕی وابێ کەوا ڕۆژێ دێ ئەم جیهانە وێران ئەبێ و تێك‌ئەچێ و ئەم گیان‌لەبەرانە هەمو ئەمرن و پاش ماوەیێ خوای تەعالا سەرلەنوێ جیهانێکی تازە و نوێ دروست ئەکا و هەرچی ئادەمیزاد و پەرێ

بوە هەمۆیان زیندۆ ئەکاتەوە و لە کردەوەی هەموان ئەپرسێتەوە و ، هەرکەس بە تۆڵە و پاداشی خراپە و چاکەی خۆی ئەگات . ئەم جیهانە نوێیە بڕانەوەی نابێ و ، شوێنی هەمۆ ئادەمیزاد و پەرییەك یا بەهەشتە یا دۆزەخ و ئەم دۆ شوێنەش هەمیشە ئەمێنن و هەرگیز نافەوتێن .

وردبۆنەوەیەك بە دڵ . ئێمە تەماشا ئەکەین ئەبینین بەشەکانی ئەم جیهانە وەك ئاسمان و ئەستێرە و زەوێ و دەریا و گیانلەبەر ، هەمۆ بەرانبەر بە هێزی شتێکی لە خۆیان بەتاوتر زەبۆن و داماو و بێدەسەلاتن . کام کێو زۆر گەورەیە لەوانەیە بە جۆرە بۆمبایەك وێـران و تەخت بکرێ .. بۆمەلەرزەیەکی بەهێز سیمای وڵاتێك بەتەواوێ ئەگۆڕێ . ئەگەر هێزی ئەو بۆمەلەرزەیە چەند قات بکرێتەوە لەوانەیە وڵاتەکە ژێرەوژۆر بکا . ژیرترینی گیانلەبەران کە ئادەمیزادە ناتوانێ شتێکی نابۆد و بێمایە دروست بکا و ناتوانێ گیان بکا بە بەری بێگیانێکا، یا خـۆی لە مـردن ڕزگار بکا . دیـارە گیانلەبەرەکانیتریش لـە ئادەمیزاد بێکارەترن . کەواتـە ئەمانە هیچیان خۆیانیان دروست نەکـردوە . عەقڵیش نایگرێ هەروا لە خۆیانەوە پەیدا بۆبن . هەروا عەقڵ قەناعەت ناکا بەوە کە شتێکی بێعەقڵ و هۆش و فام و هێزیش ئەمانەی دروست کردبێ .

لێرەدا هەمۆ هوشیارێك ئەبێ خۆی بە ناچار بزانێ باوەڕ بکا بـەوە کەوا ئەم جیهانە بە گیاندار و بێگیانیەوە پەروەردگارێکی خاوەن کەماڵی هەیە کە هەرچی بوێ ئەیکا . جا عەقڵ و هۆش ئەگا بەو ئەنجامە کەوا ئەو پەروەردگارە وەك لە نەبۆن ئەمانەی دروست کردوە ، ئەیشتوانێ گیانلەبەرەکان بمرێنێ و ئەم جیهانە بڕۆخێنێ کە ئەمەش بریتییە لە ( دنیا ئاخر بۆن ) . هەروا ئەیشتوانێ دنیایەکی نوێ دروست بکا و مردوەکان زیندۆ بکاتەوە . ئەم وەزعەیش بریتییە لە ( زیندۆ بۆنەوەی گیانلەبەران بۆ ژیانی تازە و نوێ لە جیهانێکیتردا ) کە هەتا هەتایە لەو جیهان و ژیانەدا ئارام ئەگرن .

بۆ نیشاندانی هێنانی ئەم وەزعە و وێرانکردنی جیهان کە چەند لای خوای تەعالا ئاسـانە ، خوا لە قورئانا فەرمۆیەتی : « وَمَـا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاّ كَلَمْحِ البَصَرِ أَوْ هُـوَ أَقْرَبُ » . واتـــە وەزعـی هێنـانی ڕۆژی قیامـەت و وێرانکردنی ئـەم جیهانە ، لای توانای خـوای گەورەدا وەك ئاوڕدانـەوەیەکی ئادەمیزادە بە لاچاوێك ، بەڵکو لەوەش سۆك و ئاسانتر و نزیکترە .



مەرجی شەشەم لە مەرجەکانی باوەڕ،باوەڕە بەوە کە هەرچی چاکە وخراپە هەیە هەمۆی خوا دروستی ئەکا و هەر خوا خالق و پەروەردگارە و هەر شتێ ڕۆ بدا لەم جیهانەدا خوای تەعالا پێی زانیوە و بە قەدەری ئەو ڕۆ ئـەدا یەعنی خوای تەعالا بە خواستی خۆی دروستی ئەکا .

تەنانەت هەستان و دانیشتن و کردار و گوفتاری ئێمەش هەمۆی کاری خودایە و ئەوەندە هەیە تا ئێمە خواست و خواهیش و ئارەزۆمان لەسەر شتێ نەبێ و عەزم نەکەین بۆ کردنی ئەو شتە خوا دروستی ناکا و هەرکاتێ خواست و خواهیشمان ڕۆی کردە کردنی شتەکە و ویستمان بیکەین خودا ئەیکا . پەیوەندی ئێمە بەو شتەوە ئەوەندەیە کە ئێمە خاوەن ئیختیارین و ئیختیارە جوزئییەکەی خۆمان هەڵئەسوڕێنین بۆلای ئەو شتە کە ئەمانەوێ بیکەین و ئیتر خوایش دروستی ئەکا . خوا لە قورئانا فەرمۆیەتی : « اللهُ خالِقُ كُلِّ شيئٍ » واتە : خوا دروستکەری هەمۆ شتێکە . هەروەها فەرمۆیەتی : « واللهُ خَلَقَكُمْ وماتَعْمَلُونَ » واتە : خوا ئێوە و هەمۆ کرداری ئێوەی دروست کردوە . دەلیلیش لەسەرئەوە کە ئادەمیزاد خاوەن ئیختیارە ، ئەوەیە کە خوا فەرمۆیەتی : « لَها ما كَسَبَتْ وعَلَيْها ما اكْتَسَبَتْ » واتە : هەر چاکەیێ کە ئادەمیزاد پەیدای بکا سۆدەکەی بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکیش کە بە ئارەزۆی خۆی بیکات زیانەکەی لە ئەستۆی خۆیدایە .



هەروەها پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی :

**« الاِسلامُ انْ تَشْهَدَ انْ لا الهَ الاّ اللهُ ، و انَ محمدا رسولُ اللهِ ، و تُقيمَ الصَّلاةَ ، و تؤتِيَ الزّكاةَ ، و تَصُومَ رَمَضانَ ، و تَحجَّ البَيْتَ اِنِ اسْتَطعْتَ اليه سبيلاً » .**

واتە : موسولمانەتێ ئەوەیە شایەتێ بدەی کەوا لە ( خوا ) بەولاوە خوایەکیتر نیە و ( محمد ) فروستادەی ئەوە . هەروەها نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژۆ بێ و ئەگەر دەسەڵاتت هەبۆ حەجیش بکەیت .

وا کەمێك لەسەر ئەم مەرجانەی موسولمانەتییش قسە ئەکەین .

ئەو شەش مەرجەی باوەڕ کە پێشان باسمان کردن هەمۆ بریتێ بۆن لە بیروباوەڕ و شتێکی پەنامەکێ بۆن ، چونکە ئیمان و باوەڕ لە دڵدایە . ئەم پێنج مەرجەی موسولمانەتییش هەمۆیان کردەوەن چونکە موسولمانەتێ بە کردەوەدا دەرئەکەوێ . یەکەمی ئەم مەرجانە ئەوەیە بە زمان بڵێیت و بە دڵیش باوەڕت بێ کەوا کەس نیە بەندەیێ و بچۆکێ بۆ بکرێ و بە حەق عیبادەتی بۆ بکرێ لەو زاتە بەولاوە کە ناوی ( الله )یە و ،بە زمان بڵێیت و بە دڵ باوەڕت بێ کەوا حەزرەتی ( محمد )ی کوڕی ( عبدالله )ی کوڕی ( عبدالمطلب ) پێغەمبەری خوایە و خوا بە ڕەهنمۆنێ بۆ هەمۆ ئادەمیزاد و پەریانی ناردوە . دۆهەمیشیان بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژە لە هەمۆ شەو و ڕۆژێکا بەپێی ئەو ئوسوڵە

که له شــەرعدا بەیان‌کراوه . سێهەمیشیان ئەوەیە زەکاتی ئاڵتـوون و زیو و دەغـڵ‌ودان و حەیـوانات و مـاڵی بازرگانیی بـدەی بەوانەی بەپێـی شەرع پێیان‌ئەشێ . چوارەمیشیان ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزانه له هەموو ساڵێکدا . پێنجەمیشیان حەجە واته زیارەتی ماڵی خوا (کەعبە) له شاری مەککە یەکجار له ماوەی ژیاندا بەوشەرتە که دەستت بڕوا و بتوانیی بڕۆیت و بێیتەوە بە هێمنیی .

ڕۆڵەی دڵ بەندم ، شیرینتر له گوڵ — دەرست پێ ئەڵێـم تێی بگـە بە دڵ
بڵێ بـە ئەدەب بە زمـانێکی پـاك — لەسەر ئیمـان و بـاوەڕی ڕۆنــاك
بـاوەڕم هەیـە بـە ذاتـی خـودا — پەروەردگاری بـێ وێنـە و هەمتـا
هەر ئەو مەعبـوودە و بەندەیێ ئەکرێ — سوجدەی بەندەگیی هەر بۆ ئەو ئەبرێ
هەر ئەو خـالیقە بـۆ هەموو عالـەم — ئاشکرا و پەنهـان لە زۆر و لە کـەم
هەر تەنیـا ئەوە ( واجب الوجـود ) — کەرەم فراوان خـاوەن فەیض و جوود



بـاوەڕم هەیە بە فریشتەی حـەق — بـۆ ذاتی خودا موطیعـی موطلـەق
بـاوەڕم هەیـــە بـە پێغەمبـەران — بۆ تەمێـی هوشیـــار ڕەوانـەکران
بڵـێ ئەوانـەی وان لـە قورئـــانا — هەر باسیـــان ئەکەم لە ڕۆی جیهــانا
ئـادەم و ئیدریس ، حەزرەتـی نوحه — هـود و صـالحی خـاوەن فتوحــە
ئیبراهیم و لـوط ئەمجار ئیسماعیل — ئیسحاق و یەعقوب ، یوسفی جەلیل
ئەییوبی صابیر ، یونس و شـوعەیب — موسا و هارون و ذولکیفلی بێ‌عەیب
ئیلیاس ئیلیەسـەع داوود سولەیمان — زەکەریا و یەحیا و عیسای پڕ ئەمان
خاتـەمێ هـەموو ئـەم ڕەهبەرانـە — بە (محمد)ی شــای ســەروەرانه



درود بە وێنـەی بـارانی بەهــار — بڕژێ بـەردەوام لای پەروەردگـار
بەسەر گوڵـزاری گیـانی ئەو ذاتـا — نوری پەخشـان کرد بەســەر وڵاتا
ئەو (محمد)ەی بـۆ هەمـو عــالەم — بۆ بە سەرچـاوەی ئیحسان و کەرەم
ڕەحمەتـی ڕژانـد بە سەماواتــا — بــە دڵ و گیــانا لـە کائیناتــا
چەند دڵـی مردوی زینـدوو کردەوە — بە جوانـی و بەرزیێ وتـە و کردەوە
نەسیم بـۆی ئەوی هێنا بۆ ناوبـاخ — غونچە کراوە و پێی بۆ بـە گوڵبـــاخ
لەجێی نەزانیێ وپەستیێ وسەرمەستیێ — خەڵکی‌خستەسەر ڕێی حەق‌پەرستیێ
پیرۆزیێ هێنـا بـۆ هەمـو ئافـــاق — ڕۆی زەویێ پڕکرد لە دەرسی ئەخلاق
با بڕژێ سـەلام وەك تـاوی بـاران — بە گیـانی ئـەودا بـە ڕۆژگـــاران
جـا لە داوێنـەی شـای پایەداران — با بێ و سەرواز بێ بۆ ئال و یـاران
فیـداکـارانی ڕێـــی کامگـــاریێ — پـــایەدارانی خزمـــەت دیـاریێ

تێکۆشەرانی ڕێی ڕاستی ئایین | ( رَضِیَ اللهُ عَنْهُمْ اجمَعین )
بەڵکو دڵۆپێ لە ئاوی پاکی | بگا بە ئێمەیش بۆ دڵ ڕۆناکی
بەو دڵۆپەوە بڕۆین بۆ مەحشەر | بۆ ژێر سای ئاڵای بەرزی پێغەمبەر

★ ★ ★

باوەڕم هەیە بەو کەلامانە | هاتوون بۆ ئەم پێغەمبەرانە
دە لەبۆ ئادەم ، پەنجا لە بۆ شیث | سێ نازڵ بوە بۆ سەری ئیدریس
دە بۆ ئیبراهیم . سەدە تەواوە | ئەم صەد کتێبە ( صحف )یان ناوە
تەورات بۆ مۆسا ، زەبور بۆ داوود | ئینجیل بۆ عیسا بە ئەمری مەعبود
قورئان هاتوە بە بیست و سێ ساڵ | بۆ سەر (محمد) شای خاوەن کەماڵ

★ ★ ★

باوەڕم هەیە بە قەزا و قەدەر | هەرچێ ڕوبدا خوا ئەیکا یەکسەر
بە دۆ شەهادەت بە شەرم و ئارام | باش ئیقرار ئەکەم بە دینی ئیسلام
پێنج فەرزەی نوێژیش ئەکەم تا ئەمرم | گشت ساڵێ ڕۆژۆی ڕەمەزان ئەگرم
لە قوت لە حەیوان ، درەم و دینار | زەکات دەرئەکەم بۆ لات و هەژار
کاتێ ماڵم بۆ بە دڵێکی ساف | ئەڕۆم بۆ کەعبە بە نیازی طەواف
هەرچێ بزانم باشە بۆ ئیسلام | بەپێی هێزی خۆم ئەیهێنمە ئەنجام
سەرەڕای هەمۆی ڕۆم لە خودایە | هیوام ڕەحمەتی حەق تەعالایە

★ ★ ★

ڕۆڵە ئەم دەرسە دەرسێکی بەرزە | ڕەفتار بە گوێرەی ئەم دەرسە فەرزە
ڕەفتارت پێ کرد ئەبێ بە (نامێ) | موسوڵمانێکی پوختە و تەمامی

## گوڵی دۆهەم ـ گوڵی ترس لە خوا

بەهار بارانی قودسێ ئەڕێژێ
داری ئەنواری نەفسێ ئەنێژێ
ئەڵێ ئەو دڵەی لە خوا ئەترسێ
لە شێوەی شۆمی هەوا ناپرسێ

رَأسُ الحِکمَةِ مَخافَةُ اللهِ

واتە : سەرەتای وتار و ڕەفتاری پەسەند ترسە لە خوای گەورە .

ئادەمیزادی بەختیار بەر لە هەرچێ دەرسی بەسۆدی ئیمان و باوەڕی خۆی بە پەروەردگاری جیهان وەرئەگرێ . کاتێ کە ئەم دەرسەی وەرگرت و تێگەیشت ئەم بارەگای جیهانە و ئەم ئەرز و ئاسمانە و ئەم هەمۆ گیان لەبەرانە و

ئەم ئادەمیزادە بە شکۆ و شانە ، پەروەردگارێکیان هەیە تاق و تەنیا و خـاوەن خواست و توانـا کە هەمۆ شتێ ڕامی هێزی ئەوە و ئەتوانێ بە هەمـۆ بارێکا هەڵیسوڕێنێ و ، بە هەمۆ شتێ زانـا و بینایە ، باوەڕی دێتە سەر ئەوە کە خوای تەعالا بە بیر و باوەڕ و وتار و کردەی ئەو ئەزانێ و ، هەرکاتێ و لە هـەر شوێنێکدا نەفس و هەوا داوای تاوان و کردەوەی ناپەسـەندی لێ بکـا بە دڵ شەرمەسار ئەبێ و لە خودای خۆی ئەترسێ و خۆی لەو کارە نابـارە لائەدا و ، نەفسی خۆی هەڵئەسوڕێنێ بۆ شتێ کە سوودی لێ وەربگرێ .

هەمۆکەسێ ئەزانێ کەوا نەفسی ئینسان داوای کردەوەی ناپەسەند ئەکا ، بەڵام لە هەندێ‌کاتدا ئینسان لەبەر شەرمەزارێ لە برا و دۆست و لە ئینسانی خاوەن پایە ئەو شتە تەرك ئەکا . لە هەندێ‌کاتیشا کەسی‌وا نیە شەرمی لێ‌بکا ، بەڵام لە فەرمانڕەوای ئەو ڕۆژە ئەترسێ و لە ترسی گیرۆدە بۆنی بە ئازاردان و زیندان و زیانی دارایی خۆی دەست بەردار ئەبێ . زۆر کات و شوێنی‌واش هەیە کردەوەی ناپەسەندی تیا بۆ هەڵئەکەوێ و لەو کـات و شوێنەدا کەسـی‌وا نیە شەرمی لێ بکا و زۆرداریش دیار نیە تا لێی‌بترسێ . لەم جۆرە کات و شوێنانەدا هەر ترسی خودا و بیروباوەڕی خۆی بە خوا و ترسی پرسـیاری دوارۆژ لـەو ئیشە نابارەی ئەگێڕێتەوە . جا کاتێ ئادەمیزاد گەیشت بەم پایە ، هەر وتارێ بە دەمیا بێ لەپێشا بیری لێ ئەکاتەوە و لە ئەنجامەکەی ورد ئەبێتەوە و ئەگەر زیانی تیابێ بە دەمیا نابەت . هەروا هەر کردەوەیەك کە تـاوانی تیـابێ خۆی لێ دۆر ئەخاتەوە . لێرەدا بە ئاشکرا دەرئەکەوێ کەوا ترسی خوا سەرچاوەی حیکمەتە و ئەبێ بەهۆی ڕەفتار و ڕەوشتی چاك و پاك و سودمەند .

بۆیە خوای تەعالا لە قورئانی پـیرۆزا فەرمۆیـەتی : وخـافونِ ان کنتم مؤمِنینَ . واتە ئەی ئادەمیزادەکان ئەگەر بەڕاستێ خاوەن ئیمانن لە من بترسن . مەبەستی ئەوەیە نیشـانەی ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینە ئەوەیە ئینسان لە ترسی ئەو خودایە کە باوەڕی پێی هەیە دەسـت‌بەرداری کردەوەی ناپەسـەند بێ ، ئەگینا ئیمانەکەی یا هەر نیە یا ئەوەندە لاواز و نابۆدە سودی لێ وەرناگرێ .

ئاشکرایە ئەگەر تـۆ بە کەسێکی‌تر بڵێی چیت ئەوێ ئەتدەمێ بەوشـەرتە گوللەیەك بنێی بەخۆتەوە یا پیاڵەیـەك زەهر بخۆیتـەوە یا خۆت بهـاوێیتە ناو ئاگرەوە ، ئەوکەسە گاڵتەت پێ‌ئەکا و بەشێت و نەفامت دائەنێ و ئەڵێ چـۆن ژیانی خۆم زایە ئەکەم . ئەمەیش هـەر لەبەرئەوەیە کە ئەو شتـە وا لەپێـش چاویا و بەڕاستێ باوەڕی وایە ئەگەر ئەو ئیشە بکا ئیتر ئەبێ دەست لە گیـانی خۆی داشۆرێ . لێرەدا دەرئەکەوێ کەوا هەر بیروباوەڕە بەڕاسـتێ ئەبێ بەهۆی ئەوە کە ئادەمیزاد تۆشی گوناە و تاوان نەبێ .

**زۆلـەم ! ئادەمێ سـروشتی وایە لە خێر و شـەڕدا دۆ بەشـی تیایە**

درۆنــده خــووه لەبەر بەدخــوویی　　فریشــته ڕووه لەبەر حــەق‌جۆیی
بەوبــارا ســوڕا ، ئەداتــه کێوان　　بەم‌بارا بــڕوا ئــەگا بــه کەیــوان
پێویسته ئــادەم ئاگای لــه خۆ بێ　　ترسی ڕسوایی لــه ڕۆژی نــۆ بێ
هەتا بــۆی ئەکــرێ لادا لــه هەوا　　ئاگای له خــۆی بێ هەتا له خــەوا
خۆی بپــارێزێ لــه نەفسی نابــار　　زینهار بەدتــره له ئــەژدەها و مار
ژاری ئەژدەها و مــاری وشکەغار　　ناگا بــه ژاری نەفســی بەدکــردار
ئــازاری ئــەوان بــۆ ژیانمانــه　　ئــەم بــۆ ژیــان و بــۆ ئیمانمانــه

★ ★ ★

هەروا وەهایــه لەسەر شاخی بەرز　　واهەوات ئەدا ئەتخاتــه سەر ئەرز
ئەگــەر پایــەی تۆ وا لــه فەلــەکا　　شان‌بەشان ئــەڕۆی لەگەڵ مەلــەکا
ئەگەر لــه دنیا وێنــەی ئەولیــای　　هــاوڕازی ڕێزی بــەرزی ئەصفیای
کاتێ بــه هەوا کەوتیتــه سێ‌بــاز　　نــاوی بەدنــاویت ئەگاتــه شــیراز
بــه شــوومێ هــەوا و ئــارەزووبازێ　　لەبــەرزیوه دێیت بــۆ پایــەندازێ

★ ★ ★

ئەگــەر ئەتــەوێ چــاره لەمــانه　　هەر ترسی خودای خــاوەن ئەمانه
که ترسی خــودا گەیشته ناو دڵ　　ئەبێ به چــرا بۆ مــاڵ و مەنــزڵ
پڕتــەوی چــرا داپــەڕێ بــه تاو　　تاریــکێ دەروون نامێنــێ لــه نــاو
باش حــاڵێ ئــەبێ خــودا حــازره　　بــۆ کــردەوەی تۆ به حــەق ناظره
ئەوەی بەم وەزعــه خەبەردار ئەبێ　　لــه تاوانبــارێ شــەرمەزار ئــەبێ

★ ★ ★

حەیا له مەخلوق یا ترسی حوککام　　قازانــجی نیــه بۆ تــۆ بــەدەوام
کاتێ تەنیــایێ و ئــارەزوی تــاوان　　هەر ترســی خــودا ئــەبێ لەناوان
ئەمەیــه ڕازی فەلســەفەی ئیمــان　　کاتێ دامــەزرا دینــی موســوڵمان
هەتا به خەیــاڵ خۆی ڕســوا ناکا　　ئیطاعــەی نەفســی بەدهــەوا ناکا
که لەخوا ترسای به بەرزێ هیممەت　　دڵت پڕ ئەبێ له دەرسی حیکمەت

★ ★ ★

وتارت ئــەبێ به نامــەی ( نامێ )　　عالەم دەرئــەکا لــه مایــه خــامێ
ڕەفتارت ئەبێ به سەرمەشقی خاص　　نەك لەبۆ عەوام ، بەڵکو بۆ خەواص
یانــێ به وێنــەی ذەڕڕەبینی خــاك　　گەرمــا ئەهێنێ بــۆ دڵــی ڕوونــاك
نه ئەو به سەرمای زەمهەریر ئەمرێ　　نه سەبۆنی گەرم دەرگای تۆ ئەگرێ
ئەمەبۆ تەمێــم بۆ ڕۆڵەی هوشیــار　　که ترســی خودا بــکا به حەســار

وا من ئەم دەرسـەم بە دڵی تۆ دا  قەت غافڵ نەبـێ لە ترسی خـودا
کە غافڵ نەبۆی لـە فەیضی سامێ  ئەبێ بە مەردی هەڵکەوتوێ (نـامێ)

## گوڵی سێهەم ــ گوڵی شێوە و ڕەوشت

**لقد خلقنا الانسـانَ فی احسنِ تقویـم**

پەروەردگاری میهرەبـان فەرموێەتی بەڕاسـتێ ئێمـە ئادەمیزادمان لـە جوانترین شێوە و قەوارەدا دروست کردوە لەچاو گیاندارەکانیتردا .

لە واقیعدا خوای گەورە ئادەمیزادی لە گیاندارانیتر جوێ کردوەتەوە بـە عەقڵ و بە هۆش بۆئەوە کە بتوانێ بە هەمۆ بارێ بەختیارێ و پیرۆزێ دەردەست بکا بۆ خۆی . هەروەکو سیرەتی بە هۆش جوان کردوە ، صورەت و پەیکەریشی بە شێوەی ڕێكوپێك و بە سەر و ڕوخسار و چارەی جوان و چاو و برۆ و دەم و لێو و گەردن و سینە و دەست و پێی نەرم و نیان ڕازاندوەتەوە بۆئەوە کە دەر و ناوی دڵڕفێن و نازدار و شیرین و نازەنین بێ .

**بەهار بانگ ئەکا لە ڕۆڵەی نازدار  ئەڵێ ئەی بەندەی خوای پەروەردگار**
**ورد ببـەرەوە لە صـورەتی خـۆت  لەو عەقڵ و هۆشەی خوا داویە پێت**
**یەعنـێ ئادەمـێ نـرخی گرانـە  ( خلیفـة اللّٰه ) پایـەی ئینسـانە**
**خوا بـە تەزکیـە تەختـی پێداوە  تاجی سـەروەرێ لەسـەر دانـاوە**
**هەرچی پێـداوە لـە ورد و درشت  لەبۆ سـوودی خۆی دانـراوە گشت**
**دڵ بۆ بـیری بـاش لەبـۆ هەوڵدان  بۆ دۆزینەوەی ڕێی خـۆشی ژیـان**
**بۆ ژینـی بێ ژان بـۆ ڕێی ئـازادێ  لەبـۆ ڕزگاربـوون لـە نامـرادێ**
**تا بـۆ خـۆی بژێ ( کیف ما یشا )  بە خۆشـی بـژێ هەروەکو پاشـا**
**کەللـە بارەگای مەکینـەی بەسوود  پڕکراو لە هێز بـۆ ڕێگەی مەقسوود**
**لە کەللەدایـە دەمـاغ بـۆ شوعوور  دەماغ ئەساسـە بۆ کارەبای نـوور**
**وایەر ئەنێـرێ بـۆ گوڵوبی چـاو  بە ڕاست و چەپدا نوریان دێتە ناو**
**لە کەللەوە دێ هێزی چاو و گوێ  هێزی بۆنکردن بـۆ هەر بۆنێ بێ**
**کەللـە ئەنێرێ بـۆ حوضوری دڵ  هەواڵی ماددەی ئاسـان و موشکوڵ**
**کام دڵ ئـەو دڵە لەطیفەی حـەقە  جێی ڕازی خودای فـەردی موطلەقە**
**زانای ئەسـراری مەفهـومی کوللێ  جێگەی ئەنـواری کـاتی تەجـەللێ**
**چاو بۆ تەماشای پـەڕەی کائینات  هەتا وەربـگرێ قازانـجی حەیـات**
**گوێ بۆ حەق بیسـتـن لەناو وتارا  بـۆ سـوودی ئـادەم لـە ڕۆژگـارا**
**زمـان بـۆ بەیان بـۆ ئامـۆژگارێ  بـۆ نیشـانـدانی ڕێـی بەختیـارێ**

★ ★ ★

دەس بۆ دەس‌بردن بۆ خامە و نامە | لەبۆ نوسینی یاسا و بەرنامە
بۆ کردنەوەی کەلامی خودا | لەبۆ موتالآی لە ڕۆژ و شەودا
بۆ کردنەوەی کیتابچەی حیکمەت | بۆ وەرگرتنی فنونی صەنعەت
لەبۆ ناشتنی داری بە ئەمەر | بۆ وەشاندنی تووی خێر و شەڕ
بۆ بەخشینەوەی بەری ڕەنجی شان | بەسەر داماوی بێ دەست و بێ دان
بۆ شەپلآخە دان لە لاگوێی نامەرد | تا هەڵمەت نەبا وێنەی کیوێ هەرد
بۆ شمشێر گرتن بەرەوڕوی دوژمن | دوژمنی دین و تین و ژینی من
دوژمنی نابار کە تەمێ نەگرێ | ناچار دەس لەبۆ مشتوی شێر ئەبرێ
شاهێ وا لەسای سێبەری شیرا | لەگەڵ دەهەندە و داد و تەدبیرا

★ ★ ★

پێ بۆ ڕۆیشتن لەسەر ڕێگای ڕاس | لەبۆ ڕاوەستان لە جێگای ئیخلاص
لەبۆ ڕاوەستان لە بالآی مینبەر | بۆ دەرسی بەرزی تەمێ بۆ بەشەر
لەبۆ ڕاوەستان لە ڕیزی جەنگا | لەبۆ ڕاکردن بەدوای پلەنگا
لەبۆ ڕۆیشتن بە شوێنی دەرزا | بۆ شان بۆ ژیان لەسەر ڕوی عەرزا

★ ★ ★

شان لەبۆ ڕەنجە لە ماوەی ژینا | لە ئیشی دنیا و لە ئیشی دینا
تا باری منەت نەڕواتە سەر دڵ | تا بە شانی خۆت بکەی بە حاصڵ

★ ★ ★

پشت بۆ ئەوەیە کە پشتەسۆر بێ | دایم ئامادەی کاری زەرۆر بێ
پاڵ بدەیتەوە لەسەر ڕەنجی خۆت | پاڵ دانێی لەسەر مایە و گەنجی خۆت
یەعنێ ئادەمێ شای سەرزەمینە | یاری فریشتەی ( روح الأمین )ە
لە هەر سۆدێکا کە دەستی کەوێ | سەری کوڕنوشی بۆ حەق دانەوێ
بۆ هەر زیانێ دامەن‌گیری بێ | ڕەزا بە قەزا مایەی بیری بێ
یانێ لە دڵا فریشتە خوێ | لەناو کۆمەڵآ بەهەشتێ ڕۆیێ
( احسن التقویم ) ئەمەیە مەعنای | ئەگەر بەڕاستێ ئادەمی زانای
بەهار بانگ ئەکا ڕۆڵەی دڵ قەویم | لانەدەی لە هۆی ( احسن التقویم )
ئینسان بەم‌شێوە ئەبێ بە ( نامێ ) | ئەبێ بە مەردی فەردی نیظامێ

## گوڵی چوارەم ـ گوڵی عەقڵ

بەهار بارانی نیسان ئەڕێژێ
داری هوشیارێ ئینسان ئەنێژێ

لا فَقرَ اشدُّ من الجَهلِ ، ولا مالَ اعزُّ من العقلِ ، ولا وَحشةَ اشدُّ منَ العُجبِ .

پێغەمبەری خۆشەویستی نازدار سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمویەتی :
گەدایێ نیە سەختتر بێ لە نادانێ و نەفامێ و ، ماڵ و دارایش نیە بەنرختر بێ
لە هوشیارێ و ، هۆی دورکەوتنەوە لە کۆمەڵ نیە نابارتر بێ لە لەخۆبایێ‌بون .

پەروەردگاری جیهان ئادەمیزادی بەوە بەختەوەر کردوە کە عەقڵ و هۆشی
پێداوە . ئادەمیزاد بە عەقڵ ئەزانێ کە خۆی چەند بەنرخە و کە پێویستە
تێبکۆشێ بۆ سەربەرزێ خۆی و هاوڕێیانی . بە عەقڵ خوای خۆی ئەدۆزێتەوە و
ئەیپەرستێ و بە عەقڵ فێری زانست و پیشەی بەرز ئەبێ و کردەوەی چاك
ئەکا و وڵات ئاوەدان ئەکاتەوە و بەرگرێ ئەکا لە هەر دوژمنێ کە هێرش بێنێ
بۆ سەری و هەرچێ هۆی ئاشوب و هەرا بێ لە خۆی و کۆمەڵ و وڵاتی دور
ئەخاتەوە و هەرچێ هۆی بەختیارێ و سەربەرزێ بێ دەردەستی ئەکا .

عەقڵ هێزێکە خوای عالەم داویەتی بە نەفسی ئادەمیزاد ، ئەبێ بەهۆی
تێگەیشتن لەهۆی پێش‌کەوتن و پاش‌کەوتن و پاڵ‌ئەنێ بە خاوەنەکەیەوە بۆ
بیروباوەڕی باش و خوورەوشتی چاك و کردەوەی پەسەند . هەندێ لە زانایان
وتویانە خودا دوچاوی دروست کردوە بۆ ئادەمیزاد یەکەمیان چاوی سەرە کە
صورەتی شتی قەوارەدار وەرئەگرێ و ، دوهەمیان چاوی دڵە کە وێنەی شتی
بێ‌مادە وەرئەگرێ و ناوئەبرێ بە عەقڵ .
( بۆ ڕونکردنەوە ) : وەك چون ئاوێنە بلورێکی سافە و هێزێکی‌وای تیایە
وێنەی ئینسان وەربگرێ ، هەروەها نەفسی ئادەمیزادیش جەوهەرێکی لەطیف و
ناسکی وایە خوای تەعالا نوری عەقڵی پێداوە و بەهۆی ئەو نورەوە مەعنا و
مەفهوم و شتی بێ‌مادە وەرئەگرێ و صورەتی هەر شتێکی تیا پەیدا بۆ ، بەو
صورەتە ئەڵێن عیلم و زانست . نەفسی ئینسان خۆی حەقی بەسەر شتی
مادەدارەوە نیە . هەرچێ لەوانە وەربگرێ بەهۆی حەوواسەوەیە ، واتە بەهۆی
چاو و گوێ و تام‌کردن و بۆن کردن و دەست‌دانەوە لە شت .

ئەم عەقڵەی کە باسمان‌کرد دو بەشە یەکەم لەگەڵ دروست‌کرانی
ئادەمیزادایە و دوهەمیان بەهۆی دەرس و ئامۆژگارێ و بەراوردی کارەساتەکانی
ڕۆژگار و تەماشاکردنی مێژوی ڕوداوەکانی کۆنی جیهان و پەند وەرگرتنەوەیە لەو
شتانەی بەسەر ئادەمیزادا دێن و خاوەن‌عەقڵەکە ئاگادارە لێیان .

زانایان بە گەلێ جۆر نیشانەی عەقڵیان دەربڕیوە . بۆ وێنە هەندێکیان
وتویانە نیشانەی عەقڵی ئادەمیزاد ئەوەیە بە زۆرێ خواستی لەسەر
خوورەوشتی چاك و چاکەکردن بێ لەگەڵ خەڵك و خۆی بپارێزێ لە کردەوەی
پەست بەتایبەتێ ئەو کردەوانەی ئەبن بەهۆی ڕسوایێ . هەندێکی‌تر وتویانە
عەقڵ ئەوەیە ئینسان خۆی لە زۆردار بپارێزێ . هەندێکی‌تر وتویانە نیشانەی
عەقڵ ئەوەیە وتار و ڕەفتاری ئینسان لە شوێنی خۆیدا بێ . هەندێکی‌تریش

وتویانە نیشانەی عەقڵ ئەوەیە هەڵە لە وتاریا کەم بێ .

گەلێ شتیتریش بۆ دیاریکردنی نیشانەی عەقڵ وتراوە . مەسەلا وتراوە ئەوەیە بنیادەم مودارا و ڕابواردنی لەگەڵ خەڵکدا باش بێ . یا ئەوەیە بتوانێ وتاری حەق بکەیەنێ بە خەڵك و فەرمانبدا بە کردەوەی چاکە و بیانگێڕێتەوە لە کردەوەی ناڕەوا بەبێئەوە کە دڵیان ئازار بدا . هەندێکیش وتویانە نیشانەی عەقڵ ئەوەیە ئینسان هەرشتێ لە شوێنی خۆیا بکا . وتویشیانە ئەوەیە بێ بیرکردنەوە هیچی بەدەمدا نەیەت و بێڕاوێژ خۆی نەخاتە ناو ئیشی سەختەوە . هەروا وتویانە عاقڵ کەسێکە قسەی ئەوەندەی شانی خۆی و مەسرەفی بەپێی دارایی خۆی بێ . هەندێکیش وتویانە ئەوەیە لە گەورەیی و حورمەتا خۆی لێ نەگۆڕێ و لەکاتی داماویدا ئابڕوی خۆی نەبا . وتراویشە عاقڵ ئەوەیە ئارەزوی ناڕەوا بەسەریا زاڵ نەبێ .

حەزرەت دروودی خوای لێ بێ بە یەکێ لە یارانی فەرمو : فلان ! ئەگەر تێبکۆشێ بۆ زۆرکردنی عەقڵی خوت لە خوا نزیك ئەبیتەوە . ئەویش عەرزی کرد : باوك و دایکم بەقوربانت بێ ، بەهۆی چیەوە عەقڵی خۆم زۆر بکەم ؟ حەزرەت فەرموی خۆت بپارێزە لەو شتانە کە خودا حەرامی کردون و ئەوانەیش کە خوا واجبی کردون بەجێیان بهێنە . ئەوکاتە بە خاوەن عەقڵ ئەژمێررێیت . کردەوە و ڕەفتاری باشیش زۆر بکە لە دنیادا عەقڵت زیاد ئەکا و لە خوایش زۆرتر نزیك ئەبیتەوە .

هەندێ لە زانایان وتویانە بیروباوەڕ نیە گەورەتر بێ لە باوەڕ بە خودا و پێغەمبەری خودا و ، وتار نیە پایە بڵندتر بێ لە کەلیمەی (لا اله الا الله) و ، عیبادەت نیە پیرۆزتر بێ لە ئیخلاس واتە لە سافێ لەگەڵ خوا و ، شەرەف نیە بەرزتر بێ لە شەرەفی وەفا و ، پیاوەتێ نیە پیاوەتیتر بێ لە خزمەتی داماوان و، حورمەت نیە قەدردارتر بێ لە سەخاوەت و بەخشش بە خەڵك و ، هۆی ڕزگاری نیە نزیکتر بێ لە ڕاستێ و ، هۆی خۆشەویستێ نیە بەسودتر بێ لەوە کە لە پاشملە زمانت وەك بەرەوڕو بێ و ، خێرومەندێ نیە پیرۆزتر بێ لەوە کە فیتنە و ئاشوب بکوژێنیتەوە و ، چاکەکردن نیە باشتر بێ لەوە کە لە پەنامەکیدا ئامۆژگاری نەفام و نەزان بکەی و ، خزمەت نیە بەرزتر بێ لەوە کە کۆمەڵێ ئادەمیزادی نەزان و نەخوێندەوار پێبکەیەنێ و ، یارمەتێ نیە بەنرختر بێ لەوە کە گیرخواردویەك لە گیروگرفت ڕەها بکەی و ، شەرم نیە بەجێتر بێ لەوە کە ئینسان شەرم بکا لەوانەی شایانی شەرم لێ کردنن وەکو پیاوی پیر و گەورەی لێکەوتو و زانای لەناو نەزاناندا گیرخواردو و ، میهرەبانێ نیە بەنرختر بێ لە میهرەبانی لەگەڵ خزم و خوێشدا و ، هەمو ئەم پایانە لەسەر عەقڵ و هوشیاری دامەزراون .

ڕۆڵەی بەنرخم ! مامۆستای هوشیار    ئەڵێ ئەی ڕۆڵەی بەڕێزی دڵدار
خوا کە ئادەمێ کرد بە جێگەدار    بۆ یادگاری چەرخی ڕۆژگار
کردی بە پاشای تەختی سەرزەوێ    نایە بەردەستی جێی بەرز و نەوێ
لەبۆ نیشانەی لەناو گیانلەبەر    بە شەرەفی ( عەقڵ ) تاجی نایەسەر
چونکە پێویستە پاشا هوشیار بێ    بۆ پاسی ڕایەت زۆر ئاگادار بێ

★ ★ ★

بۆ تاریفی عەقڵ لە بۆ خاوەن هۆش    قسەت بۆ ئەکەم مەبە بە سەرخۆش
وەکو ئاوێنە لە جامێکی ساف    وێنە وەرئەگرێ بە شێوە و ئەوصاف
دڵیش جامێکی ناسکی خامە    عەقڵ جیلوەیە لەسەر ئەو جامە
بەهۆی عەقڵەوە وێنەی مەعلومات    لەویا جێ‌ئەگرێ لە ذات لە صیفات
بەو وێنە ئەڵێن عیلمی ئادەمێ    بەوە ئەبیتە فەردی عالەمێ

★ ★ ★

دەرکەوت کە عەقڵە ئەساسی عیلمە    عەقڵە کە مایەی ئارامێ و حیلمە
عەقڵ ئەساسە بۆ بیری ڕوناك    عەقڵ ئەساسە بۆ کردەوەی چاك
عەقڵ ئەساسە بۆ ڕەوشتی بەرز    میقیاسە لەبۆ ئاوەدانێ ئەرز
هەر عەقڵە دوژمن ئەکا بە برا    بۆ ڕۆژی ڕەوشت ئەبێ بە چرا
غرامێ لە عەقڵ چاترە بۆ تۆ    لە صەد تۆن عیلم و فەننی کۆنە و نۆ
عیلم ئاسانە هەتا بۆ حەیوان    تەعلیم وەرئەگرێ ئەڕوا بۆ کێوان
نەچیر ئەگرێت و دێتەوە بۆ ماڵ    تۆش گوشتی ئەخۆی حەلاڵ و زەلاڵ
بەلام خۆ بەوە نەبۆ بە ئینسان    هەر یارۆی دوێیە ڕاو ئەکا دیسان

★ ★ ★

عەقڵ دوّ نەوعە یەکەم بە سروشت    دوّهەم وەرگیراو بەهۆی دەوروپشت
گەلێ هۆی هەیە بۆ مەردی زانا    کە کەوتە تەکان لە ڕوّی جیهانا
یەکەمین دەرزی مامۆستای بەرزە    دەرزەکە مایەی ئاوایێ ئەرزە
دوّهەم بەراورد لە ڕوّی جیهانا    ئینسانی هوشیار ئەکا بە زانا
سێهەم عیبرەتە لەو کارەساتە    دێتە سەر یاران لەم سەر بیساتە
وتیان بەڕێوێ‌کەی‌عەقڵت دەس‌کەوت    وتی ئەوکاتەی ڕێچەی برام کەوت
چوارەم وەسیلە هاودەمێ ژیرە    گەنجە یا پیرە ، مێر یا گزیرە
لە هەموان چاتر پیری خاوەن دڵ    نەفەس پیرۆزی دڵپاکی کامڵ
( روح القدس )ە هەناسەی ئەوان    نەك هەر بۆ زیندوّ هەم بۆ مردوان
پێنجەم موتالای مێژوّی عالەمە    چەند ثەنای بکەی هێشتاکو کەمە
چونکە ئەحوالی برای فەوتاوت    دائەنێ لەبەر بیبیلەی چاوت

تێتئەگەیەنێ ئەم بۆ لەناوچۆ   وەك هەر نەبوێ ناوی کوێرۆ بۆ
ئەو چۆن ڕزگار بۆ لە زەربەی گەردۆن   بۆ بە شاهێکی سەربەرز و بێچۆن
بەڵام ئادەمێ هەرچەند یەك نەوعە   کە بۆی ئەڕوانێ هەزاران فەرعە
فەرعیوای هەیە بمرێ لەگەڵیا   نە بۆ دین سۆدی ئەبێ نە دنیا
کەڵك وەرناگرێ لە ئامۆژگاری   دەماخی دۆرە لە هۆشیاری
فەرعیوایش هەیە ئەوەند هوشیارە   ئەڵێی شاگردی بابای عەیارە
فەرعی مەوسوعەی بیری عالەمە   وێنەی کۆمەڵەی بەنێ ئادەمە
ئەڵێی هەڵئەفڕێ بۆ ئەوجی فەلەك   ئەڵێی یەکێکە لە بەرەی مەلەك
فەرعێ میانە و موعتەدیل حاڵە   بەقەد حاڵی ڕۆژ خاوەن کەماڵە
بەڕاستێ ئینسان بەصوورەت ڕەسمە   بەڵام بە سیرەت وێنەی تەلیسمە
هیچکەس نازانێ ئەسراری ئادەم   مەگەر ئەو خودا هێنای لە عەدەم
هەر ئەو ئەزانێ چێ تیا داناوە   زیوە ، ئاڵتۆنە ، نەوتە ، یا ئاوە
بۆیە تاقمی ژیرانی عالەم   وایان داناوە کە بەنێ ئادەم
هەر شەخصێ بۆ خۆی جۆرێکیوایە   تاقە فەردێکی هەیە بە مایە
ئەم بیرە هەرچەند دۆرە لە ڕاستێ   دەرچوە لەسەر فەرقی ئەشخاصی



بەکورتێ ئەڵێم ئەوەی هوشیارە   بەڕاستێ دڵی جێگەی ئەنوارە
بە خۆشێ ئەژێ و بە خۆشێ ئەمرێ   لەناو بەهەشتا شوێنی خۆی ئەگرێ
خۆزگەم بەو ڕۆڵە لەم دەرسە ئەگا   بەهەشتە جێگەی هوشیاری ئاگا
هوشیاری ( نامێ ) لە ماوەی ژیان   سەربەرزە لەبەر سەربەرزێ گیان

# گوڵی پێنجەم ـ گوڵی ئەدەب

بەهار دار گوڵی ئەدەب ئەڕوێنێ
قازانجی تەمێ بۆ تۆ ئەنوێنێ

أدَّبَنِي رَبِّي ، فَأحسَنَ تَأدِيبِي

ڕەهبەری نازدار ( درۆدی خوای لێ بێ ) فەرمۆیەتی : خودا بە میهرەبانێ خۆی تەمێی کردۆم و ئەدەبی داداوم و باش تێی گەیاندۆم و پێی گەیاندۆم .

زانایان باوەڕیان وایە ئادەمیزاد هەرچەند هەمۆ لە یەك کان دەرچوون ، بەڵام لە هێز و توانای نەفسدا جیان لە یەك . یەکێ لە ئەسڵی نەفسیەتی خۆیدا زیرەك و توانا و زۆ لە فەڕ و بەخشش و چاوپۆش و تێکۆشەرە و یەکێکیتر بەپێچەوانەی ئەوەوەیە . بە هەرجۆرێ بی تەمێ و تەربییە و تێگەیاندن و

پێگەیاندن بە بوون و نەبوون و بەپێی بەهێزی و بێهێزی کار لە صیفاتی ئادەمیزادا ئەکا . لەسەر ئەم یاسایە خوای گەورە بۆ سەر هەر تیرەیێ لە ئادەمیزاد ڕەهبەرێکی ناردوە تەمێیان بکا و ، خاوەن دەسەڵاتانی جیهان خوێندنگا و دانشگایان داناوە خەڵکیان تیا پەروەردە بکەن و بۆ دەرس دادانی ئادەمیزاد ڕەنجیان کێشاوە .

ڕاستەکەی ئەوەیە ئادەمیزاد کان کانە ، وەکو کانی ئاڵتون و زیو و مس و ئاسن . ئەو هێزەش کە لە ئینساندایە بێ دەستلێدان و تەمێ کردن سوودێکی ئەوتۆی نابێ . بەڵام کە تەمێ و تەربییە کەوتە کارەوە هەرکەس بەپێی خۆی سوودی دەرئەکەوێ وەك چۆن مامۆستای باش کە دەستی برد بۆ کانێ لە کانەکان سوودێکی گەورەی لێ وەرئەگرێ .

ئادەمیزاد وەك هەمو گیانلەبەرێ دو خوی هەیە . یەکەم ئارەزو بۆئەوە کە هەوڵ بدا بۆ ئەو شتانە کە بەسوودن بۆ ژین و ژیوار . دوهەم ئاڵوزی بۆئەوە کە هەرشتێ زیانی لێ بدا لە خۆیی دور بخاتەوە ، بەتایبەتێ ئادەمیزاد بێجگە لەم دو خووە خوی هوشیاریشی پێدراوە کە بناغەی زانست و سەرکەوتن و یاسا گوزینە بۆئەوەی بتوانێ سود لە شارستانەتێ وەربگرێ . جا ئەم سێ خووە یەکی سێ پایەیان هەیە : بەرز و نزم و ناونجێ . بێجگە لە پلە ناونجییەکەیان ، ئەو دو پلەکەیتر بە بەدخوێ ئەژمێررێن و هەمو تەمێ و تەربییەیێ بۆ ئەوەیە کە ئادەمیزاد پلە ناونجییەکەیان وەربگرێ .

پلەی ناونجێ هوشیاری بریتییە لە حیکمەت واتە زانستی ڕێکوپێك . پلە بەرزەکەشی بریتییە لە جەربەزەیێ واتە تیژپەڕی و وردنەبونەوە لە شت . پلە نزمەکەشی کەودەنێ و گوڵییە . پلەی ناونجێ ئارەزویش بریتییە لە عیففەت واتە پاکێ و نامۆس . پلە بەرزەکەشی فوجور و بێنامۆسییە . پلە نزمەکەشی خومود و دڵ مردویێ و ساردەوەبونە . پلەی ناونجێ ئاڵوزیش شەجاعەت و دڵ قایمێ و ، پلە بەرزەکەشی تەهەوور و خۆپەرت کردن و ، پلە نزمەکەشی خومول و لێکەوتوییە .

ئەوشتانەش کە ئەبن بەهۆی پێگەیشتنی ئادەمیزاد لەو خووە باشانە ، زورن . بەڵام هۆ بنچینەییەکانی بریتین لەمانە : ئامۆژگاری ، چاولێگەری ، هاوڕێیێ ، ترس ، هیوا واتە تەمای دەسکەوتنی قازانج ، بەسەرهاتی ژین .

ئامۆژگاری بەکورتی سێ بەشە . یەکەم ئامۆژگاری ناوماڵ و خێزان . دوهەم ئامۆژگاری دانشگا و خوێندگاکان . سێهەم پەندی هوشیاران وەك پەندی مزگەوت و مینبەر و وتاری کەسانی هەڵکەوتو لە ژیانا .

چاولێگەری و شوێن کەوتنی ئوسوڵی خەڵکی وڵاتیش بەپێی ئاداب و

نەریتی زۆر ، بەشێکی زۆر بەهێز و کاریگەرە و وەك کەمەند بنیادەم رائەکێشێ بۆلای خۆی و گەلێجار بەسەر هۆشی هوشیار و ئایین و ئیعتیباراتیشدا زاڵ ئەبێ .

هاوڕێیەتێ و برادەرایەتێ لەگەڵ هاوڕێ و هاوکاری ژیانی ئینساندا کارێکی زۆر ئەکاتە سەر گۆڕانی ڕەوشت و خۆی ئادەمیزاد . پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) فەرمویەتی : « المُجاوَرَةُ موءَثِّرَةٌ » . واتە : تێکەڵێ و دراوسێیەتێ کارئەکاتە سەر خۆی ئادەمیزاد ، خواە بە چاك یا بە خراپ . هەروەها فەرمویەتی : « المَرْءُ على دينِ خليلِهِ ، فَلْيَنظُرْ احَدُكُم من ذا يُخالِلْ » واتە : بنیادەم لەسەر ئایینی دۆست و هاوڕێیەتێ . کەواتە با هەرکام لە ئێوە ورد بێتەوە بزانێ دۆستایەتێ و هاوڕێیەتێ لەگەڵ کێ ئەکا ؟ هەر بۆیەش خوای گەورە فەرمویەتی « يا ايُّها الذينَ آمنوا اتّقوا اللهَ وكونوا مع الصادقينَ » واتە : ئەی کەسانێ کە باوەڕتان بە خوا هەیە ، لە خوا بترسن و لەگەڵ پیاوانی ڕاستدا بن .

گەلێ کەسی پاك بوون بەهۆی هاوڕێیەتێ ئینسانی بەدخووەوە بەدخۆ بوون و ، گەلێ پیاوی جاران خراپیش بەهۆی هاوڕێیەتێ هاوڕێی چاکەوە بوون بە پیاوی چاك :

| | |
|---|---|
| **لەگەڵ نامەردان مەبە بە هاودەم** | **نە ڕۆژی شادێ و نە شەوی ماتەم** |
| **لە مار بەدترە یاری ناهەموار** | **ئەو لە ژین ئەدا و ئەم لە ئیعتیبار** |
| **لەگەڵ مەردانا ببە بە هاودەم** | **بژێ بە خۆشێ و بەرە خاترجەم** |
| **مەرد ئەوکەسەیە دڵی مینا بێ** | **دوو چاوی بازی بۆ حەق بینا بێ** |
| **بێ دڵی بێچاو وا لەناو چادا** | **حاشا لەو کەسە لەم دەرسە لادا** |

هێزی هیوا و ترسیش لە گۆڕینی خۆی ئادەمیزادا پێویستی بە باس لێکردن نیە . فەرمان بەرداری خوا لەلایەن موسوڵمانان و فەرمانبەرداری گەورە گەوران و حوکمڕانان لەلایەن خەڵکەوە ، یا بەهۆی ترسی گیان و ژیانەوەیە یا بەهۆی هیوای شان و نانەوەیە . بۆیە خوای گەورە لە ئایەتی هەڕەشە لێکردنی تاوانباراندا باسی پایەی دواڕۆژی فەرمانبەرداران ئەکا . هەروەها ئەو سەرۆکانەی ئەیانەوێ تاج و تەختیان پایەدار بێ هەمیشە ئەبێ دەستێکیان بە کیسەی دراو و دەستێکیان بە مشتوی شمشێرەوە بێ ، بەڵام پێویستە شیر و تیر تەنها بەگوێرەی پێویست بخرێنە کار ، ئەگینا کوتەك بە دەست پیاوی بێکەماڵەوە وەك دەمانچەی هێنراوە سەر پێ وایە بە دەست منداڵەوە .

بەسەرهاتی ژین و کەشمەکەشی ڕۆژگاریش ئەوەیە ئادەمیزاد لە وڵاتی خۆیدا بێدەست و بێکەس بکەوێ ، یاخود لە وڵاتی خۆی دەربەدەر ببێ و تووشی

گەلێ ناهەمواریێ و گیروگرفت ببێ و بۆ هەر نانێ زیانێکی تۆش ببێ . جا بەهۆی ئەو ڕۆژە ڕەشـەوە کـە تۆشـی بـوە بیر بکاتەوە لـە حالی پێشوی خۆی و سەرزەنشتی خۆی بکـا لە زایەکردنی مایە و مـالی خۆی یا لـە ناسوپـاسیێ و بەدحالیی خۆی و ، پەیمان بکا لەگەڵ خوای خۆیدا کەوا لە پاشماوەی ژیانیدا وەزعی خۆی بگۆڕێ و دەسبەرداری خۆی خراپ ببێ . بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویە : « مَنْ لم یؤدِّبْهُ أبواهُ ، یؤدبهُ الدهرُ » . واتـە : ئەوەی باوك و دایکی تەمێیان دانەداێ چەرخی زەمانە تەمێی دائەدا .

ئەم شتانەی باسمان کردن ئەگەر بکەونەیـەك ، کـارێکی زۆر ئەکەن لـە گۆڕینی خۆی ئینساندا . ئەگەر هەر یەکێکیشیان بەپێچەوانەی ئەویان کـاری تیا بکەن ، وەك ئەوە باوك و دایك بەجـۆرێ تەمێـی منـاڵ بکەن و هـاوڕێ بە جۆرێکیتر ، ئەوە سـەرکەوتن بۆ ئەویانەیە کە زۆرداره و زۆری بەدەستە ، وەك مەشهورە ئەڵێن فەرمان بۆ زۆردارە .

واش هەڵئەکەوێ ئینسانێك بێ ئەم ئەسبابانە ، هەر بەیارمەتێ خـوای گەورە دڵی ڕۆناك ئەبێتەوە و چاوی ئەکرێتەوە و ڕۆ ئەکاتە بیروباوەڕی پـاك و کار و پیشەی چاك . ئەم جۆرە تەمێیە هەر لە خواوەیە .

هەرچۆن بێ پێویستە ئـادەمیزاد هەمیشە تێبکۆشێ بۆ ڕەوشتی چـاك و کرداری پیاوانە ، بەجۆرێ کە وژدانی خۆی شاد بکا و خۆی لە ئازاری دنیـا و دوازۆژ ئازاد بکا و کەسیش لە تێکۆشان و هەوڵدان نائومێد نابێ .

ئـادەمێ کاتــێ دێتـە دنیــاوە
بەپێی ڕۆژی خۆی دەستی لێ ئەدرێ
بەلام هەرکەسێ بـە خواستی خودا
زیرەك و کـەودەن پەسـت و بالایە
کاتێ بۆی هەلکەوت ئامۆژگاری ساغ
پیاوی بـە دەمـاغ لـەبەر چـالاکێ
دیومـانە گـەلێ ئینسـانی نـابـار
گەلێ ئینسـانی بەخولـق و مایـە
ئەبینین بە چاو ، ئەزانین بە هۆش
دڵ و گورچیلـە و چـاوی نابینـا
مانـیعیش نیـە نەخـۆشێ بمـرێ
هەروەها تەمێیش بـۆ نەخۆشی خۆ
مـانیعیش نیـە ئینسـانی دلڕەش
پێویسـتە ئادەم بـە دڵ تێکۆشێ
گـەلێ جـار زۆرە قازانجی تـەمێ

قاقـەزی سـادەی لێ نەنوسـراوە
بەم بـارە و بارا ئیشی تیا ئەکرێ
پایـەیێ هێـزی بۆ بڕیـار درا
وێنـەی قوماشـی ئـاڵ و والایـە
بێ دەمـاغ ئەبێ بـە خاوەن دەماغ
ئەگاتـە پایـەی بـەرزی ڕۆنـاکێ
بە تەمێی ئوسـتاد بوە بـە سەردار
خولقی وەرگـەڕا و ڕۆیێ بـە زایە
قازانجی دەرمـان بۆ پیاوی نەخۆش
چـاك ئەکاتـەوە دوکتـۆری زانـا
بە دەستی دوکتـۆر عیلاجی ئەکرێ
قازانجی زۆرە نـەك بـە یەك و دۆ
لە سوودی تەمێ بێ بەهرە بێ و بەش
بۆ تـەمێی بـرای تـالێ بنـۆشێ
هەندێ جار نیە و هەنـدێ جار کەمێ

| | |
|---|---|
| هیچ کەسێ ناڵێ تەمێ وەهایە | بێ قەزا و قەدەر وێنەی قەزایە |
| ئێمە هەتا هەین لە کورەی ئافاق | ئەبێ تێکۆشین بۆ بەرزێ ئەخلاق |
| نائومێد نەبین بە هەوا و خەیاڵ | دەس‌بەردار نەبین لە تەمێی منداڵ |
| ئینجا هەرکەسێ خۆی و ناوچاوی | خۆی و تالیعی خودا پێداوی |

## گوڵی شەشەم ـ گوڵی عیلم و زانست

بەهار لە هەوری ڕەحمەت و ئیحسان
بەسەر وڵاتا ئەڕژێنێ باران
بەڵکو دار گوڵی عیلم و مەعریفەت
بڕوێ بۆ ڕۆڵەی بەهۆش و هیممەت

طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ وَ مُسْلِمَةٍ

ڕەهبەری نازار سەلامی خوای لێ بێ فەرمویەتی تێکۆشان بۆ وەرگرتنی عیلم و زانست فەرز و پێویستە بۆ هەمۆ موسوڵمانێ . هەروا لە گەلێ فەرمۆدەی‌ترا هانی موسوڵمانانی داوە بۆ داواکردنی عیلم و زانست و فەرمۆیەتی داواکردنی عیلم و زانست خێری لە پێویستییەکانی‌تری موسوڵمانەتی زۆرترە .

لەڕاستیدا زانست ، زانستی هەرچێ بێ ، بەسۆدە ، چونکە ئەو شتەی کە ئینسان ئەیزانێ ، ئەگەر خاوەن سۆدە ، ئەوە سۆدی لێ وەرئەگرێ . ئەگەر زیان بەخشیشە ، خۆی لەو زیانە ئەپارێزێ . ئەگەر شتێکی‌وایشە سۆد و زیانی نەبێ ، ئەوە سۆدی زانینەکەی ئەوەیە ئەو شتە لە شتە سۆدمەند و زیان بەخشەکانی‌تر جوێ ئەکاتەوە و خۆی پێیانەوە ماندۆ ناکا .

بۆیە زانایانی ئیسلام فەرمۆیانە فەرز دۆ بەشە . یەکەم : فەرزی عەینە کە پێویستە بۆ هەر موسوڵمانێکی پێگەیشتۆ و هوشیار . دۆهەم : فەرزی کیفایەیە ، واتە ئەگەر لە کۆمەڵەیەکدا یەکێ یا چەند کەسێ جێبەجێی بکا بەسە . لەسەر ئەم ئەساسە گەلێ عیلم و زانست هەیە فەرزی عەینن وەکو زانینی ئەو شتانەی ئایینی ئیسلام بڕیاری داون لەسەر موسوڵمان ، وەکو زانینی واجباتی نوێژ و ڕۆژۆ و زەکات و حەج و باقێ ئادابی ئیسلام . هەروەها وەکو عیلمی ڕێك‌کردنی خۆ و ڕەوشت . واتە فەرزە لەسەر هەمۆ موسوڵمانێ بزانێ چۆن نەفسی خۆی پاك ئەکاتەوە لە خوڕەوشتی ناپەسەند وەك کینە و حەسۆدێ و بوختان و زیان گەیاندن بە موسوڵمانان و لەخۆبایێ بۆن و چەشنی ئەمانە .

هەندێ زانستیش هەیە فەرزی کیفایەیە وەکو خوێندنی علومی ئیسلامێ، ئەوەی کە پێویستی موسوڵمانانە بۆ تێگەیشتن لە مەعنای فەرمۆدەکانی خوا و

پێغەمبەری خـوا و ، وەکو زانینی کشتوکاڵ و پیشـەسازیّ و بازرگانیّ و حەیوانداریّ و بەرگریّ لە دوژمن و دەرهێنانی کان و شتیوا . خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی داوە بەوە کەوا ئادەمیزاد بەئەرزدا بگەڕیّ و سوودی لیّ وەربگریّ . هەروا فەرمۆیەتی ئێمە ئاسنمان داناوە کە هۆی هێزە بۆ ئادەمیزاد و گەلیّ سوودیتریشی تیایە ــ بەهۆی دروستکردنی ئەسبابی جەنگ و قاپ و قاچاخی ناوماڵ و پێویستییەکانی ئادەمیزاد کە لەگەڵ خۆیدا هەڵیانبگریّ یاخود لەناو ماڵا دایانبنیّ . هـەروا فەرمانیداوە بـەوە کـە موسوڵمانان هـەرچیّ لەتوانادایە ئامادەی بکەن و ڕێکیبخەن بۆئەوە کە دوژمنی خوا و دوژمنی خۆیان بترسێنن .

بەکورتیّ سەربەرزیّ و پیرۆزیّ ژیانی ئادەمیزاد لە زانستدایە و تا زانست زۆرتر و بەسوودتر بیّ ئادەمیزاد پێشکەوتوتر ئەبیّ .

ڕۆڵەی ئازیـزم ، بەندی جەرگەکەم | یادگارەکـەم لـەپاش مـەرگەکەم !
هـەرچیّ زانسـتە بۆ تۆ بەسـوودە | عیلم ڕەهنومـای ڕێگـای مەقسوودە
هەر عیلمیّ باسی پێویسـتی دینـە | لەسەر تـۆ فەرزی عـەینی یەقینە
وەکو باوەڕت بە خـوا و بە ڕەهبەر | فریشتە و کیتاب ، بە قەزا و قەدەر
بە ڕۆژی حیساب بەهەشت ودۆزەخ | بە وەزعی مردوّ لـە ماوەی بەرزەخ
شەهادە و نوێژ و ڕۆژوی ڕەمەزان | حەجی (بیت الله) و زەکات بە میزان

★ ★ ★

پاش ئەمـە عیلمی ئیخلاصـی دڵـە | بیّ ئیخلاصی دڵ نەجـات موشکولە
بیّ پاکیّ لە گشت ڕەزیلـەی نەفسیّ | ناگەی بە نەشەی ئـەنواری قودسیّ
یەکەم هۆی ئەمە صوحبەتی مـەردە | داوێنەی بگرە و ئـاوێنەی بـەردە
ئاوێنـە وێنـەت پیّ نیشـان ئەدا | ئەم حەقیقـەتی مـەعنای ئیهتیـدا
صوحبەتی تـاویّ نیگـای لاچـاوی | بەسە بـۆ بەختـی خـوا پێـداویّ

★ ★ ★

پاش ئەمە هەرچیّ بـۆ ژین بەسوودە | بۆ ئادەمـیزاد فـەرز و مەقسوودە
یا فەرزی عـەینە لەسـەر هەمۆکەس | یا بە چەندکەسیّ کیفایەتە و بـەس
یەکەم عیلمی طِبّ چاری نەخۆشیّ | ئەووەڵ واجبـە ئـەگەر بـەهۆشیّ
ئەمجـارە فـەننی ڕیشـەی داراییّ | پێویسـتە لـەبۆ جیهـان ئـارایی
دارایی کـە نـان ئەدا بـە عالـەم | دێو ڕام ئەبیّ بۆی تـا بەنیّ ئـادەم
سوپا و سامان و پاسای ڕۆی جیهان | بـە بیّدارایـیّ دوّرن لـە ئیمـکان

★ ★ ★

بەرگـریّ دوژمــن بەپـێی زەمانــە
فەرمــانی داوە خــوا لــە قــورئانا
بــۆ ترســاندنی دوژمنــی دڵڕێش
گەلێ کــە دوژمــن دوڕ نــەخاتەوە
مار لە باخەڵدا و خەنجەر لــە ڕاسەر

پێویستی شێوە و شــانی ئینســانە
ڕێکبخــەن ئــەوەی وا لــەئیمکانا
مەیدانی مــەدەن بــا نەیەتــە پێش
ســەر ئەنێتــەوە بــە نەهاتــەوە
یاسینی ئەوێ بــە بێ دەردی سەر

بەهار بانگئەکا ئەی ڕۆڵەی هوشیار
زانستی ئــادەم وێنــەی گــەوهەرە
ڕەهبەری نــازدار فەرموێــە پێمان
لــەلای ئینســانێ دڵــی دانــا بــێ
بێ عیلم و زانســت نــاگەن بە پــایە

هۆش بۆ زانستە و زانستیش بۆ کار
گەوهەر دەسمــایە و بەشی بەشەرە
تێکۆشان بۆ عیلم فەرزە لەسەرمــان
نرخی ئــەم واتە قــەت تەواو نــابێ
کۆمەڵی نــەزان ســوک و ڕســوایە



زانــا نرخی خۆی بە حەق ئەنــاسێ
کــاتێ خۆی ناســێ بە (علم اليقــين)
کە جیایکردەوە لــە ڕیزی دێــوان
جیــای کــردەوە لــە گیــانلەبەران
هەتــا بە عیلــم و عەدالەتکــاریّ
ئەمەیە پوختــەی وتــاری (بەهــار)
ئــادەمی زانــا ( نــامێ ) زەمـــانە

خــۆی نافــرۆشێ بە حەقنەناسێ
ئیمانیش دێنێ بە خــوای عــالەمین
نەیکرد بە وەحشێ سەرهەردو کێوان
پەیڕەوی بۆ نــارد لەگەڵ ڕەهبەران
بــژێت و بمــرێ بــە بەختیــاریّ
ئــەبێ زانا بێ ڕۆڵــەی بەختیــار
دڵی بــە ئیمــان جێگەی ئەمـــانە

## گوڵی حەوتەم ـ گوڵی ڕەنجی شان

بەهــار بە بــاران زەوێ تــەڕ ئەکــا
دەشتی دەشتەوان خــاوەن فەڕ ئەکا
تۆوێ ئەچێنێ بە ڕەنجــی شـــانی
کە بیــێ بەهــۆی نــان و ئیمـــانی

**ما اكَلَ احدٌ طعاماً خَيْرٌ مِنْ ان يأكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدَيهِ .**

پێغەمبەری نازدار فەرموێەتی : کــەس خواردەمەنییەکیوای نەخواردوە باشتر بێ لەو خواردەمەنییەی دەسکەوتی ڕەنجی شان و قۆڵی خۆی بێ .

ئادەمیزاد وەکو لە قەوارە و هــۆش و ئەندام و دەســت و پێــی خۆیــدا سەربەخۆیە ، ئەبێ لە دروستکردنی ژیوار و هۆیەکانی ژیانی خۆیشیا سەربەخۆ بێ و پاش یارمەتیی خوا بە شان و قۆڵی خۆیدا بنازێ . ئادەمیزاد لە شێوەی

درەختدایە و ئەو درەختەش بەنرخە کە بەری باش بدا ، ئەگینا داری بێبەر ئەیبڕن بۆ سووتاندن یا بۆ بەکارهێنانێکیتری وەختێ . کەواتە لە ئینسانیشا ئینسانێك بەنرخە ڕەنجکێش و دارایێ لەپێش بێ . مەسەلەی کوردێ مەشهوورە ئەڵێ : « فرمانکەری ، شیرینی . نوێژکەری ، نووری ».

ئینسانی ڕەنجکێش یا گەنجی دارایێ وەرئەگرێ یا لە ڕەنجی منەتی خەڵك ڕزگار ئەبێ . کەواتە بە هیچ بەهانەیێ ڕەوانیە ئادەمیزاد خۆی بکا بە بار بە سەرشانی خەڵکەوە ، چونکە شێوەیوا گیانلەبەرە کێوییەکانیش پێی ڕەزا نابن .

ئادەمی هوشیار ئەبێ تێکۆشێ ... بۆ خۆی و گەلی زەحمەت بنۆشێ
پێویستە ئادەم خاوەن بارە بێ ... ئەگینا بڕوا هەر ئاوارە بێ
ئەتوانین نیە بۆ ئینسانی ساغ ... ئەزانین نیە بۆ خاوەن دەماغ
بڕوانە هەولی دەستەی گیانلەبەر ... قرژانگ بە پەلە ئەڕوا بە دوو سەر
هەموو دڕندە و چەڕندە و باڵدار ... چ بێئازار بن چ خاوەنئازار
هەموو هەوڵ ئەدەن بەدوای ژیانا ... شوێنیان جێدێڵن بە سەبەینانا
یەعنی لە هێزا لەوان کەمتری ... ناتوانی بۆخۆت بەشێ وەرگری
بێ بۆ بەراورد بۆ ماوەی دوو ساڵ ... باش تێبکۆشە بۆ خۆشی ئەحواڵ
ئەوجار ئەزانی چۆن ڕزگار ئەبی ... چۆن بۆ ژینی خۆت فێری کار ئەبی

★ ★ ★

پێغەمبەر دایم ئەیفەرموو بە خەڵك ... خوا خۆشی نایێ لە پیاوی بێکەڵك
خودا نایەوێ ئینسانی بەتاڵ ... نایەوێ شەخصی سادە و بێکەماڵ
خودا طالیبە بۆ ئەخلاقی بەرز ... بێ بە مایەی ئاوەدانی ئەرز
لە ئامۆژگاری گوێی خۆت کەڕ مەکە ... خۆت بە خەیالات ئاخر شەڕ مەکە
خۆت مەکە بە دیل بۆ خەیالی خاو ... کوڕی فلانم خاوەن پایە و ناو
هەزار ناوی زل نابێ بە نانێ ... نابێ بە مایەی پایە و ژیانێ
کێ ڕەنجبکێشێ ئەوە بەختەوەر ... کۆسپ وتەگەرەی قەت نایەتبەر

★ ★ ★

قەت بایێ نەبێ بە ئاشنا و دۆس ... دەسیخۆت نەبڕێ بەلێوی دەسبۆس
هەزار ئاشنا کە لەگەڵتا بێ ... نابێ بە نەختێ لە باخەڵتا بێ
لێم زویر مەبە ئاشنای دڵپاك ... چەند جار دیتەلات بە چیهرەی ڕوناك
بەلام لەپاشان لێت وەڕس ئەبێ ... لە خزمەتی تۆ بێمەبەس ئەبێ
بەڵێ وائەبێ یەکێ لە هەزار ... خۆی فیدا ئەکا و هەڵئەگرێ ئازار
بەلام بە گوڵێ قەت بەهار نایێ ... بۆ ڕازانەوەی ئەرز بەکارنایێ
باسەکەی ئێمە لەسەر ئوسووڵە ... لەسەر ژیانی ڕێك و مەقبووڵە
بەسەر کەسەوە خۆت مەکە بە بار ... وەك درەختێ بە سایە و سەمەر دار

ئەگەر هاتو ڕەنجت کێشا بەڵام دەسکەوتەکەت ڕەسا نەبو ، ئەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەمیشە ئەبێ تێبکۆشێ بۆ گۆڕینی وەزعی کەم‌وکوڕی خۆت ، پێویستە تاخوا دەرۆیەکت لێ ئەکاتەوە ، بەو کەم و کوڕیێ خۆتەوە بساچێنێ و کزێ و لاوازێ و داماوێ خۆت نەنوێنێ ، چونکە ئادەمیزاد لەناو سێ بەشا ئەژێ: یەکەم دۆست، دوەهەم دوژمن، سێهەم بێ‌لایەن. داماوێ نواندن لای کەس لەمانە هیچ سودێکی تیا نابێ،چونکە دۆستەکانت ناتوانن دەوڵەمەندت بکەن و دڵیشیان بە کزییەکەت پەرێشان ئەبێ . دوژمنەکانیشت شادەکامیت پێ ئەهێنن و بە سوکیش ئەکەویتە پێش چاویان و قەدرت نامێنێ و بێ‌لایەنەکانیش ئیشیان پێت نیە و پەیوەندیان لەگەڵت نیە ، خۆیان ناکەن بە خاوەنی نە خێرت و نە شەڕت و دەربڕینی کزێ خۆت لایان هیچ دادێکت نادا . بەپێچەوانەوە ئەگەر بۆ خۆت بساچێنێ و شان و شکۆی خۆت نەشکێنێ ، نە دوژمن پێت شاد ئەبێ و نە دۆستەکانت دڵ بریندار ئەبن . لەسەر ئەم ئەساسەیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « القَنَاعَةَ كَنزٌ لایَفْنَى » واتە بە کەم ساچاندن بۆ ئادەمیزادی بێ‌دەست وەکو گەنجێ وایە هەرگیز نەبڕێتەوە ، لەبەرئەوە کە یەکەم : ئەوکەسەی قەناعەت بکا شان و پایەی خۆی ڕائەگرێ و کەس بە حاڵی نازانێ . دوەهەم : ماڵ و منالی خۆ بە ژیانی کەم و کوڕەوە ئەگرن و هەرکاتێ شتێ لەوە زیاتریان دەس‌بکەوێ زۆر سوپاسی خوا ئەکەن و وەك خانەدانە خاوەن داراییەکانیان لێ نایێ کە بە کەم و زۆر سوپاسی خوایان لانامێنێ ، بەڵکو گەلێ‌جار ناسوپاسێ دەرئەبڕن . سێهەم : ئەو منالانەی بەم‌شێوە ژیانە پێ‌بکەن هێز بەسەر نەفسی خۆیانا پەیدا ئەکەن و ئەتوانن لە هەمو ڕۆژێکا بژین . چوارەم : مادەم لەسەر ئەم بارە خۆ بگرن خوای تەعالا لە دوارۆژا پاداشی باشیان ئەداتەوە . پێنجەم : ئەو خێزانە هەمیشە هەوڵ‌ئەدەن بۆئەوە کە بگەن بە ژیانێکی بەرزتر و بەم‌هۆوە خەریکی خوێندن و فێربونی هونەر و پیشە و ئیش و کار ئەبن و خۆیان پێ‌ئەگەیەنن . شەشەم : ئەو خاوەن ماڵانە لە ڕۆژی قیامەتدا لێ‌پرسینەوەیان کەم ئەبێ لەبەرئەوە کە لە ماوەی ژیانیانا داراییان ئەوەندە نەبوە کە واجباتیان زۆر بێتەسەر .

ڕۆڵەم ! بە قەزا هاتو کەم‌دەس بوی
چارت دۆ شتە یەکەم هەوڵ و دەو
دوەهەم قەناعەت یانێ ساچاندن
بێ‌سودە گەدا خوی ڕسوا بکا
دوژمن لە کەیفا بێ شادمان
ماوەیێ بژێ بەو خودا داوە
پاش ئەوە قەزا ئەگەڕێتەوە
کردم نەگۆڕا و بە بێ ماڵ مردێ
جەزا لای خودا و سەربەرزێ جیهان

لە ڕۆژگارا تەنگە نەفەس بوی
لە ئیش و کارا بە ڕۆژ و بە شەو
بەوەی کە هەتە بێ خۆ نواندن
لای دۆست و دوژمن ئەلوەدا بکا
دۆستیش خەفەتبار چاو پڕ لە گریان
نان و پیازە یا چوزێ ئاوە
قاپێ داراییت لێ‌ئەکرێتەوە
ژیانت چیە ئەگەر تۆ مەردی
بەسە بۆ مەردی دەرۆن فراوان

ئەگەر وا ڕێکەوت هەر بە گەدایی مایتەوە و ناچار بۆی بۆ دەست درێژ کردن لە بەردەمی خێرۆمەندانا ، لەمکاتەدا مانیع نیە شت لە خەڵکی وەربگری و چاری داماویی خۆتی پێبکەی ، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دەستی خێرومەندەکە بە خاوەن حورمەتتر دائەنرێ لە دەستی خۆت وەکو پێغەمبەر فەرموویە : « الیَدُ العلیا خَیرٌ مِنَ الیَدِ السُفلی » واتە : دەستی بەخشندە لە دەستی وەرگر چاترە . جا ئەم شتەی کە وەری‌ئەگری لە خێرۆمەند ، ئەگەر لە واجباتی دینی بێ ، ئەوە بە هەر حاڵ قەید ناکا . بەڵام ئەگەر شتێکی‌وا بێ بە منەت و نازەوە بتداتێ ئەوە وەکو ئاوی سەرەمەرگ وایە و مردنی ئینسان چاکترە لەوە کە خۆی گیرۆدەی منەت بکا .

من لە بۆ تۆمە ئەی ڕۆڵەی هوشیار — خۆتم لێ مەکە بە مەلی سەردار
گوێ بگرە بە دڵ لەم پەند و دەرزە — ڕای‌بگرە تا وای لەسەر ئەم ئەرزە
شانت بفەوتێ لە کوڵ و کێشا — دەستت بسوتێ لە خۆڵەمێشا
دڵت ببرژێ بە کورەی زەحمەت — چاترە لەوەی بژیت بە منەت
زینهار ڕۆڵەکەم منەت‌بار نەبی — بە باری منەت شەرمەزار نەبی
بکێشە خاری مەینەت و ماتەم — مەکێشە باری منەتی حاتەم
چاوەڕێ نەبی بۆ نانی خەڵکی — نانی دەسی خەڵك هیچ نیە کەڵکی
شەخسی چاو لەدەس بەچەشنی دیلە — بە دڵ داماوە و بە گیان زەلیلە
بڕۆ بە ڕەنجی قۆڵ و شانی خۆت — بیە بە خاوەن پوڵ و نانی خۆت
بڕۆ دەس ببە لەبۆ دانی مار — نان مەخۆ لەسەر شێوەی خزمەتکار
ئەو ڕاوەستانەی لە بۆ ژیان بێ — یاخوا بە چەشنی ژاری ماران بێ
گەلێ خزمەتکار خۆیان فیدا کرد — بێجگە لە مردن هیچیان دەرنەبرد
هاتۆ بەندە بۆی بەندەی خودا بە — لە دەرگای ئەودا سەر بە سەودا بە
نۆرێکی وەها ئەدا بە دڵت — خۆت بیکەیتەوە گرێی موشکوڵت
هەر ئا بەو نۆرە ڕێگا دەرئەکەی — بە مایەی دین و دنیای خۆت ئەگەی
ئەمەیە دەرسی مامۆستای دڵسۆز — بە ڕەنجی شانە ژیانی پیرۆز
کەسێ ( نامێ ) بێ وەرئەگرێ ژیان — لە باری لەش و لە ئەنواری گیان

★ ★ ★

سود و قازانجی ئادەم بۆ ئادەم — میزانە لەبۆ نرخی بنیادەم
هەتا زۆرتر بێ سوودی لەناوا — باشتر جێ‌ئەگرێ لە پەردەی چاوا
بەڵام ئەم سوودە ئەگەر بە شانە — هەرچەندە زۆر بێ هێشتا نوقسانە
سوودی بە عیلم و زانستی ئەوە — ئەوەیە چرای تاریکەشەوە
خەڵکی ئەخوێنن ئەبن بە زانا — لە هەر بابەتێ لە ڕوی جیهانا
پەرەئەسێنێ عیلم و زانستی — کۆمەڵ دەرئەچێ لە دیلی و پەستی

★ ★ ★

ئادەمیّ نەزان داری بیّ بەرگە ژیانیشی هەر بە ویّنەی مەرگە
پاشازادە بیّ لە ڕۆژی نەهات ناگاتە پوولیّ نرخی لە ولاّت
کاتیّ زانا بوّ پیشەوەر ئەبیّ لەناو کوّمەلاّ هونەروەر ئەبیّ
ئەو ئوّمەتانەی پیّشکەوتوی چەرخن لەبەر زانستە وا خاوەن نرخن
یەکەم زانستی پیّویستی ئایین تا بە منداڵیّ حاڵیّ بیّ لە دین
دوّهەم زانستی تەئریخی ڕەهبەر ئەوەی لەسەرمان بوە بە سیّبەر
سیّبەری ڕەحمەت بە ڕەوشتی چاک بە کردەوەی بەرز بە دلّی ڕوّناک
سیّهەم زانستی میّژوّی کارەسات هەتا تیّبگەی لە میّژوّی ولاّت
چوارەم زانستی فەن و پیشەی بەرز هوّی ئاسایشی ئادەمیّ سەر ئەرز
پیّنجەم زانستی فەننی ئیدارە لەبوّ قازانجی گەلی ئاوارە
شەشەم زانستی یاسای یەکیّتیّ کە ئەبیّ بەهوّی پیروّزیّ گیّتیّ
حەوتەم زانستی ئەخلاق و ڕەوشت ئەوەی کە جیهان ئەکا بە بەهەشت
واتە کە دەرچوّی لە خوّپەرستیّ عالەم دەرئەکەی لە پایەی پەستیّ
هەشتەم ئیخلاص و فیداکاریّ توّ بوّ ئاوەدانیّ جیهانیّکی نوّ



بەمانە ئەبیّ ئیکتیفای ذاتیّ یانیّ ژیواری دوّر لە نەهاتیّ
ئیتر چوّن ئەبیّ توّ بیّ ئەمەل بیّ دوّر لە زانست و عیلم و عەمەل بیّ
بوّ بە ویّنەی شیّر ناچیتە مەیدان بوّ نابیّ بە شیّر بوّسەر نامەردان
هەتا شیری ساف بکەیتە گەروّ خویّنی پیس نەمژیّ بە ویّنەی زەروّ
ئەمەبوّ دەرسم ، واتەم تەواوە مادەم ڕوّلەی ژیر هەیە لەم ناوە
ئەوکەسەی ژیرە ( نامیّ ) مەشرەبە بەرزیّ لای خودای بە دلّ مەتلەبە

## گوڵی هەشتەم ـ گوڵی سوّد و مەنفەعەت

بەهار باخاتی کەرەم ئەڕوێنیّ
سەرچاوەی سوّدی عالەم ئەنوێنیّ

خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ

ڕەهبەری نازدار سەلامی خوای لیّ بیّ فەرموویەتی : چاترینی ئادەمیزاد ئەوکەسەیە سوّدی زوّرتر بگەیەنیّ بە ئادەمیزاد .

هوّی قازانج گەیاندنی ئادەمیزاد بە ئادەمیزاد زوّرە .

یەکەم قازانج گەیاندنە پێی بە لەش ، بەوجوّرە کە ئینسان هەر خزمەتێکی بوّ بکریّ بە لەشی خوّی بیکا ، وەکو خزمەت کردنی لیّقەوماو و دەرمان کردنی

نەخۆش و دەستگرتنی پیر و کوێر و شارەزایی کردنی غەریب و یارمەتیدانی ئەوکەسانەی پێویستیان بەو یارمەتییە هەیە . دۆهەم پایە و شانە . بەمجۆرە کە ئادەمیزادی بەنرخ و پایە بڵند هەوڵبدا بۆئەوە کە ستەم لیکراوی ڕزگار بکا و گیرۆدەیی لە بەند دەربێنێ و بێجێگە و ڕێگەبێ دامەزرێنێ و بە قسەیەك ئینسانێکی بێکەس و بێدەس پێبگەیەنێ . سێهەم ماڵ و دارایییە ، واتە ئینسانێکی دارا و دەوڵەمەند لەپاش ئەوە کە واجباتی دینێ لەو ماڵە دەرکرد تا بۆی هەڵئەسوڕێ ئەگەر بێدەستێکی چاو پێکەوت ماڵی دنیای بداتێ و قەرزی بۆ ببژێرێتەوە ، بەتایبەتی بۆ خزم و خوێشی خۆی و ، سەرپەرشتێ هەتیو و داماو بکا و دارایی خۆی خەرج بکا بۆ دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و میوانخانە و میوانداری بکا و هەرشتێ هەڵکەوت بەگوێرەی خۆی ماڵی تیا صەرف بکا . چوارەم عیلم و زانستە . پێویستە هەرکەس لە زانیاری بەشدار بۆ بە قەدەری خۆی ئەو زانستەی بە خەڵك بڵێت و ئەو عیلمەیان پێ نیشانبدا و مەنعی نەکا لە کەس ، وەك پێغەمبەری نازدار فەرمویە : « العِلمُ لا يَحِلُّ مَنعَهُ » واتە ڕەوا نیە مەنعی عیلم و زانست بکرێ لەوانەی ئەتوانن وەریبگرن و پێویستە ئینسانی زانا زانستەکەی خۆی بڵێ پێیان و ئاگاداریان بکا لێی .

ئاشکرایە ئەم عیلم و زانستە هەمۆ جۆرە عیلم و زانستێك ئەگەیەنێ ، لە عولۆمی دینێ و عولۆمی دنیایی ، واتە ئەو عیلمانەی کە ڕاستەوخۆ باسی ئایین ناکەن وەکو ئەندازیاری و ماتماتیك و ژمارە و مێژۆی جیهان و جوغرافیا و هەر زانستێکیتر .

ئادەمی لەپاش ئیمان و باوەڕ | نرخی قازانجە بۆ گەلی بەشەر
ئادەمی دارە ، دار لەبۆ بەرە | یا لەبۆ خانۆ یا بۆ سێبەرە
یا بۆئەوەیە بکرێ بە خانۆ | یاخود بسوتێ و بخرێتە کوانۆ
ئەگەر سودێکی لەمانەی نەبێ | نەبێ چێ نابێ ، ببێ چێ ئەبێ
سۆدی ئادەمی بە لەشە و بە ماڵ | بە پایە و شانە و بە عیلم و کەماڵ



هەندێ ئادەمی بە وێنەی کانە | مایەی ژیانی نەوعی ئینسانە
ڕێ نیشاندەرە بە گەلی گومڕا | ئەیانپارێزێ تا نەکەونە چیا
ئەبێ بە مەڵهەم بۆ زامی خەستە | ئەبێ بە تریاق بۆ ماران گەستە
ئەبێ بە پەنا ڕۆژی لێقەومان | ئەبێ بە دەوای دەردی بێدەرمان
نان پەیدا ئەکا و ئەیدا بە بێنان | چ لە دۆستان ، چ لە دوژمنان
بە یەك دۆ قسە ئادەمی دڵسۆز | شەوی شۆم ئەکا بە ڕۆژی نەورۆز
ئەم ئینسانانە کلیلی خەیرن | زینەتی دنیا و شیاوی سەیرن
یاخوا پیاوی باش هەر پایەدار بێ | بۆ گەلی داماو هەر سایەدار بێ

ئافـەرین مـەردی ســـاڵە گـرانێ بەهەشتی کڕێ و بـە خۆی نەزانێ
چڵـــەی هەسـتۆنی خـانـەدانەکان بە بەرزێ گەییە حەددی ( لامکان )
ئەوەی لەبۆ گـەل ئـەبێ بـە قـەڵا ئەیانپـارێزێ لـــە دەرد و بــەڵا
کەڵلـەی ئـەگاتە کلاوەی کەیـوان لە گەرمای ئەولاش وا لەژێر سەیوان
بەپێی قازانـجی بەشەر بـۆ بەشەر پایەی بۆ دانـا حـەزرەتی ڕەهبـەر
ئیتر هەرکەسێ خۆی و بەختی خۆی خۆیو ناوچاوو بەختو تەختی خۆی
ئەمەیە دەرسـم لەبۆ خاص و عـام شەخسی خێرۆمەند ئەگا بـە مەرام
خێرۆمـەندییە بـە فکـری سـامێ مایەی مانـەوە بۆ مـەردی ( نامێ )

# گوڵی نۆهـــەم

## گوڵی بەندەیێ خوا و خزمەتی باوك و دایك

کـاتێ ئــەبارێ بـــارانی بــەهار
گەردنبەند ئـەکا بـۆ گوڵی گوڵزار
ئـەڵێ خەڵکینە ئەگـەر حەقناســن
بـەم گەردنبـەندا خـودا بناســن

وَقَضى رَبُّكَ انْ لا تَعْبُدُوا الاّ ايّاهُ وبِالْوالِدَيْنِ اِحساناً .

پەروەردگاری بینا و تەوانا فەرمانی بە هەمێ هوشیارێ داوە کەوا پێویستە سەری بەندەیێ هەر بۆ خودای خۆتان دانەوێنن و تەنیا ئەوکەسە بە پەروەردگار بزانن کە ئێــوەی لە نەبۆن دروست کـردوە و بە پڕتەوی بیر و هـۆش ئێوەی ڕازاندوەتەوە . بەرابەر بەو باوك و دایکەیش کە ئێوەیان پێگەیاندوە کردەوەی چاکە نیشان بدەن .

خوای گـەورە لەم ئایەتەدا بـاسی دۆ شتی گەورەی کـردوە . یەکەم فەرمانی بە هەمێ هوشیارێ داوە کە خوای خۆیان بناسن و بەساغێ بپەرستن و لەسەر یاســای ئایینی پاك بەندەیێ بۆ بەجێبهێنن . ئەم بەنــدە زۆر ڕۆناك و بایەخدارە لای ئەوانەی بە بیر و هۆشی ڕاست دڵیان ڕۆشن بوەتەوە ، چونکە ئەوەی کەمێـك بیر بکاتەوە ئـەزانێ کەوا ماوەیـەك لەوەوپێش نابـۆد بوە و ناوونیشـانێکی لە جیهانا نەبوە و ئەو پەروەردگارە تەوانایە بەتەوانایێ و حیکمەتی خۆی دروســتی کردوە و صۆرەت و شێوەی جوان و ســیرەتی ئینسانانەی پێداوە و لە هەمێ لایەکەوە ناز و نیعمەتی بەسـەرا ڕژاندوە و یاســای وەرگرتنی ئەو نیعمەتانەیشی بۆ دەربڕیوە . ئەشزانێ ئەم هەمێ کردەوە جوانانە لە نابۆد و ناتەوانا و نەفامەوە مومکین نابن . کەواتە ئەبێ ئەوکەسـەی کە دروستی کردێ

پەروەردگارێکی خاوەن کەماڵ بێ و پێویستە بۆ دەربڕینی سوپاسی نیعمەتی ئەو بیناسن و فەرمانەکانی بەجێبێنن . ( مع العلم ) هەر فەرمانێ خوا دایێتێ هۆی پیرۆزێ و بەختیارێ ئادەمیزادە و بێ ئەو فەرمانانە ئادەمیزاد بە ئاسایشی ڕاستەقینە ناگات .

دوهەم فەرمانی داوە بەوە کە ئینسان بەرابەر بە باوك و دایکی ، هەرشتێ کە شـایانی شانی ئەوانـە و ئەبێ بەهـۆی دلخـۆشێ و سەربـەرزێ ئەوان بەجێبێنێ . بەڕاستێ بێجگە لەوە کە باوك و دایك هۆی پەیدابونی ئینسانن ، منال بە میهرەبانێ ئەوان ئەژێ و ئەوان لـە هەمو زیانێك ئەپارێزن و تەمێ و تەربییەی ئەکەن و فێری خوێندن و پیشە و سنعاتی ئەکەن و دارایێ خۆیانی بۆ دائەنێـن و ئاسایش و ئاسودەیێ لە خۆیان حەرام ئەکەن بـۆی و هەرکاتێ ناساغێ و نەخۆشییەك بەسەریا بێت بە هەمو جۆرێ هەوڵئەدەن بۆ چارکردنی . بەشادێ و دلخۆشێ ئەو دلشادن و بە خەمگینێ و زویرێ و بێئاسایشێ ئەو پەرێشان ئەبن و بە مردنی ئۆقرەیان لێ ئەبڕێ .

جا کەی ڕەوای حەقە و ویژدان کەی قوبوڵی ئەکا منالی بەشەرەف و پیاوەتێ ئامادە نەبێ بـۆ هەر خزمەتێ بەرابەر بـەم باوك و دایکە و حـازر نەبێ هەمو پاداشێکیان بداتەوە . مەگەر ئینسانێ کە خۆی بە نەوەی ئادەمیزاد نەزانێ قایل بێ بەوە . بۆیە خوای تەعالا فەرمانی داوە بە ئینسان ئەفەرموێ بالی نەرمێ و شەرم و ئینسانیەت پانبکەرەوە لە بەردەمی باوك و دایکتا و لە بەرپێیانا و لە خودا بپارێرەوە بۆئەوەی لە گوناهیان خۆش ببێ و ، هەر فەرمانێکیان دایێ ، کافربون و گوناەکردن نەبێ ، هەموی بەجێبێنە . ئەگەریش هاتو باوك و دایکی ئینسان کافر بون ، پێویستە لەسەر منالەکەیان بە ساغێ و خزمەت گوزارێ هەلسوڕێت ، چونکـە ئادەمیزاد هەرگیـز ناتوانێ بەتەواوێ حەقـی ڕەنـج و زەحمەتی باوك و دایکی خۆی بداتەوە . بەتایبەتێ حەقی ئەو دایکە داماوە کە نۆ مانگ ئـەم ڕۆلەیەی لە سکیدا هەلگرتـوە و دو ساڵ ناوبەتێ بە سـنگیەوە و شیری داوەتێ و تا گەیشتوەتە ڕادەی پێگەیشتن لەش و بەرگ و پۆشاکی بۆ شۆردوە و نـان و چێشتی بۆ دروستکـردوە و بەدڵ و گیان ئامـادەبوە بۆ بەجێهێنانی هەمو ئارەزوێەکی . هەر بۆیەشە پێغەمبەری نازدار فەرموێەتی : « الجنَّةُ تَحتَ اَقدامِ الاُمَّهاتِ » واتـە بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە ، بەومەعنا کەسـێ بیەوێ بچێتە بەهەشت پێویستە لەژێـر پێی دایکیا بکەوێ بۆئەوەی ئـەویش پێ بنێ بەسەریا ، ئەوسا دەرگای ڕەزامەنـدێ خوای بۆ ئەکرێتەوە و شیاوی ئەوە ئەبێ بڕواتە بەهەشت . بەکورتێ پاداشی ڕەنجی باوك و دایك لەسەر ئینسان تەواو نابێ .

ئەگێڕنەوە پیـاوێ هات بۆ خزمـەتی پێغەمبەر درودی خـوای لێ بێ عەرزیکرد : ئەی پێغەمبەری خودا ! دایك و باوکم زۆر پیر و بێهێز و ناتەوان

بوون وایان لێ‌هاتوه ئەوی ئەوان کاتی منالیم لەگەڵ منیان کردوه منیش ئیستا لەگەڵ ئەوانی ئەکەم . ئایا بەم‌جۆرە خزمەتەی ئەوان من توانیومە تۆڵەی خزمەتی ئەوان بەتەواویێ بدەمــەوە ؟ پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمۆی : نەخــەیر ! تۆڵەی خزمەتی ئەوانت نەداوەتەوە ، چونکە ئەوان کە خزمەتی تۆیان ئەکرد لە خواش ئەپاڕانەوە کە عومرت درێژکا ، بەڵام تۆ داوای ئەوە لە خوا ئەکەی کەوا ئەوان بمرن و تۆ لە دەستیان ڕزگار بیێ .

ڕۆڵەی شــیرینم ، نــوری چاوی من ‌ ‌ ئەم دەرسە بەرزە وەربگــرە لــە من
کەســێ نابۆد بــێ لەســەر بســاتا ‌ ‌ نیشــانەی نــەبێ لــە کائیناتــا
جــا پــەروەردگار بــە تــاقی تەنیا ‌ ‌ پۆشــاکی ( وجــود ) بــکا بەبــەریا
بە بیر و هۆش و دەمــاخی پــەرداخ ‌ ‌ بیــکا بــە ئاڵا ، واتــە بــە بەیداخ
ڕێگەی پیرۆزێ بــۆ هەردوێ جیهــان ‌ ‌ پێ نیشان بــدا ئاشــکرا و پەنهــان
بــەرگی حورمــــەتی بکــا بەبــەرا ‌ ‌ هــەزار نیعمــەتی بکــا بەســەرا
توخــوا ئینســافە کــە نەیپەرستێ ‌ ‌ بەندەیێ نەکا ، بە هەمێ هەســتێ ؟!



کاتی نەخۆشێ یاخــود ئێشی چــاو ‌ ‌ یا هەر مەینەتێ بۆ تــۆ بێتــە نــاو
هەرکەس بۆت بێ بە هۆی ڕزگاریێ ‌ ‌ ڕزگــارت بکــا لــە دەردەداریێ
هەتــا بمێنێ لەســەر ڕۆی جیهــان ‌ ‌ خزمەتی ئەکەی بــە دڵ و بــە گیان
دەی چۆن ئەگونجێ کــە پەروەردگار ‌ ‌ بە حەق نەناسێ ئەی ڕۆڵەی هوشیار
بــاوەڕم وایــە ڕۆڵــەی بــە مــایە ‌ ‌ بــە دڵ موطیعــی فــەرمانی خوایە
چونکە بە یاسای بیر و هــۆش و فام ‌ ‌ ئیطاعەی فــەرزە مەگەر بــۆ نەفــام
بەڵکو نەفــامیش حــازرە بــە ذات ‌ ‌ لەبۆ تەســبیحی خــودای کائینات
( ســَبْحَ ِللهِ ) بخــوێنــەرەوە ‌ ‌ لــەو تەســبیحاتە ورد بــبەرەوە
ئەمجار ڕۆڵــەکەم ، بینــایێ چــاوم ‌ ‌ ڕۆنــاکێ دڵ و هێــزی هەنــاوم
کەمێ بڕوانــە بــە بیرێــکی پــاك ‌ ‌ لەکوێــوە هــاتێ بۆ دنیــای ڕۆنــاك
نازانێ چەند مانگ بە ئێش و ئــازار ‌ ‌ بــۆ دایکت بوێتۆی بــە بــاری نابار
بــە پاڕانــەوە بــە دوعــا و نــزا ‌ ‌ لێی کەوتیتە خوار بــە جەور و سزا
کاتێ داکەوتێ ئــەی ڕۆڵەی شیرین ‌ ‌ پارچە گۆشتێ بۆی بێ‌هێز و بێ‌تین
دایکی بــەڕەحمت بــە پێویستێ دڵ ‌ ‌ پەوەردەی کردی هەروەك پەڕەی گوڵ
هەڵیەپەڕاندی لەسەر ســینە و دڵ ‌ ‌ تۆ بوێتۆی بە گوڵ ، ئەویش بە بولبوڵ
شەوگار لە گەڵتــا بە تــاقی تەنیا ‌ ‌ لە خــۆی تێکئــەدا لــەزەتی دنیــا
ئەیگوێزایتەوە ئــەم‌بەر و ئــەوبــەر ‌ ‌ جاریێ بۆ هەتاو ، جاریێ بــۆ ســێبەر
بە ئاوازی خــۆش ، بــە لایــەلایــە ‌ ‌ ئەیکردیتە خــەو بــە ڕۆڵەی دایــە
لــە بــەربەیانا بــە تــاوی ســــینە ‌ ‌ بۆی گەرم ئەکردێ نــاوی مەسینە

لەشی ئەشۆردێت بە ئاوێکی پاك     ئەیکردە بەرت پۆشاکێکی چاك
هیوای وەهابۆ کە تۆ پێبگەی     تۆزێ ئاسایش بە گیانی بدەی
ئیستا کە بووی بە دارێکی بەرز     پاداشی دایکت لەسەر بوە بە فەرز
خزمەتی بکە بە میهرەبانی     بە هەر شێوەیێ باشی ئەزانی
نمی عارەقی ماندوو بوونی ئەو     لەبەر شەونوخنی وڕەنجی ڕۆژ وشەو
نرخی ئەکاتە هەزار دڵۆپ خوێن     لە لەشی ڕۆڵەی بە شەرەف و شوێن
جا با تۆیش بەرو سێبەرت هەبێ     هۆش و مەشرەبی سەروەرت هەبێ
ئەگینا مەڵێ خاوەن نەژادم     یا لە ڕەسەنی ئادەمیزادم



فەرمۆدەی ڕەهبەر بەرز و بالایە     بەهەشت لەژێر پێی دایکی خۆتایە
دایەنیش بوونی دایکتی پێیە     تا قەدری بگری کاری بەجێیە
ئەمجار بۆلای باب سەر بەرەوە     قاپێ ئیحسانی لێ بکەرەوە
ئەگەر گەدا بێ یاخود دەوڵەمەند     خزمەتی کردی بابەی ئەرجومەند
بێجگە لە ڕەنجی تەمێ و تەسکینت     تەعلیمی عیلم و پیشەی ڕەنگینت
ئەبرژا بۆ تۆ بە وێنەی کەباب     دڵی وێنە بۆ بۆ تەختەی قەساب
لەگەڵ ئەم هەموو دەرد و مەینەتە     هێشتا هەر ئانێ دەم بە منەتە
بە بێشەرمانە ڕووت هەڵئەماڵێ     بە ڕۆیانا دێیت بە ترش و تاڵێ
دایکت بۆ ئەملا ، باوکت بۆ ئەولا     دەربەدەر ئەکەی بێ ترسی خودا
ڕۆڵە پێتئەڵێم دەرسێ باشە بۆت     خودا بناسە و باوك و دایکی خۆت
هەرکام لەمانە خزمەتی نەکەی     سەرپەنجەی حەسرەت بە دەما ئەبەی
ئەوسا لەبۆ دین یا لەبۆ دنیا     قازانجێکت کرد بۆ خۆت بێ تەنیا



قەت نەکەی بڵێی دایکم بەدخوە     بۆڵەبۆڵ کەر و بە دەم و ڕوە
ژن و منداڵ و ئاشنا و میوان     لە داخی دایکم دایانە کێوان
بە تیری تانە دڵ کون کون ئەکا     بە دەرزێ کاری چەند سۆزن ئەکا
گوێ بگرە ، برا ، کێ بێ لەم دنیا     کە حەڵوای گەزۆ نەچێ بەدەمیا
مەرد ئەو مەردەیە کاڵێ بکوژێ     بۆ شیفای ئازار تاڵێ بچەژێ
کاڵە ئەوکەسەی تاڵێ نەچێژێ     لەبۆ پیاوەتێ ئارەق نەڕێژێ
لەمەوەیە دایك سروشتی وایە     ژین و مردنی لەگەڵ تۆدایە
تۆش لەبەر خودا و تۆڵەی ڕەنجی ئەو     هەندێ هەڵبگرە لە مەینەتی ئەو
ئەمەیە پەندی مامۆستای دڵدار     گوڵچینێ ئەکا ئینسانی هوشیار
هوشیاری تەواو بەندەی خودایە     کە خزمەت ئەکا بە بابە و دایە
( نامێ ) بەمشێوە ئەگا بە مەرام     ئەچێتە بەهەشت ( باقێ والسلام )

# گوڵی دەهەم ـ گوڵی نیـازپاکێ

بەهـار بە بـاران گوڵ قەتـار ئەکـا
گوڵ بە بۆنی خـۆش دڵ بێـدار ئەکا
دڵی بێداریـش بە حـەق ڕۆنـاکە
ڕۆی لە نیـازی پاك ، کرداری چاکە

اِنّما الاَعمالُ بالنّیّات ، واِنّما لِکُلِّ امرئٍ مانَوی .

پێغەمبەری خۆشەویست درۆدی خوای لێ بێ ئەم فەرمودەیەی فەرموە کە مەعنایەکی زۆر بەنرخ و باڵای هەیە و واتە کردەوەی ئینسانی هوشیاری موسوڵمان کاتێ ساغ و دروستە و لای بارەگای خوا قیمەتی هەیە و پاداشی لەسەر ئەدرێتـەوە کە قەسد و خواسـتی دڵی لەگەڵدا ببـێ و ، کێشانەی پاداشەکەشی ئەوەندەی پتەوێ و ڕەسایێ و سافێ قەسد و خواستی کابراکەیە کە کردەوەکەی کردوە .

لەم فەرمودەیەوە چەند شت دەرئەکەوێ . یەکەم ئەوە هەر کردەوەیەك بە ڕێکەوت و هەڵکەوت لە ئادەمیزاد زۆربدا بەتاڵ و بێسودە و وەکو ئەوە وایە کابرا هیچی نەکردبێ . دۆهەم ئەوە کردەوەی موسوڵمان لە سەنگ و کێشانەدا بەپێی سـەنگ و کێشانەی نیـازی خاوەن کـردەوەکە ئەگۆڕێ . وائـەبێ دۆ موسوڵمان بەیـەکەوە نوێژێ ئەکەن ، کەچێ فەرق و جیاوازییـەکی زۆر لەو خێرەدا ئەبێ کە بۆ هەرکامیان ئەنوسرێ . ئەوەیش لەبەرئەوەیە یەکێ لەو دوانە قەسد و مەبەستەکەی زۆر بەهێزتر و پتـەوتر بوە لەوی‌تریان . لەسەر ئەم بناغەیەیە زانایانی دین بڕیاریان‌داوە کەوا هـەر واجبێ لە واجباتی دین وەکو نوێژ و ڕۆژۆ مەسەلا کە بە بێ‌قەسد و نیبەت بکرێ بەتاڵە و دروست نیە و وەکو ئەوە وایە کە نەکرابێ و پێویستە لەسەر ئەوەی ئەو واجبەی جێ‌بەجێ کردوە دۆبارە بیکاتەوە لەگـەڵ قەسددا تا بە فەرزاریێ نەمرێ . هـەروا لەسەر ئەم بناغەیەیە زانایانی دین بڕیاریان‌داوە کەوا ئەگەر کەسێ بە بێ قەسد و مەبەست کەسێ بکوژێ ، ئەوە ئەو کوشتنە بە کوشتنی هەڵە دائەنرێ و کابرای پیاوکوژ ناکوژرێتەوە و ئەبێ هەر خوێنی کوژراوەکەی لێ بسێنرێ .

هەر بە مەعنای فەرمودەی پێشوە پێغەمبەری نازدار فەرمویەتی « اِنَّ اللهَ یُعْطِی العَبْدَ عَلی قَدرِ نِیَّتِهِ » واتە : بەڕاستێ خوای گەورە پاداشی بەندەی خۆی بەگوێرەی ئەندازەی نیازی ئەو بەندەیە ئەداتەوە لە کردەوەکەیدا . هەروەها فەرمویەتی : « مَنْ اَخْلَصَ لله اَرْبَعینَ یَوماً تَفَجَّرَتْ یَنابیعُ الحِکْمَةِ مِنْ قَلْبِهِ عَلی لِسانِهِ » . واتە : هەر موسوڵمانێ تا ماوەی چل ڕۆژ بە دڵسۆزیێ و ساغێ و بە نیاز و مەبەستی چاك فەرمانبەرداریێ خوای

خۆی بکا ، خوای تەعالا لە پاداشی ئەوەدا دڵی ڕۆناك ئەکاتەوە و ئەیکا بە کانێ و سەرچاوەی عەقڵ و عیلم و هۆش و ئەو بیرە بەرزانەی وەك کانیاو لە دڵیەوە هەڵئەقوڵێن و لە زمانیەوە ئەڕژێنە خوار .

بەکورتێ وەك چـۆن ئادەمیزاد بە ڕۆح و گیان ئەژێ ، واتـە ڕۆح هۆی ژیانە بۆ ئینسان ، هەروەها کردەوەکانیشی بە نیاز و قەسد و مەبەستی پاك و ڕۆناك تەواو ئەبێ و سوودیان بەگوێرەی نیازە لێیان و ئەگەر نیازیان لێنەبێ وەك لەشی مردوو بێ‌گیان و بێ‌کەڵك ئەبێ .

( بزانن ) نییەت ، واتە نیاز و قەسد و مەبەست‌کردن ، ئەوەندە بەنرخە حسێبی هەرگیز تەواو نابێ . بۆیە پێغەمبەر فەرموویەتی : « نِيَّةُ المَرْءِ خَيْرٌ مِنْ عَمَلِهِ » . واتە : نیاز و قەسد و مەبەستی بنیادەم لە کردەوەکەی باشتر و بەسوودترە . بەم‌مەعنا کە کرداری بێ‌قەسد و مەبەست هیچ سوودی لێ پەیدا نابێ ، بەڵام قەسد و مەبەستی باش با ئەوکەسە بۆیشی هەڵنەکەوێ کردەوە باشەکە بکا ، هەر سوودی هەیە و پاداشی لەسەر ئەدرێتەوە . لە لایەکی‌کەشەوە قەسد و نییەت شتێکی پەنامەکین ، ڕیا و خۆنواندنیان تیا نیە . بەڵام کردەوە وائەبێ تێکەڵی ڕیا و بەرچاوێ ئەبێ و پاداش و سوودی بۆ پاشەڕۆژ تیا نامێنێ .

بینا لەسەر ئـەم فەرمودەی دواییەی پێغەمبەر درودی خـوای لێ بێ پێویستە ئادەمیزاد ئاگادار بێ نییەتی دڵی خۆی باش بکا ، لەبەرئەوە کە مادەم دڵی موسوڵمان بە نییەتی باش و قەسد و مەبەستی جوان ڕۆناك بوەتەوە ، ئەوە ئەو خاوەن دڵە کردەوەی باشی لێ دەرئەکەوێ ، یەعنی دڵی ئینسان لە وجودیا وەك پادشای سەر تەخت وایە و ئەندامەکانی‌تری لەش وەك خزمەتکار وان لە بەردەستیا . جا کە پادشا هوشیار و بەختیار بوو ، بەپێی ئەو هۆش و عەقڵی خۆیە فەرمان بە دەستە و بەستەکەی ئەدا و وڵاتەکەی هەمیشە خاوەن فەڕ و ئاوەدان ئەبێ و ، ئەگەر بێ هۆش و بێ‌ئاگا بێ لە کاروبار ، فەرمانی ناپەسەند دەرئەکا بۆ دەستە و بەستەکەی و وڵاتەکەی زووبەزوو وێران و کاول ئەبێ .

هەروەها کاتێ دڵ لە نووری ڕاستێ پڕتەوی وەرگرت ، فەرمانی بەندەیێ و خزمەتکاری ئـەدا بە ئەندامەکانی و ئەوانیش بۆ خزمەت‌کـردنی ڕەوا ئەکەونە ئیشەوە . بەڵام ئەگەر تاریك بوو ، فەرمانی بێ‌سەروبەر ئەدا بە ئەندامانی لەش و زۆر زوو تووشـی فەلاکەتی دنیا و تۆڵە لێ‌سەندنەوەی پاشەڕۆژ ئـەبێ ، وەك پێغەمبەری نـازدار درودی خوای لێ بێ فەرمـویەتی : « ألا إنَّ في الجَسَدِ مُضْغَةً إذا صَلُحَتْ صَلُحَ الجَسَدُ كُلُّهُ ، وَإذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ ، ألا وَهِيَ القَلْبُ » . واتە : ئاگاداربن لەشی ئادەمیزاد پارچە گۆشتێکی‌تیایە ، هەرکاتێ ئەو پارچە گۆشتە بە پڕتەوی میهرەبانێ خوا کەوتە سەر باری ڕاستێ ، ئـەوە هەموو ئەندامەکانی‌تری لەش ئەکـەونە سەر باری

ڕاستێ ، ئەگەر خراپیش بۆ و ڕێگای چەوتی گرتەبەر ، هەمۆ ئەندامەکانی‌تری لەشیش خراپ‌ئەبن و ئەکەونە خراپە کردن . ئەو پارچە گۆشتەش دڵە .

کەواتە پێویستە لەسەر ئادەمیزاد بەر لە هەمۆ شتێ ئاوێنەی دڵی لە تۆز و گەردی نیـازی خراپ پاك بکاتەوە بۆئەوەی نیاز و مەبەسـتی خاوێن و باشی تیا جێگیر ببێ ، ئەوسا دەست بکا بە کار . چونکە هەروەك بێ زانست کردەوە باش و پەسەند نابێ ، بێ دڵێکی پاك و بێ دڵسۆزێ لە فەرمان‌بەرداریێ خوادا و بێ بەندەییەکی ڕاستی خوایش ، بەندە ناگاتە بارەگای خوای تەعالا .

هۆی دڵپـاکێ چەند شـتێکە . یەکەم : بیرکـردنەوەیەکی مـەردانە . بیرکردنەوە لـەوە کەوا بەنێ ئادەم کێن و ئادەمیزاد بۆچێ دروست کراوە و ماوەی مانەوەی لـە جیهاندا چەندە و ئەنجامی چیە و چۆن ئـەبێ فەرق نەبێ لەبەینی ئینسان و گیان‌لەبەرانی بێ‌عیلـم و زانستدا . کە هەردۆلایان لەپاش مردن وەکو یەك بن ، چ شەرەف و پایە بەرزییەك بۆ ئادەمیزاد ئەمێنێتەوە ، تا بیرکەرەوەکە بـکا بەو ئەنجامە کەوا ئادەمیـزاد گیان‌لەبـەرێکی هوشـیارە و پەروەردگارێ دروسـتی کردوە و پـاش ماوەیەك گیانی دەرئـەچێ و ئەڕوا بۆ عالەمێکی‌تر و پاشـان ڕۆژی لێ‌پرسـینەوە و پاداش و تۆلە دانـەوەی دێتە پێشەوە و بەگـوێرەی پایـەی کردەوەکەی تۆڵـە و پاداشی کـرداری خۆی وەرئەگرێ . جا کە گەیشتە ئەوە کە تێ‌بگا مادەم بەندەیێ هەر بۆ خوا ئەکرێ و پـاداش و تۆڵە هەر لای خوایە ، ئەزانێ پێویستە هەر چاکەیەك بکا و لە هـەر تاوان و گونـاهێ لابدا ، هـەر لەبەر خودا خـۆی بێ و هیچ هۆیـەکی‌تر لەو مەیدانەدا کاری تێ‌نەکا .

دۆهەم : هاوڕێیەتێ و هاودەمێ پیاوە زانا و دڵ ڕۆناك و کردەوە چاکەکانە کە پوختەی ئادەمیزادی هەر چەرخ و سەردەمێکن . ئـەوەی کە ئـادەمیزاد لە مەجلیس و کۆڕی ئەم جۆرە کەسانەوە دەسگیری ئەبێ ، لە لایەکی‌کەوە دەسگیری نـابێ . سێهەم : تەماشاکردنی ڕۆداوەکانی جیهانە کە ئینسان لێیانەوە تێ‌ئەگا هەر ئیشێ پاك و خاوێـن و بۆ خودا نەبێ بێ‌ئایە و مایەیە . چوارەم : عیبرەت وەرگرتنە لەوەی بەسەر ئینسـانی ناساغ و ناباردا هـاتوە و دێ و کردنی ئـەو کارەساتانەیە بە سەرمەشق . ئینسان لەمەوە حاڵێ ئەبێ کەوا هەر کردەوەیەك ئەنجامی ناباری هەبێ ، خۆی لێ دۆر بخاتەوە .

بەم‌چەشنە دەرئەکەوێ کەوا بەو جۆرە بیرکردنەوەیەی باسمان لێ‌کرد و بە هاوڕێیەتێ پیاوچاکان و بە تەماشاکردنی ڕۆداوەکـانی زەمـانە و بە عیبـرەت وەرگرتن لە ئەنجامی کرداری خەڵکی‌تر ، ئینسـان ئەکەوێتە سەر باری ئیخلاص و نییەتی پاك و سۆد لە ژیانی خۆی وەرئەگرێ .

**ڕۆڵـەم ! کردەوە بە مەبەسـتی پاك   پایەت بەرز ئەکـا لای خودای بێ‌باك**

بێنیازی پـاك واتە بـێ ئیخـلاص — مەحاڵە بۆ تۆ ڕزگـاری و خـەلاص
کردەوە وێنـەی شـیرێکی خـاوە — شیری بێهەوێـن قەت نەگیرساوە
صەد ساڵ تێکۆشێ بە کرداری خۆت — ئیخلاصت نەبێ سـوودی نابێ بـۆت
کردەوە و نییەت وان لە یەك پـایە — بەسوود بەسـوودە و زایەیـە زایـە
نییەتت چـاك بێ کـردەوە چـاکە — بە کردەوەی چاك ڕێگـات ڕۆنـاکە
دەم و دڵ ئەگەر بـۆ حەق هاودەمن — جێگەی پڕتەوی ئیـسـمی ئەعظەمـن
بـە دڵـی خـاڵێ وتنـی ( الله ) — کردەی کەسێکە بـۆش و بـەرەڵلا

★ ★ ★

ڕۆڵەم سا وەرە بۆ سەر ڕێگەی ڕاس — ڕێگەی خـاوێنی دڵپاکی و ئیخلاص
دەسم دامێنت ڕۆڵـەی ئەرجومەند — گوێم لێ ڕابگرە خۆت مەکە بە پەند
خزمەت بە مـاڵێ یا نـان و ئـاوێ — لە دەستت دەرچـێ دات بە دامـاوێ
با هەر بـۆ ڕەزای خـودای عالەم بێ — نەك بـۆ بەرچـاوێ بەنیـادەم بـێ
ئینسـان قەت ناشێ بۆ جەزای ئینسان — ئەگەر تێبگەی لە مەعنـای ئیحسان
ئەویش موحتاجە بـۆ خۆی لە خۆیـا — ئیتر چـۆن بـۆ تۆ ئەگـا بـە فریـا
چەندکەس نەزانیان کردوە بە زانـا — بێدەسەڵاتیـان کرد بـە تەوانـا
کـاتێ شـانەیان هێنـا بە ڕیشـا — یـا دەستیـان داچێ بە هەندێ ئیشا
لەبـاتێ جەزای ئەو پیـاوە مـەردە — بۆی بـوون بە مەینەت بە بگرە و بەردە
چاویـان نەترسـا لە عەیب و لە عار — لەجیاتێ وەفـا لێیبوون بـە ڕەشمـار
بـەڵام خوداوەنـد مثقـاڵە ذەڕڕە — لەلای ون نـابێ خێـرە یـا شەڕە
هـەر بـەو پێـوانە وا بـە لاتـەوە — خودا بە چەنـد قـات پێت ئەداتەوە

★ ★ ★

ئەپرسێ کە چـۆن دڵ پەرداخ ئەبێ — قەسد و مەبەستی ساف و ساخ ئەبێ
پێتئەڵێم ڕۆڵـەم بۆ خـاتری تـۆ — نیشانتئەدەم چەند ڕێگا و چەند هۆ
یەکەم وەك کەسێ خاوەن بیـر و ژیر — دڵت ئـاو بدە لە سەرچـاوەی بیـر
تـا دڵ تێبگـا کـە ژیـانی ئـەو — بـۆ پیرۆزییـە لـە جیهـانی ئـەو
مایەی پیرۆزییـش بـۆ ئـادەمیزاد — هەر پەیڕەوییە لە ( خیر العبـاد )
بیر و کردەوە و ڕەوشـتت بە عـام — پەیڕەوێ ئـەو بێ ئەگـەی بە مەرام

★ ★ ★

دۆهەم هاوڕێیی مەردانـی دڵپـاك — سینە ئـاوێنەی بێگەردی ڕۆنـاك
وێنەی زەڕەبـین نـوورت بۆ دێنـن — خەوشوخـاڵی دڵ گشت ئەسووتێنن
جا تۆوی سـاغێ پیـا ئەوەشـێنن — گوڵی یـەك دڵـێ تێـدا ئەڕوێنـن
ڕەوشـتـی پـاکان سەرمەشقێ بەرزە — لێـوە فێربـوونی کـارێکی فـەرزە

هەرکەس کەوتەدوّی نوّری کێوی توّر    ڕێگــا ون نــاکا لــە نزیــك و دوّر

★ ★ ★

سێهەم تەماشــــای کارەســـــاتەکان    لەوانەی زانـــــا ئەخەنــــە تەکـــــان
هەموّ عیبرەتن بوّ مەردی هوشیــــار    عیلم و حیکمەتــن لەبــوّ بەختیــــار
ئێمە وامانـدیّ هەرکەس نــاساغ بو    بە پشکوّی مەینەت هەنــاوی داغ بو
لەمە وەرئەگــرن ســـاغیّ لە ژینــا    لە بیر و کردەی دنیـــاییّ و دینــــا
چونکە وامانـدیّ ناســـاغ نەخوّش بوّ    بوّ قازانجی خوّی بیّ بــیر و هوّش بوّ

★ ★ ★

چوارەم بڕوانە گــەردوّن ئەســوڕیّ    مانگی بە سیّ چەرخ دنیــا ئەگــوّڕیّ
چەرخ ملیوّنیش بیّ نەك هەر هەزاران    چەرخیّ دیّ بتبــا بەرەو گوّڕستــان
کە ماوەی ژینت هەر ئینتیهای بــیّ    ژینت بــا وابیّ نرخ و بەهــای بــیّ
بەهــایش بەوەیە ئیشــت بەسوّد بیّ    خالیص بوّ ڕەزای خودای مەعبوّد بیّ
هەر ئــەو تەواناى توّلــە و پاداشە    پەروەردگــاری خــراپ و بـــاشە

★ ★ ★

کە توّ هەوڵتدا بــەم ئەسبـابــانە    مەعلوّمە خودایــش زوّر میهرەبــانە
بەسەر سینەتــا ئەڕژێنــیّ ئەنــوار    دڵــی تــوّ ئەکــا بە کــانی ئــەسرار
وا دڵــت ئەگــریّ بەرقــی کــارەبا    خەیــاڵی غەیــرت لــە دڵ لائەبـــا
ئەتشوّرێتەوە لــە گــەردی زەحمەت    خالیصت ئەکــا بوّ صەفا و ڕەحمەت
ئەمەیــە دەرســی ماموّستای (بەهار)    ئیخلاصە مــایەی ژینی بەختیـــار
ئیخلاصە ئەبــیّ بە توّشــەی (نامیّ)    بــوّ ڕێــی درێژی گەیــین بە کــامی

## گوڵی یازدەهەم ـ گوڵی ساغیّ و ڕاستیّ

بەهـــار بە بــاران گوڵــیّ ئەڕوێنــیّ
عەترێکی خــالیص بــوّ دڵ بنوێنــیّ
هەتــا تیّبگــا ڕاستـــە و صەحیحە
مەعنای ( الدِّینُ هــوَ النَّصیحَةُ )

قالَ صلّیَاللهُ علَیْهِ وسَلَّمَ : الدینُ النَّصیحَةُ ، قلْنا لمَنْ ؟ قالَ للهِ ولِکِتابِهِ ولِرَسولِهِ ولائمّةِ المسْلمینَ وعامّتِهِم .

تەمیمی کوڕی ئەوسی داریّ خوای لیّ ڕازیّ بیّ ئەڵیّ حەزرەتی پێغەمبەر

درۆدی خوای لێ بێ فەرمۆی : دیـن وەرگرتن و ئایین قوبۆڵکردن بریتییـە لە ساغێ و بێغەشێ و خزمەتـی سـاغ کـردن . عەرزمـانکرد : ئـەم ساغێ و خزمەتە بێغەشە بەرابەر بە کێ ؟ فەرمۆی : بەرابەر بە خوا و قورئان و پێغەمبەر و پێشەوایانی موسوڵمانان و تێکڕای موسوڵمانان .

وا کەمێك بەدرێژێ ئەم حەدیثە لێكئەدەینەوە .

ساغێ موسوڵمان بەرابەر بە پەروەردگاری عالەم بەومەعنایەیە ئینسانی موسوڵمان ئیمان و باوەڕی ببێ بە خوای تاق و تەنیا و دان بەوەدا بنێ کە خـوا تاقە ذاتێکە بێشەریك و بێوێنە و مانەند . هەرچێ صیفەتێ پاك و بێگەرد هەیە هەیەتێ و دوورە لە هەمۆ صیفەتێکی نوقسـان و نالایق . هەروەها بەومەعنایەیـە کە بەئەندازەی هێز و توانا فەرمـانی بەجێبهێنـێ و لە نافەرمـانێ کردنی دوور بکەوێتەوە و ، هەرکەسێ ئەو بپەرستێ خۆشی بوێ و هەرکەس نەیپەرستـێ خۆشی نەوێ و ، دان بە نیعمەتەکانیا بنێ و لەبەر باری ئازاریا خۆی ڕابگرێ و ئارام بێ و هەمیشە لەسەر ئەم شێوەیە بەردەوام بێ و ئەوەنـدەی لە توانـای دەست ڕۆیشتنیا بێ تێبکۆشێ بۆ بڵاوکردنەوەی خواپەرستێ .

ساغێ موسوڵمان بەرابەر بە قورئـانیش ئەوەیە بـاوەڕی وابێ کە خوا ناردۆیە بۆسەر حەزرەتێ پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ و کەلامی خوا خۆیەتی و پەیوەندی کەسی پێوە نیە و ، ڕەفتاری پێ بکـا و تێبکۆشـێ بۆئەوە کە بەنـاو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە و حوکمەکانی جێبەجێ بکرێن و بۆ خۆیشی بیخوێنێتەوە و لە مەعنای بگا و بەگوێرەی بجوڵێتەوە و بیکا بە چرای ڕۆناککەرەوەی ڕێگـای ژیـانی .

ساغێ موسوڵمان بەرابەر بە پێغەمبـەریش درۆدی خوای لێ بێ ئەوەیە باوەڕی وابێ کەوا خوای تەعالا ڕەوانەی کردوە بۆ تەمێ و تەربییەکردنی هەمـۆ ئادەمیزاد و کەوا پێغەمبەری ئاخر زەمانە و پاش ئەو پێغەمبەریتر نـایەت و ، تا توانای هەیە لە فەرمانی ئەو دەرنەچێ و هەوڵبدا بۆ ڕەواج پێدانی ئایین و دینی ئەو و ، هێز بدا بەو میللەتەی لەسەر دین و ئایینی ئـەون و ، بە چـاوی حورمەتەوە تەماشای یاران و ئال و بەیتی فیداکاری بکا و هەمۆیـانی خـۆش بوێ و، دان بەوەدا بنێ کەوا ئەوانە ئەوەندە خاوەن قەدر و پایەن شیاو و شایانی صوحبەت و هاوڕێیەتێ ئەون و ، بەپێی توانا درۆد و سەلامی بۆ ڕەوانە بکـا و زیارەتی بکا لەکاتی ژیان و لەپاش وەفاتی و ، هەرکەسێ ئەوی خۆشبوێ خۆشی بوێ و هەرکەسێ ئەوی خۆشنەوێ ئەمیش ئەوی خۆشنـەوێ و ، تێبکۆشـێ بۆ بڵاوکردنەوەی دین و ئایینەکەی و ، خۆ بگـرێ بە بیر و کردەوە و ڕەوشتی ئەوەوە و تا لە دنیا دەرئەچێ لەسەر ئەم شێوەیە دەوام بکا .

ساغێ موسوڵمان بەرابەر بە فەرمانڕەوایانی موسوڵمانـانیش ئەوەیـە

یارمەتییان بدا لەسەر ڕاستی و فەرمان بەرداریـیـان بکـا مـادەم بەگوێرەی فەرمودەی خوا و پێغەمبـەری خوا بجوڵێنـەوە و ، هەوڵبدا خـەڵکیتریش فەرمانبەرداریان بکەن . هەرکاتێکیش ویستیان لە یاسـای حەق و ڕاسـتی دەرچن و لە سنوری فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا دەرچن ، بە هەر جۆرێ کە بگونجێ و موناسب بێ و پێیبکرێ بێداریان بکاتەوە و تەمێ و ئامۆژگاریان بکا و ، لە هەر کارێکیشا کە زەحمەت بێ بە هەر جـۆرێ بۆی کرا یارمەتییـان بدا و تێبکۆشێ بۆئەوەی فەرمان بەرداریان زۆر بێ و ، لە ڕۆی دوژمنیشدا بەرگریان لێ بکـا .

سـاغێ موسوڵمان بەرابەر بە هەمۆ موسوڵمانانیش بەشێوەیەکی گشتێ بەوە ئەبێ کە نەزانیان فێری زانیارێ بکا و گومڕایـان بێنێتـەوە سـەر ڕێگای ڕاست و کۆمەکی داماو و لێقەوماویان بکا و ، لە هەر ئیشێکی حەق و ڕاستدا یارمەتییان بدا و مـەیدانی ئەوە نەدا کەس دەسدرێژیـان بکـاتە سـەر و ، فەرمانبدا کە کاری پەسەند بکەن و ڕێی ئیشی خراپیان لێ بگرێ و مەیدان نەدا ئاشوب لەناویانا پەیدا ببێ و ، ئەگـەر ئاشـوبێ کەوتە ناویـان هەوڵبـدا بۆ چارکردنی و ، تێبکۆشێ بۆ چـارکردنی نەخـۆش و بریندارییـان و ، لەکـاتی نەخۆشێ و ناساغیدا هات و چۆیان بکا و، حازری سەر جەنازەی مردۆیان ببێ و دوعای خێر بۆ مردۆیان بکا و ، لە هەمۆ هەرا و شۆڕش و ناسازییەکی جیهانیدا بچێ بەدەمیانەوە و حورمەتی پیر و گەورە و زانا و خـاوەن ڕۆحیـان بگرێ و ، لەگەڵ منداڵ و غەریب و ناشارەزایان میهرەبانێ بنوێنێ و لە عەیب و عاریـان چاوپۆشێ بکا و ، هەرچێ هۆی ئازاریان بێ نەیکا و تێبکۆشـێ بۆئـەوە کە لـە مەیدانی ژیانی دنیا و لە مەیدانی پیشەسازێ و زانستدا پێش بکەون. بەکورتێ هەرچێ بۆ خۆی و بۆ خۆشەویستـانی خۆی ڕەوا ببینـێ بۆ ئەوانیشـی ڕەوا ببینێ و، هەرچێ بۆ خۆی و دۆستانی خۆیی ڕەوا نەبینـێ بۆ ئەوانیشـی ڕەوا نەبینێ و بەرابەر بە گەورە و بچوکیان یەك ڕۆ و یەك زمان و یەك دڵ بێ .

ئەم فەرمۆدەیە فەرمۆدەیـەکی گەلێ بەرز و بـەنرخ و بەمـایەیە و ئەگەر دە لـە صـەدی موسوڵمـانـان بەڕاسـتـی بەگـوێرەی ئـەم فەرمۆدەیـە بجوڵانایەتەوە ، ئیستا موسوڵمـانان لە ژیانێکیترا بـۆن و لە هیچ مەیـدانێکدا پاشنەکەوتن و لە ڕیزی میللەتە پێشکەوتوەکانی جیهاندا ئەبـۆن . ئێمە کـە تەماشای مێژۆی موسوڵمانانی زەمانی پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ ئەکەیـن بەئاشـکرا بۆمـان دەرئەکـەوێ کـەوا ئەوان بەتـەواوێ ئەم فەرمۆدەیەیـان بەجێهێناوە . ئەگێڕنەوە لە جەنگێکا هەژدە کەس لە یارانی پێغەمبەر بریـنـدار بۆن ، لەکاتێکا کە زۆر تینو بۆنیەکێکیان هاواری کرد بۆ داوای ئاو . ئاویـان بۆ هێنا ، بەڵام نەیخواردەوە ، بە ئاوگێڕەکەی وت بیبا بۆ هـاوڕێیەکی برینداری ، کە بۆی برد ئەویش نەیخواردەوە حەواڵەی کرد بۆ هاوڕێیـەکیتری .. هەروا

بەوجۆرە هەرکام لەو ئەصحابە برینداارانە ئاوەکەی نەئەخواردەوە و حەوالـەی ئەکرد بۆ یەکێکیتر ، تا لەئەنجاما هەمۆیان وەفاتیان کرد و کەسیان لە ئاوەکەیان نەخواردەوە .

ڕۆڵەی عەزیزم ! ئـایینی ئیسـلام    لەسەر سـاغییە ئەووەڵ تـا ئەنجام
لەگەڵ خـوا و لەگەڵ کتێبـەکانی    هـەروەها لەگـەڵ پێغەمبـەرانی
لەگەڵ فەرمانەی ئوممەتـی ئیسلام    لەگەڵ ئوممەتی ئیسلامیش بە عـام

★ ★ ★

سـاغێ بۆ خودا ئیمـانە و بـاوەڕ    بـە پەروەردگـار ( اللهُ اکبَـر )
بە دڵ و بە لـەش یـارمەتێ بـدەی    تـا دینـی خـودا بە ڕایـە نـەدەی
جیهـادی ئەعـلا وتـاری حەقـە    لای ستەمکـارێ کـە دڵـی ڕەقـە
بۆی بە پشتیوان بـۆ ئیشی خـودا    خودایـش یـارمەتێ ئیشـی تۆ ئەدا

★ ★ ★

سـاغێ بەرابـەر بە کتێبـی دیـن    نەشری قورئـانە لەسەر ڕۆی زەمین
بە لەفظ و مەعنا و تەجدید و تەرتیل    بە شەرح و بەیـان تەفسیر و تەئویل
لەسەر ئەو یاسـا ڕەهبەر و یـاران    گەیـانـدۆیانە بـۆ لای هوشـیاران

★ ★ ★

سـاغێ بەرابەر بە ڕەهبـەری دیـن    سـەلامی لێ بێ تـا ڕۆژی یەقـین
خۆشـەویستییە بـۆ ذاتـی پـاکی    بـۆ ئـال و یـار و پەیڕەوی چـاکی
یـارمەتیدانە بـۆ ئـایینی ئـەو    بە دەم بە قەڵەم بە ڕۆژ و بـە شـەو
تێگەیـانـدنی گەلـی ژیرانـە    لە ئـایینی حـەق لەم ڕۆی جیهانـە
کـە ئەو ئـاینە وێنـەی ئـاوێنە    جیهـان نومایـە و ڕاسـتێ نوێنـە
یەکێ وێنەی خۆی تیـا نەکـاتە چاو    خەتای خۆیەتی نەك جـامی پڕ تـاو

★ ★ ★

سـاغێ بەرابـەر بە فەرمـانڕەوا    ئەوەیە ئینسـان یـارمەتیان بـدا
بەپێی ئەمری خوا کاربکەن بۆ خەڵك    بەجۆرێ کەوا سوودی تیا بێ و کەڵك
فەرمودەی خودا و ئەمری پێغەمبەر    بکەن بە ڕێبـاز قـەت لێی نەچنەدەر
کە کەوتنە هەڵە ڕێیـان پێشـاندا    نەك بە وڵات و میللـەت زیـان دا
ئەوەك بکەونە نـاو بـیری ئەهـات    بێ بەهۆی مەینەت بۆ گـەل و وڵات
هەڵەی سـەرداران هەڵـەی عالەمە    مـایەی مەینەتـی بەنیئـادەمە
کاتێ کە سـەرۆك بـێ ڕا و تەگبیرە    هەرکەس فریـاکەوت ئەوکەسە ژیرە

★ ★ ★

ساغی بەرابەر بە موسوڵمانان — ئەوەیە ئینسان بە نوری ئیمان
چی لە لا باشە بۆ سوودی هەموو — بەیانی بکا بۆیان زۆربەزۆ
وڵات و زمان سپی و ڕەش و بۆر — بێ‌فەرق و جیایی لە کەم و لە زۆر
بۆ دین بۆ ژیان بۆ چاری هەرا — تێکۆشی تا گشت ببن بە برا
یەك دڵ یەك زمان پێکەوە بژین — بۆ بەرزی دنیا و خزمەتی ئایین
هەموویان بژین یەك لە یەك ڕازی — بە کامەرانی و بە سەرفەرازی
دەرسم وەربگرە بە خۆش دەماغی — دین نەصیحەتە و نەصیحەت ساغی
ساغی‌یە هێزە بۆ نەژنۆی ( نامی ) — هەڵئەگری باری ڕەنجی ئەییامی

## گوڵی دوازدەهەم ـ گوڵی میانەڕەوی و چاکەکردن

باران ئەباری و زەوی ئەبزوی
گوڵ و دڕکی تیژ لە عەردا ئەڕوی
تۆ گوڵ وەربگرە جوان و بەڕێزە
لە دڕکی ئازار خۆت بپارێزە

**انَّ اللهَ يَامُرُ بِالعَدْلِ والاحْسانِ وايتاءِ ذِي القُرْبى وينْهى عَنِ الفَحْشاءِ والمُنكرِ والبَغْيِ يَعِظُكُمْ لعلّكُمْ تذكّرونَ .**

پەروەردگاری عالەم لەم ئایەتە بەرز و بەنرخەدا فەرمان‌ئەدا بە سێ شت و نارەزایی دەرئەبڕێ لە سێ شت کە دیاری‌ترین شتن لەوانەی پەیوەندیان هەیە بە دامەزران و وێران بوونی جیهانەوە و بە دامەزران و دانەمەزرانی ئایینی ئینسانەوە .

ئەو شتانەی فەرمانی‌داوە بە کردنیان ئەمانەن :

یەکەم ( عدل ) واتە هاوسەنگی و میانەڕەوی لە هەموو کارێکدا ، خوای کاری دەروونی بێ وەك بیروباوەڕ و خۆشەویستی یا دەرەکی بێ لەوانەی عیبادەت و ئایین‌پەرستین یا لەوانەی مایەی ژیانن ، یا شتێکی‌تر بێ . بۆ وێنە ئەبێ عەقیدە و بیروباوەڕی ئادەمیزاد بەئەندازەیەك ڕێك‌وپێك و دامەزراو و قایم بێ هەرگیز بە باری زیادەدا یا بە باری کەم و کورتیدا وای پێ نەیێ پێچەوانەی دین و ئایین و هۆشی هوشیار بێ . هەندێ‌کەس کە خۆیان بە بەراورد تەماشایان کردوە و لە ئەوزاعی جیهان خەبەردارن وتویانە هەرشتێ لە ئەندازە لای‌دا زیان ئەبەخشێ . تەنانەت عەقیدە و باوەڕت بە پێغەمبەران ئەبێ بە میزانێ بێ نەبێ بەهۆی کافربوون و لەوەندە لانەدا کە خوای تەعالا لە شان و پایەیاندا بڕیاری‌داوە. بەرابەر بە ئال و ئەصحابی پێغەمبەریش درودی خوای لێ بێ یا بە مەشایخ و

ئەولیا ئەبێ لە ئەندازەی شەرع لانەدا و ئینسان ئەبێ باوەڕی وابێ کەوا ئەوانە کەسانێکی سیرەت و ڕەوشت بەرز و خاوەن طاعەت و عیبادەت بوون و لای خوا پایە و مەقامێکی تایبەتییان هەیە ، بەڵام نابێ لەم باوەڕەیدا زیادەڕەوێ بکا و بگاتە ئەندازەیەك لە دین لابدا و لە سنوری میانەڕەوێ دەرچێ .

ئەگەر کەسێکت خۆشویست ئەبێ ئەندازەیەك بۆ ئەو خۆشەویستییەت دانێی نەبادا ڕۆژێ لە ڕۆژان عاجزێ بکەوێتە بەینتان و بەهۆی ئەو خۆشەویستییە پێشووەوە ئەوەندە زیادەڕەویت کردبێ ئێستا مەیدانی لادانت نەمابێ . ئەگەر دوژمنی کەسێکیش بوی پێویستە ئەو دوژمنییە ئەندازەیەکی دروست و ڕەوای بۆ دابنێی و زۆر لانەدەی و لە ئوسوڵی ناحەزایەتی عادەتی دەرنەچی ، نەکا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاشت ببنەوە و ئەوکەسە ببێ بە دۆستت و تۆیش لەبەر شەرمی خۆت ڕۆت نەیەت چاوت بەو کابرایە بکەوێ . بۆیە حەزرەتی پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی :

**« احْبِبْ حَبِيبَكَ هَوناً مَا عَسَى انْ يكونَ بَغِيضَكَ يَوماً مَا ، وابغِضْ بَغِيضَكَ هَوناً مَا عَسى ان يكونَ حَبِيبَكَ يَوماً مَا » .**

واتە : دۆستی خۆت بە میانە خۆش بوێ ، نەوەك ڕۆژێ بێ ببێ بە ناحەزت . ئەوەش کە ڕقت لێیە هەر بە میانە ڕقت لێ بێ ، نەوەك ڕۆژێ بێ ببن بە دۆستی یەکترو خۆشت بوێ .

میانەڕەوێ لە عیبادەتیشدا ئەوەیە حەقی خودا و حەقی خۆت ڕابگرێ و نەحەقی ئەو بفەوتێنێ و نە خۆیشت ئەوەندە ماندو بکەی کە کەڵکت پێوە نەمێنێ . لە حوقوقی بەینی خۆت و خەڵکیشدا ئەبێ وابێ حەقی خۆیشت و حەقی خەڵکیش ڕاگیر بکەی و کەستان زیانتان لێ نەکەوێ ، بەتایبەتی ئەگەر فەرمانداری ئایینێ بێ یا هێ دینایێ ئەبێ بەتەواوێ میانەڕەو بێ نە حەقی خاوەنداوا و نە حەقی داوا لێکراو پشت گوێ نەخەی . بەکورتێ وشەی (عەدل) بەمجۆرە کە باسمانکرد بە جێبەجێکردنی هەمو واجباتێکا ئەگا . ئەگەر لەسەر ئەم ئوسوڵە بەڕێدا بڕۆی نە حەقی خوات لەسەر ئەمێنێ و نە حەقی خەڵق و نە حەقی خۆیشت ئەفەوتێ .

دوهەم ( احسان ) واتە بەجێهێنانی هەرچێ چاکەیە لەوانە کە واجب نین لەسەر ئینسان ، خوای لە ئەوزاعی دەرونی بێ وەك خۆشەویستیی خەڵك ، لەوجۆرە کە واجب نیە لەسەر ئینسان ، یاخود لە ئەوزاعی دەرەوە بێ وەکو بەجێهێنانی نوێژ و ڕۆژو و حەج و عەمرە و قورئان خوێندن و باقی عیبادەتە سوننەتەکان وەکو بەخشینی ماڵ بۆ میوان و دراوسێ و دۆستان و غەیری ئەمانە لە بەشەکانی خێرات وەکو دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و میوانخانە و باقی ئەوزاعی خێرات لەوانە کە واجب نین .

سێهەم ( ایتاءِ ذی‌القربی ) واتە بەخشین بە خزمان . ئەم بەندە هەرچەند بەر ئیحسان ئەکەوێ ، بەڵام لەبەرئەوە کە خوای تەعالا زۆر جار لە قورئاندا داوای سیلەی ڕەحم ئەکا ، ئەم باسەی بەتایبەتێ کردوە بۆئەوەی ئادەمیزادی هوشیار باش تێبگا کەوا پایەی خزمەتی خزم و خوێش چەند بەرزە .

ئەو شتانەیش کە مەنعی کردوون و ناڕەزایێ خوێی لێیان دەربڕیوە ، ئەمانەن :

( فحشاء ) کە بریتییە لە هەر ناباریێ و ناڕەواییەك کە بە زمان بکرێ وەکو کوفرکردن ، پەنابەخودا ، و فیتنە و ئاشوب بڵاوکردنەوە لەناو ئادەمیزادا و وەك بوختان کردن و درۆکردن و غەیبەت و تێکدانی ناوبەینی ژن و مێرد و کوڕ و باوك و بەر و دراوسێ و دۆست و برا و خزم و عەشرەت و خەڵك خراپ کردن لای پیاوی گەورە و دەست ڕۆیشتوو و تانە و توانج‌گرتن لە خەڵك و ڕۆشکاندن و غەیری ئەمانە لەو تاوانانەی بە زمان ئەکرێن و لە ژمارە نایەن .

( مُنکَر )یش واتە هەر تاوانێ کە بە غەیری زمان بکرێ ، واتە بە دەست و پێ و چاو و باقێ ئەندامانی لەش بکرێ وەکو دەست بردن بۆ ناموس یا بۆ نەفس یا بۆ ماڵ یا بۆ سەلامەتێ یەکێ بە هەر ئەسبابێ لەو ئەسبابانە کە بەعادەت بەکارئەهێنرێن کە ئەمەش کرداری وەك جەردەیێ و دزێ و داگیرکردنی ماڵی خەڵك و لێدان و هەر جۆرە دەس‌درێژییەکی‌تر ئەگرێتەوە .

( بَغْی )یش بریتییە لە ئەنانیەت و خۆ بە گەورە گرتن و فیزکردن بەسەر خەڵکدا و یاخی‌بوون و سەرکێشێ کردن بەرابەر بە ڕاستێ و وەرنەگرتنی قسەی ڕاست و دان‌نەنان بەوەدا کە واقیعییە و مل‌بادان لەئاست واتەی بەسوود و ئامۆژگاریێ و ڕێگەی راست نیشان‌دان .

( ئاگادارکردنەوەیەك بۆ هوشیاران ) : ئاشکرایە لای ئەوکەسانەی کە تەماشای تەفسیری قورئانی پیرۆز ئەکەن و لە عورفی لوغەت و عورفی عام خەبەردارن ، کەوا وشەی (معروف) و (منکر) هەمو چاك و خراپێ ئەگرنەوە . وەك چۆن قابیلە وشەی ( فحشاء ) تەفسیر بکرێتەوە بە زیناکردن و دەست‌درێژیێ بۆسەر ناموسی خەڵك ، قابیلیشە تەفسیر بکرێتەوە بە هەر ئیشێکی تاوانباریێ . هەروەها ئەتوانرێ (منکر)یش تەفسیر بکرێتەوە بە هەر ئیشێ کە لە یاسای ئیسلامدا پەسەند نەبێ . (بغی)یش تەفسیر بکرێتەوە بە هەمو دەست‌درێژییەك بەسەر حەقی خەڵکدا ، وەك ڕەوایە تەفسیریش بکرێتەوە بە (زینا) وەك لە (قاموس)دا دەرئەکەوێ. بەپێی ئەم تەفسیرانە هەندێ لەم کەلیمە بەکارهێنراوانە مەعنای یەکتر ئەگرنەوە .

لەسەر ئەم ئەساسە لەم ئایەتە پیرۆزەدا زانایانی تەفسیر گەلێ قسەیان

کردوه . هەندێکیان مەعنای مەحدوود و بێ‌دەرەتانیان داوە بەم لەفظانە و ، هەندێکیان مەعنای فراوان و دەرەتان‌دار و هەندێکیشیان لەگەڵ ئەوەشدا کە مەعنای گوشادیان بۆ داناون ، خستوونیانەتە بەر چەند قاعیدە و بناغەیەك وەك ئیمامی فەخری ڕازی وای کردوە خوای لێ ڕازی بێ .

بەڵام هەندێکیشیان تەفسیری ئەم کەلیمانەیان بەشێوەیەکی واقیعی کردوەتەوە وەك من نووسیومە و فەرموویانە ئەم ئایەتە هەموو شتێکی گرتوەتەوە لە چاك و لە خراپ ، مەسەلا فەرموویانە هەرچی (واجب) پێویست بێ لە حەقی خودا و حەقی ئینسان خۆی و حەقی خەڵك چ لە بیر و باوەڕ و چ لە صیفاتی نەفسی و چ لە ئیش‌وکاری دەرەکی‌دا وەکو شایەتیمان و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و غەزا و ، مامەڵە و نیکاح و نەذر و وێنەی ئەمانە ، هەمووی بەر وشەی (عەدل) ئەکەوێ ، چونکە هەرکەسێ قوصوور لەم‌شتانەدا بکا ئەوە هاتوە بەلای خۆیا و لە حەقی خوا و حەقی خەڵك دوورکەوتوەتەوە . هەرچی ئیشی (سوننەت)یش بێ ، نەفسی بێ یا ماددی و لە عیبادەتا بێ یا لە کاروباری خێزانی و کۆمەڵایەتیدا یا وەك خۆش‌ویستنی ڕەهبەرانی بەهرەمەند یا خەرج‌کردنی دارایی یا چاوپۆشی‌کردن لە خەڵك هەمووی بەر وشەی ( احسان ) ئەکەوێ . لێرەدا دیارە حەقی خزم و خوێشیش هەر بەر (احسان) ئەکەوێ ، بەڵام لەبەرئەوە کە خوا زۆر بەبایەخەوە تەماشای کردوە ، بەتایبەتی ناوی هێناوە . هەرچی گوناه و تاوانیش بێ ، ئەوەی بە زمان بکرێ بەر ( فحشاء ) ئەکەوێ و ئەوەی بە ئەندامەکانی‌تری لەش بکرێ بەر (منکر) ئەکەوێ و ، هەرچییشی لە هەرە نابار و خراپەکان بێ چ لەگەڵ خەڵکدا بێ و چ لە خودا هەمووی بەر (بغی) ئەکەوێ . بۆیە ئەمەم نووسییەوە بۆئەوەی بەرچاوی خوێندەوارانی بەڕێز ڕووناك بێ .

ڕۆڵەم ! مامۆستات بە دڵێکی پاك
دەرست پێ ئەڵێ وەکو برای چاك

پێت‌ئەڵێ خودای سەرانسەر جیهان
نیعمەت ئەڕژێنێ ئاشکرا و پەنهان

میهرەبان لەگەڵ هەموو گیان‌لەبەر
بەتایبەت لەگەڵ نەتەوەی بەشەر

فەرمانی‌داوە بە ( عدل ) و ( احسان )
بە کەرەم لەگەڵ کۆمەڵی خوێشان

نەهیی کردوە لە ( فحشا ) و (منکر)
لە (بغی)ییش هەتا ژین ئەبەینەسەر

جا من ئەمانە بەیان ئەکەم بۆت
هەتا تێبگەی مەعنای دەرسی خۆت

★ ★ ★

( عدل ) بەمەعنا میانەکاری
لە واجباتا بە وەزعی جاری

لە ئیعتیقادا لە بیروباوەڕ
لە واجباتی ئەحکامی بەشەر

لە حەقی عالەم لە دادگادا
موویێ لانەدا بەملا و بەولادا

زنجیرەی ئەمە زۆری پێ‌ئەچێ
تا پیاو تەواوی سەری لێ دەرچێ

★ ★ ★

(احسان) پێویستە لەوەی سوننەت‌بێ   کە مایەی خێر و چاکە و ڕەحمەت بێ
لە عیباداتا لەسەر شێوەی دین   لەگەڵ کەس‌وکار بۆ پێویستی ژین
بەتایبەت ئیحسان بۆ خزم و خوێشان   لەوانا چاتر لەبۆ دڵڕێشان
هەمۆ ئەمانە مایەی ئەمان   مایەی قایمی دین و ئیمان

★ ★ ★

( فحشاء ) وتارێ کە ناپەسەندە   بە شەرعی خودا و بە عەقلی بەندە
(منکر) هەر کارێ تاوانبارێ بێ   خوا چ نهێنی یاخود دیارێ بێ
(بغی) بەمەعنا سەرکێشی ئینسان   بەرابەر بە (عدل) ڕۆیەڕۆی (احسان)
خودپەرست هەرچەند پایە بڵند بێ   نەبێ ئاخرێ ڕۆژێ بە پەند بێ

★ ★ ★

ئەم صیفەتانە خاوەن ئاثارن   لە خێر و شەڕا زۆر مایەدارن
عەدلە ستۆنی چەرخی بێ‌ستۆن   عەدالەت نەما ، دایێ سەرنگۆن
وا لەسەر عەدلی نیظامی قودسی   دەوری دائیرەی مەجموعەی شەمسی
کاتێ تەوازون لەبەینا نەما   زەوێ ڕۆئەچێ و ئەڕۆخێ سەما
بە عەدلە ڕێکێ دۆ کەس لە ژینا   لە ئیشی دنیا و لە ئیشی دینا
بە عەدلە یاسای ژیوار و ژیان   عەدل بۆ سۆدە و ستەم بۆ زیان
بە هێزی عەدلە بیزانە یەقین   ئەڵێن گورگ و مەڕ پێکەوە ئەژین
کاتێ هاتە ناو عەدالەت کارێ   بەشەر ڕۆئەکا بۆ بەختیارێ
بۆ زانست و فەن لەبۆ دارایێ   بۆ تەن‌دروستی و جیهان‌ئارایێ
لەپاش عەدالەت فەضیلەی ئینسان   حەصرە لە خولقی پیاوانەی ئیحسان
ئیحسان وەسیلەی شانە لای خودا   پایە و مایەیە بۆ سەر و سەودا
ئەوەی بەڕاستی ناوی ئینسانە   ئەزانێ ئینسان بەندەی ئیحسانە
ئینسان بە ئیحسان دیوان ڕام ئەکا   دڕوندەی کێوان دڵ‌ئارام ئەکا
دوژمنی دژ حاڵ ئەکا بە برا   برای بێ‌کەماڵ ئەکا بە چرا
بەتایبەت ئیحسان لەگەڵ خزمانا   خوا فەرمۆیەتی لەناو قورئانا
( نامێ ) ئەوەیە بە ئەمری قورئان   بژێ ، تا بمرێ بە دین و ئیمان

★ ★ ★

ئەو عەیبەی خودا ناوی‌نا ( فحشا )   ئینسان دائەنێ لە ڕیزی وەحشا
زمانی پیسە ، زمان پیسەکان   ژار فڕێ‌ئەدەن بە وێنەی ماران
کوفر و بوختان و خولقی عەیب و عار   جنێو و تانە و توانجی نابار
فیتنە و ئاشۆبە و هەروا نان‌بڕین   قسەی زیان‌بەخش بۆ دنیا یا دین
هەمۆ ئەمانە بەری زمانن   دوژمنی خۆشی بەرەی ئینسانن

★ ★ ★

ناوی ( منکر )ە و لە گەورە تاوان دزێ و جەردەیێ و ئیعدامی نوفوس
(بغی) یاخیبون لەهۆی حەقناسێ فیز و دەمار و مل لە حەق لادان
بۆ ئیبلیس ئەشێ کەوا شەیتانە دەرسی مامۆستات عەدل و ئیحسانە
غەصب و ئیستیلای مالی داماوان هەم داوێنپیسێ و لادان لە ناموس
لە بابێبونە و لە ناسوپاسێ بۆ حەیوان ئەشێ نەوەك بۆ ئینسان
خودا لامانـدا لـەم تـاوانانە مایەی خۆشێ ژین ، بەهرەی ئیمانە

## گوڵی سیازدەهەم ـ گوڵی ئامۆژگاریێ

بارانی فەیضی بەهاری ئیحسان
کاتێ بێتەخوار بدا لە ئینسان
وێنەی مامۆستای ئامۆژگاری دین
ئینسان ئەخاتە سەر ڕێگەی تەمکین

حَقُّ الوَلَدِ علی الوالِدِ انْ یُحْسِنَ اسْمَهُ ویُزَوِّجَهُ ویُعَلِّمَهُ الکِتابَ

پێغەمبەری نازدار سەلامی خوای لێ بێ فەرمویەتی حەقی منال لەسەر باوك ئەوەیە کە لەدایكبۆ ناوێکی جوانی لێبنێ و ناوێکیوای بۆ هەڵنەبژێرێ مەعنای عەیب و شورەیێ بگەیەنێ یا نیشانەی کزێ و داماوێ بێ و ، کە پێیش‌گەیشت ئەگەر کوڕ بۆ ژنی بۆ بێنێ و ئەگەر کچ بۆ بیدا بە شو و ، قورئانی پیرۆزی فێربکا .

ئادەمیزاد کە لەدایكئەبێ گیانلەبەرێکی بەستەزمان و بێدەستەڵاتە ، دیارە باوك و دایکی لەمقۆناغەدا ئاگاداریێ ئەکەن . کە لە شیریش بڕایەوە و کەوتەدەر و ماڵ کردن لەوانەیە بکەوێتە بەرپێی ڕێبوار و چوارپێ و شتیوا . لەم سەردەمەشدا هەر لەسەر ئەوانە بیپارێزن و ئاگایان لێ بێ . کە ئاوزاشی و چاوی‌کردەوە ، وەختی پێخوێندنی دێ و پێویستە باوك و دایکی لای مامۆستای فامیدە و لە قوتابخانەی چاکدا دابنێن بۆئەوەی فێری خوێندن و نوسین ببێ . هەروا پێویستە لە سەردەمی منداڵیدا کە هێشتا وەکو کاغەزی سپێ وایە و هیچ لەکەیەکی لێ نەنیشتوە ، دڵ و شوعوری بە ناوی خوا و پێغەمبەری خوا ڕۆشن بکەنەوە . هەروا هەمو پێویستییەکی ئاینیی وەك باسی ڕەوشت و خوی پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ و ڕەوشتی پێشینانی دڵپاك و کردار چاکی موسوڵمانانی پیشانبدەن ، وەك ئەصحابە و تابیعین و پیاوچاکان پلە بە پلە ، چونکە ئەمجۆرە دەرسە لە سینەیدا نەقش‌ئەگرێ و لە دڵیا ئەبێ بە ماڵ و جێ‌گیر

ئەبێ وەکو ئەڵێن « العِلمُ في الصِغَرِ كالنَقشِ في الحَجَرِ » واتە زانستێ کە ئینسان بە منداڵی وەری‌بگرێ ، لە دڵیا دائەمەزرێ وەك چۆن نەخشی سەربەرد بەهۆی هەڵکەندنی بەردەکەوە هەمیشە ئەمێنێتەوە و ناکوژێتەوە .

لێرەدا جێگەی خۆیەتی باسێکی ئەوەش بکەین کەوا بۆچی ئەو دەرسی ئایینەی لە قوتابخانەکاندا بە منداڵ ئەوترێ ، لە دڵیانا جێ‌گیر نابێ و فێری ڕەوشتی موسوڵمانەتی نابن لێیەوە . ئەمە لەبەرئەوەیە یەکەم دەرسەکە لە سەرەتای منالییەوە نەهاتوە ، واتە لە ماڵەوە دەستی پێ نەکردوە و ، لە قوتابخانەکانیشدا نە وەك دەرسێکی بایەخ‌دار پێیان‌ئەوترێ و نە قوتابییەکانیش بەکارهێنانی مەعنای ئەو دەرسە ئایینییانە لە ڕەوشتی ماموستاکانیاندا ئەبینن و ماموستاکان و هەروەها کومەڵیش بەراستی زەوقیان لەسەر بابەتی ئەو دەرسانە نیە . ئەگەر وانەبوایە ئەو منالانە سودێکی زورتر و باشتریان لەو دەرسانە وەرئەگرت .

زانایان وتویانە ئادەمیزاد پێنج خوێندنگای هەیە زانست و تەمێ و تەربییە و خووڕەوشتیان تیا وەرئەگرێ . یەکەم : ئەو خێزانەی تیا پێگەیشتوە واتە باوك و دایك و برا و خوشك و خزم و کەس‌وکار و ئاموشوکەری ماڵەوەیان . دوهەم: مزگەوت بەهوی گوێ‌گرتن لە ئاموژگاری پێشەوای نوێژ و خوتبەخوێن و چاولێ‌گەری موسوڵمانانی نوێژکەر و خواپەرستەوە . سێهەم : قوتابخانە چ دەولەتی بێ و چ هی خەڵك خویان ، بەهوی ئەودەرسانەوە کە ئەیانخوێنێ و ئەو ئاموژگارییانەی لە ماموستایان ئەبیسێ . هەروەها بەهوی چاولێ‌گەری ماموستا و ئاوەڵە قوتابییەکانیەوە . چوارەم : ئەو کومەڵەی تیا ئەژێ ، بەهوی هەڵسان و دانیشتنیەوە لەگەڵ خەڵکدا و وەرگرتنی بیروباوەڕیان و ئەو هویانەی فێرکردن کە لەو کومەڵەیەدا بڵاون ، وەك ڕوژنامە و ڕادیو و تەلەفزیون کە لەم سەردەمی ئێمەدا کارێکی زور ئەکەنە سەر پێگەیاندنی خەڵك . پێنجەم : دەماغ و شعوری تایبەتی ئادەمیزادەکە خوی .

هەروەها زانایان وتویانە لەناو ئەم هویانەدا موحیط و کومەڵ لە هەمو هویەکانی‌تر بەهێزتر و بەبڕشت‌ترە . پاش ئەویش قوتابخانەی دەماغ لە هەمویان دەوام‌دارتر و پایەدارترە . بەڕاستی ئەگەر ئینسان دەماغێکی بەرز و بەهێزی نەبێ زیاتر ئەکەوێتەشوێن ئەو ڕێگایەی کومەڵ و موحیط گرتویانەتەبەر و ، کومەڵ ڕوی لە هەر لایەکەوە بێ ئینسانیش ڕوئەکاتە ئەو شوێنە و بەوجورە ڕەوشت وەرئەگرێ ، وەکو ئێمە بە بەراوردی خومان ئەم وەزعەمان حاڵی بوە و تێگەیشتوین کەوا کومەڵ زور بەهێز و کاریگەرە .

بە هەرحاڵ پێویست و واجبی ئایینییە لەسەر ئادەمیزاد لە هەر چەرخێکا بێ و لە هەر وڵاتێکا بژێ تێبکوشێ بو ئاموژگاری کردن و دەرس‌دادانی کومەڵ و

دەوروبەری خۆی و موسوڵمانانی‌تر و ، بە هیچ جۆرێ ڕەوا نیە ئادەمیزاد خۆی دوور بخاتەوە لە ئامۆژگاریدادان و فێرکردنی خەڵك ، وەکو پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « العِلْمُ لایَحِلُ مَنْعَهُ » واتە دروست و حەڵاڵ نیە مەنعی زانست بکرێ لە هەرکەسێ کە پێویستی بە زانست هەبێ ، خوا گەورە بێ یا بچوك بێ ، چونکە خوێندن وەختی تایبەتی نیە ، وەك وتراوە « مِنَ المَهدِ الی اللَّحْدِ » واتە خوێندن و فێربون لە بێشکەوە دەستپێ ئەکا و تا بنیادەم ئەخرێتە قەبرەوە هەر وەخت و کاتیەتی .

هەر لەسەر ئەم بناغەیە خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزا فەرمویەتی : ئەوکەسانەی عیلم و زانستمان پێداون و پەیمانمان لێوەرگرتون کەوا ڕایبگەیەنن بەوانەی پێویستیان پێی هەیە و ئەوان لێیان ئەشارنەوە ، لەعنەت و نەفرینی ئێمە و فریشتەکانی ئێمە و ئادەمیزادیان بە کۆمەڵ لێ بێ . هەر لەسەر ئەم بناغەیەشە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « لاتَرْفَعْ عصاكَ عَنْ اهلكَ ادَباً » واتە : ئەی خاوەن ماڵ و منداڵ ! هەرگیز داری خۆت لەسەر شانی خێزانی خۆت لامەبە بۆ تەمێ دادانیان ، بەومەعنا هەمیشە بەپێی ڕێکەوت خۆت بە تەمێ‌کردنیانەوە خەریك بکە تا فێری خوورەوشتی ڕاست و سودمەند ئەبن ، چونکە هەر دەردێ کە تۆشی تاقە یەکێ یا کۆمەڵێ ببێ ئەگەر چاری نەکرێ زیانی لەوانەیە ئەوەندە نەبێ ، بەڵام بێبەش‌بون لە عیلم و زانست دەردێکە تۆشی هەرکەسێ یا هەر کۆمەڵێ بۆ نەك زیانی تەنها بۆ کاروباری دنیایە، بەڵکو زیانی گەورەی بۆ پاشەڕۆژە .

مێژوی ڕەوشتی پێغەمبەر درودی خوای لێ‌بێ پیشانمان ئەدا کەوا ئەو ذاتە گەلێ بۆ بڵاوکردنەوەی عیلم و زانست هەوڵی‌داوە و بەپێی هەڵکەوت لەناو قەرەباڵغی گەورەدا وتاری ئەخوێندەوە و ئامۆژگاری ئەکردن و فەرمانی بە گوێ‌گرەکان ئەدا کە ئەو وتارانەی بەو خەڵکانەی‌تریشدا ڕاگەیەنن کە لەو شوێنەدا حازر نەبون . بەتایبەتی لە ساڵی غەزای (بەدر)دا کە موسوڵمانان تیا زاڵ‌بون بەسەر کافراندا و حەفتا کەسیان لێ کوشتن و حەفتا کەسیشیان لێ بەدیل‌گرتن ، هەر دیلێ لەو دیلانە دە کەسی لە موسوڵمانەکان فێری خوێندن و نوسین بکردایە ئازاد ئەکرا . لە ئاخری ژیانیشیا لە سەفەری (حجة الوداع)دا کە حەجی خوا حافیزێ و ماڵئاوایی بۆ لەو هەمو ئەصحابانەی لەگەڵیا کۆبوبونەوە لەو حەجەدا و ژمارەیان ئەگەیشتە نزیکەی صەد و دە هەزار کەس ، چەند خوطبەیەکی بەرزی بۆ ئامۆژگاری بۆ خوێندنەوە و فەرمانیشی دانێ کەوا فەرمودەکانی ڕاگەیەنن بەو ئەصحابانەی‌تردا کە نەهاتبون بۆ ئەو حەجە و لەویا نەبون .

هەر بە مەبەستی فێرکردن و ڕاگەیاندنی ئامۆژگاری سودمەندە لە ئایینی

ئیسلامدا فەرزکراوە هەمو حەفتەیەك لـە ڕۆژی جومعەدا لە هـەر شوێنێکدا زانای ئایین لەسەر مینبەری مزگەوتی ئەو شـوێنە ڕاوەستێ و قسـە بکا بۆ خەڵکەکە و ئامۆژگاریان بکا . هەروەها بۆیەش بڕیاردراوە موسوڵمانان ڕۆژی پێنج جار لە مزگەوتدا کۆبنەوە و پێکەوە لەپشـت سـەری پێشنوێژەوە ڕیز ببەستن و نوێژ بکەن و لە ئەخلاق و ڕەوشتی یەکتر شـارەزا ببن و سـود لە زانستیان وەربگرن .

پێویستی خوێندەواری و زانست لە پلەی یەکەمدا بۆ فێربونی ئوسوڵی ئیسلامەتی و ڕەوشتی حەزرەتی پێغەمبەرە درودی خوای لێ بێ و بۆ زانینی ئەو شتانەیە کە لە ئاییندا فەرزن . دوهـەم بـۆ زانینی هەرشتێکە کـە لە ژیانی ئادەمیزادا فەرز بێ وەك زانینی زمانی گەلەکانی جیهـان و فـێربونی هونەر و پیشەسازی و بەتایبەتی پیشەسازی چەك دروستکردن بۆ بەرگری لە دوژمنانی موسوڵمانان . لە قورئانی پیرۆزدا باسی حەزرەتی داوود کراوە کەوا سنعاتکار بوە ، هەروەها ئایەتیوا هەیە داوا لە موسوڵمانان ئەکا کە چەك دروستبکەن و وڵاخی سواری و هۆیەکانیتری هێز پەیدا بکەن .

لەبارەی زانستی ڕاستەقینەوە پێغەمبەری نازدار فەرموێەتی : « الحِكْمَةُ تَزِيدُ الشَّرِيفَ شَرَفاً ، وَتَرْفَعُ العَبْدَ المَملوكَ حَتَّى تُجلِسَهُ مَجالِسَ المُلُوكِ » . واتە : زانستی ڕاست و بەسود بێ ئینسانی بەحورمەت پایەبەرزتر ئەکا لە جارانی و ، بەندەی زەڕخرید بەرز ئەکاتەوە و ئەیگەیەنێتە پلەیەکیوا لە شوێنی پادشاهانا دایئەنیشێنێ . هەروەها فەرموێەتی : « الكَلِمَةُ الحِكْمَةُ ضالَّةُ المُؤمِنِ ، فَحَيْثُ وَجَدَها فَهوَ أحَقُّ بِها » . واتـە : وتەیەك کە زانستێکی بەنـرخ پیشانبدا ، شتێکی بەنرخی وایە بۆ موسـوڵمان هەمیشە بەدوایا بگەڕێ ، بۆیـە لە هەرکوێ دییەوە و لای هەرکەس دەسـگیری بۆ ئەو شایانترە پێی بۆئەوەی وەریبگرێ و ڕەفتـاری پێ بکا . ڕاستەکەشی وایە ، ئەبێ ئینسـانی هوشـیار بەدوای مەعریفەتی بەرزدا بـگەڕێ و لای هەرکەس دەستیکەوت لەوە نەپرسێ کێیە و چکارەیە و بۆ خۆی فێری بێ لای .

هەروەها پێویستە ئەگەر ئینسـان شتێکی نەزانێ شـەرم نەکا لە پرسیار و بپرسێ تا بـاش تێئەگا . خوا فەرموێەتی : « فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ » . واتە ئەگەر شتێکتان نەزانێ پرسیار لە خاوەن عیلم و زانستەکان بکەن با بیزانن . بەکورتی ئینسـان بە بێعیلم و زانست پێناگا و پایەی هەر میللەتێ ئەوەندەی پایەی عیلم و زانسـتەکەیەتی . بۆیە لە زەمـانی پێغەمبەردا سەلامی خوای لێ بێ ، لەبەرئەوە کە خوێندن و نوسین لە وڵاتی حیجازدا کەم بوە و پێویستیشیان بە تیرئەندازی بوە چونکە شەڕ بە تیر و کەوان کراوە و ، لەبەرئەوە کە دورە دەریا و مەلەنەزان بون ، فێرە مەلەوانی بون زۆر

پێویست بوە ــ پێغەمبەر فەرموێەتی : « حَقُّ الوَلَدِ عَلَی الوالِدِ اَنْ یُعَلِّمَهُ الکتابَةَ والسِّباحَةَ والرِّمایة وَاَنْ لایَرْزُقَهُ اِلاّ طَیِّباً » . واتە حەقی منالە لەسەر باوکی کە فێری نوسین و مەلەوانی و تیرئەندازی بکا و خواردەمەنی حەلاڵ نەبێ هیچیتری دەرخوارد نەدا .

لەم فەرموێدە بەئرخەوە دەرئەکەوێ کەوا پێویستە لەسەر موسولمانان لە هەمو چەرخێکدا بەپێی ئەو چەرخە تێبکۆشن بۆ زانست و هونەر و پیشە و هەر شتێ سودی بۆ خۆیان و خێزانیان تیابێ و لەوانەبێ موسولمانان سودی لێوەربگرن ، سەرەڕای ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ژیانەوە هەیە وەکو کشتوکاڵ و باخداری و حەیوانداری و ئەم جۆرە شتانە . هەروەك چۆن پێویستە ئادەمیزاد خەریکی شتێ بێ نانێکی تیابێ بۆی ، هەروا پێویستیشە هەر پیشە و هونەر و پیشەسازییەك کە بێ بەهۆی پاراستنی وڵات لە هێرشی دوژمن فێری بێ و تیایا سەرامەد بێ ، چونکە نان بۆ مانەوەی ژیانە و هێز بۆ مانەوەی کەرامەت و سەربەرزی و ئازادی ئادەمیزادە . ئینسانێ کە کەرامەتی خۆی پێ نەپارێزرێ مردنی باشترە لە ژیانی .

ئەصحابەکانی پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ کە چون بۆ گرتنی قەڵای ( طائیف ) ، ( دەبابە )یان بەکارهێنا . دیارە دەبابەی ئەو سەردەمە وەك دەبابەی ئیستا نەبوە . ئەو دەبابەیەی موسولمانان بەکاریانهێنا بریتی بۆ لە سندوقێکی گەورە لەسەر چوار پێچکە ئەچو بەڕێدا ، چەند کەسێکی ئەچونە ناو بۆئەوەی کە ئەچونە پێشەوە تیری دوژمن کاریان لێنەکا . بەوجۆرە توانییان بگەنە دیواری قەڵاکە . موسولمانەکان ویستیان لەوێوە بە پاچ دیواری قەڵاکە کونبکەن و بچنەژورەوە ، کافرەکانیش تیرەکانی خۆیان لەئاگردا سور کردەوە و نایانن بە سندوقەکەوە ، بەوجۆرە سندوقەکە ئاگری گرت . موسولمانەکان ناچار بون لە سندوقەکە هاتنە دەرەوە و هەڵاتن . ئەوجارە قەڵاکەیان بۆ نەگیرا . بەڵام جارێکیتر هاتنەوە سەری و داگیریانکرد . پاش وەفاتی پێغەمبەریش لە زەمانی خولەفای ڕاشیدین و لە هەمو چەرخێکی لەوەوپاشیشدا موسولمانان ئەسبابی شەڕیان ئامادە کردوە و کەم وابوە لە دوژمنەکانیان کەمتریان هەبێ .

لە زەمانی ( هارون الرشید )دا سەعات دروستکراوە . هارون الرشید سەعاتێکی بەدیاری ناردوە بۆ ( شارلەمان )ی قەڕاڵی فەرەنسە . ئەوکاتە فەرەنگییەکان ئەوەندە لە شارستانییەتەوە دور بون ، لە سەعاتەکە ئەترسان وایانئەزانی شتێکیوای تیایە ئەیانترسێنێ . لە سەردەمی ( مأمون )یشدا عولومی یونانییەکان وەك ریاضیات و طبیعیات هەرچی لە یونانا باو بۆ بە فەرمانی مەئمون کران بە عەرەبی و لە خوێندنگاکانی وڵاتانی موسولماناندا ئەخوێنران . لە زەمانی فاطمییەکانی میسریشدا عیلم و مەعاریف گەیشتبوە پایەیەکی بەرز . لەو سەردەمەدا بۆ ( جامع الازهر ) دروستکرا و پڕ بۆ لە

مامۆستایانی بەرز . ئەوەتا تائیستاش هەر بەردەوامە و ڕۆژبەڕۆژ گەورەتر ئەبێ و خزمەتی زۆرتر ئەبێ . هەروا لە زەمانی ئەیوبییەکانیشدا ، بەتایبەتی لە سەردەمی ( صلاح‌الدین )دا دەوڵەتی ئیسلام لە هەمو ڕویەکەوە ڕو لە بەرزی بو و صەلیبییەکان لە شام دەرکران و عیلم و خوێندەواری هەمولایەکی گرتەوە . لە ئەندەلوسیشدا ، لە چەرخی هەرکام لەو حوکومەتانەی لەوێ حوکمڕانییان کرد ، پایەی زانست لە هەمو ڕویەکەوە بەجۆرێ بەرز بوبوەوە ، تاریکستانی ئەوڕۆژەی ئەوروپایشی گرتبوەوە . بەشێکی گەورەی بڵاوبونەوەی زانست لە ئەوروپادا ئەگەڕێتەوە بو تەئثیری ئەندەلوس . هەروا بو تەئثیری زاناکانی شیمالی ئەفەریقا و ئەو زانستەی لەکاتی شەڕی صەلیبیدا لە ڕۆژهەڵاتەوە فێری بون . زانای وەك ( ابن‌رشد ) و ( ابن‌خلدون ) دوان بون لەوانەی بەرهەمەکانیان ئەکران بە لاتینی و لە ئەوروپادا بڵاوئەکرانەوە .

ئەگەر هێرشی موغول لە ڕۆژهەڵاتەوە و هێرشی صەلیبی لە ڕۆژاواوە نەهاتایە بەسەر جیهانی موسوڵماناندا و وڵاتیان وێران‌نەکردایە ، لەوانەبو وڵاتانی ئیسلام گەلێ زیاتریش پێش بکەوتنایە و ئەو زانستەی لە ئەوروپا بڵاو بوەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای ئیسلامدا بڵاو بوایەتەوە ، نەخوازەڵا کە زانایانی ئیسلام نەك تەنها لە مەیدانی عولومی دینیدا ، بەڵکو لە هەمو مەیدانەکانی‌تری زانستیشدا پەلیان‌هاویشتبو و پەرەیان سەندبو . بەڵام هەزاران‌ئەسەف کەوا بەهوی گەلێ شتەوە کە لێرەدا باس‌ناکرێن عالەمی ئیسلام لە وڵاتانی‌تری جیهان پاش‌کەوت و دوژمن هەلیان بو هەڵکەوت و لێی‌پێش‌کەوتن و بەسەرمانا زاڵ‌بون . جا لەبەرئەوە کە یەکێتی موسوڵمانان زیانی زۆر بو بویان ئەوەشی کە پارچە پارچە نەبوبو ، پارچە پارچەیان کرد و لەیەکیان جوێ کردەوە و هەر پارچەیەکیان بە دەردێ گیرۆدە کرد و خو و ڕەوشتی خویانیان خستە ناو دڵی موسوڵمانانەوە و وایان لێ‌کردن ئامۆژگاری پیاوی ژیر و ساغ و دڵسۆز لە گوێ نەگرن .

بەڵام دین و ئایینێ کە لەسەر بناغەی (قرآن) دامەزرابێ و ڕەوشتێ لەسەر بناغەی ڕەوشتی حەزرەتی ( محمد ) پێکەوەنرابێ ، هەرگیز نافەوتێ و لەناوناچێ ، بەڵکو هەرچەند دوژمن بیەوێ بیکوژێنێتەوە ئەم زیاتر بڵێسە ئەسێنێ و بڵێسەی لە دڵی خەڵکدا بەرزتر ئەبێتەوە . ئیستا موسوڵمانان و بەتایبەتی خاوەن بیرانیان گەلێ لە جاران زیاتر وریا بونەتەوە بوئەوە کە وڵاتی ئیسلام و ئوممەتی ئیسلام ببوژێننەوە و ئومێدمان وایە لە ماوەیەکی زودا بکەن بە مەبەست و مەرامی خویان و بە بیروباوەڕی ڕوناك و ڕەوشتی پاك و چاك و زانستی زۆرەوە بێنەوە مەیدان و بونی خویان لەم سەرزەویە نیشان بدەن .

پێویستە هەمو موسوڵمانێ بزانێ کەوا خوپەرستی بێ‌سودە و لە ڕاستی

پەرستن بەولاوە هیچ کەلکی نیە و موسولمانان تەنها بەوە ئەگەنە شان و شکۆی شایانی خۆیان کە هەمۆیان بە ساغی تێبکۆشن و بیروباوەڕی موسولمانەتی لە دل و دەروونی خۆیاندا بچەسپێنن و هەر عیلم و زانستێ کە بۆ ئەم سەردەمە بەکاربێ فێری ببن و بلاوی بکەنەوە و بە کردەوەی باش و ڕەوشتی بەرزەوە خەریك ببن چونکە بێڕەوشتی بەرز لە هیچ شتێکدا ناگەن بەئەنجام . پێشینانی موسولمانان بەمجۆرە پەلیان هاویشت و ڕۆژەلات و ڕۆژاوایان گرتەوە و ئێمەش هەر ئەم ڕێگایەمان لەبەرە و بەوجۆرە ئەبێ پێبگەین ، وەکو پێغەمبەری نازدار درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « لَنْ يَصْلُحَ آخِرُ هذه الأمَّةِ الا بِما صَلُحَ به اوّلها » واتە : چینی پاشەوەی ئەم میللەتەش هەر بەوە چاك ئەبێ کە چینی پێشەوەی پێ چاك بۆ .

بۆ ڕۆشن بونەوەی هۆیەکانی بەرزبونەوەی میللەتی ئیسلام ئەم چەند شتە بەسودە :

یەکەم : خوێندن بەشێوەیەکی گشتی ، بەمەرجێ مامۆستایانی خوێندنگاکان خاوەنی بیروباوەڕی پاك و چاك بن و ، لەگەل دەرس‌دادانی قوتابییەکانیانا ، بە کردەوە و بەگوێرەی توانا واجباتی ئیسلامیشیان پێ جێبەجێ بکەن و لە نەریتی قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەریان نزیك بکەنەوە . دۆهەم : بایەخ‌دان بە ڕەوشتی بەرز و پێش‌خستنی ئەوکەسانەی خاوەنی ڕەوشتی بەرزن . سێهەم : زیادکردنی خوێندنی ئەو هونەر و پیشانەی بۆ ژیانی موسولمانان بەسودن و سەربەخۆیی موسولمانانیان پێ ئەپارێزێ و بەرگریان پێ‌ئەکرێ لە دوژمن . چوارەم : هێزدان بە گیانی دۆستایەتی و خۆشەویستی و پاك کردنەوەی مێشکی موسولمانان لە تۆوی جیاوازی و دۆبەرەکی و بلاوکردنەوەی گیانی باوەڕ و متمانە بە یەکتری کردن . ئەمەیش لەسەر ئەوە وەستاوە کە هەرکەس لە ذاتی خۆیدا ڕاست بێ و ڕاستی پیشان بدا .

ڕۆلەی پەروەردەی پەردەی نازاری ! | گوێ بگرە بە دل بۆ ئامۆژگاری
( سنة الله )یە فەرمانی خودا | ئامۆژگاری خێر لە چەرخی دنیا
واتە دەم بەدەم ، کتێب دەس‌بەدەس | ئەلێ بێ تەعلیم کەس نابێ بە کەس
کەس زانا نابێ بێ ئامۆژگاری | کەس بالا نابێ بە بێ هوشیاری
کاتێ کە پێت‌گرت بە بێ‌بەهانە | هەستە پێ بڕۆ بۆ قوتابخانە



پەڕەی کتێبی قوتابخانەکان | نامەی خودایە ، خودای لامەکان
نوسراوە ئەلێ ئەی ئادەمیزاد | دەرسی بخوێنە و بژی بە دل‌شاد
بە دەرسە پایەی خاوەن مرادی | شان و سەربەرزی و شادی و ئازادی

نازانی ئـادەم کە کەوتە سـەر ئەرز ‌ ‌ ‌ بە دەرسـی خودا کرا بـە سەربەرز
لەسـەر فریشـتەی بەرزی ئاسمان ‌ ‌ ‌ بۆ بە مامۆستای بە سـایە و سامان

★ ★ ★

کە بـۆی بە زانا دانی پـاڵ و پشت ‌ ‌ ‌ لەسەر بنـاغەی کردەوە و ڕەوشت
ئینسـان بـازێکە مەیلی لە گەشـتە ‌ ‌ ‌ گیـانی زانسـتە و باڵی ڕەوشـتە
بـا گیـانلەبەر بـێ بـازی تەوانـا ‌ ‌ ‌ بـێ بـاڵ نـافڕێ بـە ئاسمـانا
ئینسـان بە هۆش و هیوا و کردەوە ‌ ‌ ‌ گـرەوی بـەرزێ پـایەی بـردەوە
ئەوەی بێهۆش و زانسـت و کـارە ‌ ‌ ‌ ئەنجامی هیچـە و ڕەنج بەخەسـارە

★ ★ ★

هۆش بناغەیـە لەبـۆ خـانۆی ژیـن ‌ ‌ ‌ ژین بە ژیـوارە و ژیـوار بە زانـین
زانـین بۆ ئیـش و کردەوەی بەرزە ‌ ‌ ‌ ئیش نـاوەدانی تەختـی ڕۆی ئەرزە
ڕەوشـتیش وێنـەی قـازێ دادگا ‌ ‌ ‌ فەرمـانی چـاری ناسـازێ ئـەدا
هیوایش وێنەیـە بـۆ هەوای جیهان ‌ ‌ ‌ خـانۆی بێهـەوا نـاشێ بۆ ژیـان
ئەمەیـە دەرسـم بـۆ بەختیـارێ ‌ ‌ ‌ دوور مەبـەرەوە لـە ئـامۆژگارێ
لە یەك وەربگرە و بیـدە بـە هەزار ‌ ‌ ‌ ببە بە دەرمان بـۆ دەرد و ئـازار
هەروەهـا بـوە ئـەم ڕۆی دنیـایە ‌ ‌ ‌ هەروەهـاش ئەبـێ هەتـا هەتـایە
گەل کە دانـەوێ پـایەی زانسـتی ‌ ‌ ‌ مـایەی نـامێنێ ئیللا لـە پەسـتی
کە دوورکەوتـەوە لە فەن و پیشـە ‌ ‌ ‌ بە بای داماوێ دەردێ لە ڕیشـە
گەل کە بێبەش بـێ لە ڕەوشتی بەرز ‌ ‌ ‌ لە ئاسمـان بـێ ئەکـاتە سەر ئەرز
گەل هیوای نەما بە خودا و بە خـۆی ‌ ‌ ‌ ناشێ تۆ گۆڕێ هەڵـکەنێ لەبـۆی
بـا گۆڕی گوم بـێ لە گۆڕستـانا ‌ ‌ ‌ تـۆوی نەمێنـێ لـە گولستـانا
کۆمەڵـی ( نـامێ ) خـاوەن هیوایە ‌ ‌ ‌ خـادیمی خۆیـە و بەندەی خوایـە

## گوڵی چواردەهەم ـ گوڵی هیوا

بروسکە و ناڵەی هـەورەکەی بەهار
وێنـەی دیوانـەی دیداری نـازار
بە (تاو) بۆم بێنێ نەك بـە یەك و دۆ
موژدەی نەسـیمی ( ولا تَیاسُوا )

**ولا تیأسـوا منْ رَوْحِ اللهِ ، انّهُ لایَیـاسُ منْ رَوْحِ اللهِ الاّ القـومُ الکـافِرونَ .**

واتە : نائومێد بن لە ڕەحمەتی خوا ، چونکە بەڕاستی کەس نائومێد نـابێ لـە ڕەحمەتی خوا مەگەر ئەوکەسانەی باوەڕیان بە خوا نیە .

ئینسانی هیوادار بێ بەوە کە لەئەنجاما بە مەبەستی خۆی ئەگا هەمیشـە دڵی ڕۆناك ئەبێ و بۆ دوارۆژی پیرۆز ئەڕوانێ و مەینەت و ئازاری دنیا لەپێش چاویا قیمەتی نابێ ، بەڵکو پشتئەستور و دڵنیا ئەبێ کە ئەنجامی بـاش بۆ ئەو ئەبێ . خوای تەعالا بە حیکمەتی خۆی ئادەمیزادی وا دروست کردوە کە خاوەن ئومێد و ئارەزو بێ بۆئەوەی تێبکۆشێ بۆ دەردەستکردنی ئەوەی پێویستیەتی . ئەگەر ئادەمیزاد خاوەنی ئەم هیوایانە نەبوایە یاخود ئەم خووە لە جیهانا نەبوایە، نە کشتوکاڵ و نە ئاڵووێڵ و نە چۆداری و نە ئاودێری و نە هـەوڵ بۆ فێربونی هونەر و پیشەی بەرز و نە ئاوەدانکردنەوەی ڕۆی ئەرز و نە تەقالا بۆ دارایی و بۆ شان و پایەی پیاوانە هیچی نەئەبو .

ئەگەر لەبەر هیوای پیرۆزی ئەنجام نەبێ دایکی منـاڵ بۆچی بە کوێرەوەری مناڵ بەخێو ئەکا و کاروانێ بە تاریکەشەو و ڕۆژی گەرم و سارد ڕێگا ئەبڕێ و ڕەنجبەر قوڵ ئەکوتێ و ئادەمیزاد شارەوشار ئەڕوا بۆ وڵاتی غەریبێ و خوێندەوار بەدوای عیلم و زانستدا ئەگەڕێ . بەکورتی هیوا لە هەمو کاتێکدا هێز ئەدا بـە ئادەمیزاد لەسەر ئیشکردن و هەوڵدان بۆ خۆی و نەتەوە و هاونیشتمانەکانی.

بەڵام پێویستە بۆ ئینسـان بەرابەر بە ئامانجی خۆی هۆش و بیرێکی ساف بەکاربێنێ و نەکەوێتە بیری دەردەستکردنی ئامانجێکیوا کە بەعـادەت بـۆی ڕێنەکەوێ و قابیلی ئەوەنەبێ جێبەجێ بێ ، ئەگینا پیرێکی صەد ساڵ عومـر ڕابواردو ناچێتە عەقڵەوە لەو تەمەنەدا ژنبێنێ بەهیوای ئەوە کە مناڵێکی بێ و تەمێ و تەربیەی بکا تا بێ بە کەسێکی سەرامەد و دەرکەوتو ، یاخود خـۆی ئامادە بکا بۆئەوە کە سەرلەنوێ بڕواتە قوتابخانە بۆ خوێندن و خۆ پێگەیاندن .

ئەگەر کەسێ بڵێ مادەم هیوا ئەوەندە بەسودە بۆچـێ لە فەرمودەکانـی حەزرەتی پێغەمبەردا دروودی خوای لێ بێ گەلێ مەنعی موسوڵمانان کراوە لـە ( طول أمل ) واتە هیوای درێژ و ، حیرص و طوڵی ئەمەل بە ڕەوشتێکی خراپ و خۆیەکی ناشیرین ژمێرراوە ، لە وەڵامدا ئەڵێین : ئەو هیوایە کە لە دیندا مەنعی لێکراوە هیوایەکـە تەنهـا ڕۆبکـاتە هـەوای نەفـس و ئارەزوپەرسـتێ و فەرامۆشکردنی واجباتی ئاینێ . ئەگینا دروستکردنی مزگەوت و قوتابخـانە بەهیوای پاشەڕۆژی نەتـەوە و ناشـتنی باغ و بێسـتـان بە قەسـدی سودی موسـوڵمانان و تەمێ و تەعلیم دادانی کۆمەڵ بەهیوای ئەوە کە پیـاوی کارامەی بۆ پاشـەڕۆژ لێ پێبگات ، یا ناردنی منداڵ بۆ وڵاتی بێگانە بەهیـوای ئەوە کـە فێری هونەر و پیشـە ببن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ئەوەی فێری بوون لەوێ بڵاویکەنەوە ، هەمو ئەمجۆرە هیوایانە لە بەرچاوی ئەوانەدا کە شارەزای ئیسـلامەتین ، بەهیوایەکی پەسـەند دائەنرێن و کردەوەکـان یا فەرزی عـەین یا فەرزی کیفایەن . پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ فەرموێـەتی : « انْ قـامَت

السَّاعَةَ و في يَدِ احَدِكُمْ فَسيلَةٌ فَلْيَغرِسنها » . واته : ئەگەر نیشانەی داهاتنی ڕۆژی قیامەت دەرکەوت و لەوکاتەدا یەکێ لە ئێوە نەمامێکی خورمای بەدەستەوە بۆ با ئەو نەمامە بنێژێ و نەڵێ کەوا دنیا ئەبڕێتەوە ئەم نەمامە بۆچی بنێژم . هەروا حەزرەت درۆدی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی : « اعمَلْ عَمَلَ امرِیءٍ یَظُنُّ انْ لَنْ یَموتَ ابَداً ، واحذَرْ حَذَرَ امرِیءٍ یَخشی انْ یَموتَ غَداً » . واته : ئیش و کاری ژیانی دنیای خۆت بەجێبێنە وەکو کەسێ کە گومانی وابێ هەرگیز نامرێ و بترسە لە تاوانباری و دوور بکەوەرەوە لە کردەوەی ناپەسەند وەکو کەسێ کە ترسی مردنی سبەینێی هەبێ . هەروا ئەثەرێ وەرگیراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ئەڵێ : ئیش بکە بۆ دنیات وەکو ئیشی کەسێ کە گومانی وابێ قەت نامرێ و ، ئیش بکە بۆ ڕۆژی قیامەتت وەکو کەسێ وابزانێ سبەینێ ئەمرێ .

خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزا فەرمۆیەتی « ولا تَنْسَ نَصیبَكَ مِنَ الدُّنیا » . واته : بەشی ژیانی میانەی موناسبی خۆت لە دنیا فەرامۆش مەکە . لە واقیعا بە بێ دەست ڕۆیشتن و دارایی ئینسان ناتوانێ ئیشی دین و پێویستی کۆمەڵی موسوڵمانان بەجێبێنێ . ئێمە کە تەماشای سیرەتی گەورە پیاوانی ئیسلام ئەکەین باش حاڵی ئەبین کەوا گەلێ هەوڵیان داوە بۆ دارایی، بەڵام لەگەڵ داراییەکەیشیاندا نە واجباتی دین و یاسای ئیسلامیان زایە کردوە و نە موسوڵمانانیان لەو دارایی و خێرە بێبەش کردوە و نە خوایشیان لەبیرچوەتەوە. کەواتە بەئاشکرا لەم بەیاناتەوە دەرئەکەوێ کەوا هیوای دنیای ناپەسەندی بێسوود و نابار صیفەتێکی خراپە و هیوا و تەمای دنیای حەڵاڵ شتێکی باش و ڕەوایە و هەرچی بە خراپە باسی طوڵی ئەمەل کراوە لە دینا مەبەست هیوا و حیرصی ئینسان بوە لەسەر کاری ناڕەوا و ناپەسەند و ناشەرعی و ئەم هیوای چاك یا خراپەیشە بەپێی ئینسان ئەگۆڕێ . خوا فەرمۆیەتی : « قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلى شاكِلَتِهِ » . واته : ئەی پێغەمبەر تۆ بڵێ هەرکەس بەگوێرەی قابیلەت و لێهاتنی خۆی کارئەکا و ئەکەوێتە دنیاوە . ئەگەر مەبەستی لەسەر چاکە بێ ، هیوای چاکەی زۆر ئەبێ و ئەگەر مەبەستی لەسەر کردوەوەی نابار و ناپەسەند بێ هیوا و ئەمەلی ئەوەی ئەبێ . جا بەگوێرەی ئەو هیوایە ئەکەوێتە ئیش و کار .

زانا بەرزەکانی ئیسلام باسی ئەوەیان کردوە کە چۆن لە قورئانی پیرۆزدا هانە هانەی موسوڵمانان دراوە لەسەر خزمەتی ئایینی ئیسلام و غەزاکردن لە ڕێگەی خوادا و ، لەسەر ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت و لەسەرئەوە کە لە هەر کۆمەڵە موسوڵمانێ تاقمێکیان بڕۆن بۆ خوێندن فێری ئەحکامی شەریعەت بن و بێنەوە دەوروبەری خۆیان فێر بکەن و بیانترسێنن لە عەزابی خوا . هەروەها فەرمان‌دراوە بە ئامادەکردنی هەرچی پێویست بێ بۆ ترساندنی دوژمنانی

موسولمانان و دوژمنانی خوا وەك چەكو وڵاخی سواری و باری و هەرچی‌تر كە پێویست بێ . دیارە ئـەم شتـانەش بێ دارایی ئامـادە ناكرێن و داراییش بێ هەوڵدان و بێ هیوای دوارۆژ دەسگیر نابێ .

لە ( الجامع الصغیر )دا فەرمودەیەك لە پێغەمبەرەوە گێڕراوەتەوە دروودی خوای لێ بێ ، ئەفەرموێ : پێویستە بۆ پیاو لە ئاخر زەمانا دینار و درەمی هەبێ تا ئیش و كاری دین و دنیای خۆیی پێ ڕاست بكاتەوە. لەم حەدیسەوە دەرئەكەوێ كەوا ئەگەر پیاوێكی زانا و تەوانا بیری كردەوە لە ژیانی كۆمەڵەكەی خـۆی و تەنانەت لە دوارۆژەكانی ژیانی خۆیشیا دەسی كرد بە كردنی شتێ كـە لەپاش خۆی بەجێ‌بمێنێ و سوودێكی بۆ موسوڵمانان هـەبێ ، ئـەوە پایەیەكی بڵندی دەسگیر ئەبێ لە قیامـەتدا .

ئەگێڕنەوە كەوا ڕۆژێ لە ڕۆژان ( ئەنەوشیرەوان ) ئەچێ بۆ ڕاو . لەڕێدا تەصادوفی پیرە پیاوێك ئەكا خەریك ئەبێ نەمامێكی گوێز ئەنێژێ. لێی‌ئەپرسێ: ئەم نەمامە بە چەند ساڵ دێتەبەر ؟ مامە پیرەیش وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ : بە دە ساڵ . ئەنەوشیرەوان ئـەڵێ : كەواتە تـۆ كە ئەوەندە پیری و لـە مردن نزیك بوویتەوە چ سوودێ لەم نەمامە وەرئەگری ؟ پیرە ئەڵێ : پێشینانی ئێمە درەختیان ناشتوە و ئێمە بەرەكەیمان خـواردوە . ئێمـەیش درەخت ئـەنێژین بۆئەوەی ئەوانەی لەپاش ئێمە دێن‌بەرهەمەكەی بخۆن . ئەنەوشـیرەوان وەڵامی مـامەی پیرەی لا جوان بۆ ، خەڵاتی كرد . پیرە دەستی كرد بە پێكەنین وتی : بەخ بەخ ! درەختی خەڵكی بە دە ساڵ بەر ئەگرێ ، بـەڵام باخەكەی من هـەر لـە یەكەم ڕۆژەوە بەری گرت . ئەنەوشیرەوان قسـەكەی ئەوەندەی‌تر پێ‌خۆش‌بۆ ، دۆبارە خەڵاتی كردەوە . پیرەمێرد دیسانەوە پێكەنی و وتی : باخی خەڵكی ساڵی جارێ بەر ئەگرێ، بەڵام باغی من بە ساڵی دۆ جار بەری‌گرت. ئەگێڕنەوە ئەنەوشیرەوان بۆ جاری سێهەمیش خەڵاتی كرد .

**به هۆش و هیوا و به زانست و كار — بەرز ئەبێتەوە شـەخصی بـەختیار**
**هوشیار كەسێكە دڵی دۆربـین بێ — هۆگر و خـۆگر ئـازا و ئـەمین بێ**
**هیـوا وا ئـەبێ دۆر لـە هـەوا بێ — ڕێكی ئایـین و شـەرعی خـودا بێ**
**لەگـەڵ بـیرا بـێ بیرێكـی ڕەوان — ئـاو بەردا بۆ باخ لـە نیوەشـەوان**
**مەردی هیـوادار زۆر پشـتەسۆرە — بـا لاوازیش بـێ دڵـی ئەسـتۆرە**
**هیـوا بـە وێنەی هـەوای بەهارە — ئـاوی حـەیاتی دڵـی هوشـیارە**
**كێ بـە بێ هیـوا ئـەڕوا بە ڕێـدا — بەردێ لائـەبا لـە ڕێگـەی پێـدا**
**كێ بـە بێ هیـوا تـۆوێ ئـەڕێژێ — یـا لـە باخێـكا داری ئـەنێژێ**
**كێ بە بێ هیوا خۆی ئەدا بـە كوشت — كاتێ پێی ئەمـا ئەڕوا بـە تەنشـت**
**هیـوا چرایە بـۆ مـاڵ و مـەنزڵ — وێنـەی برایـە بـۆ چاری موشكوڵ**

ڕۆژی تاریکێ و تەنگێ سەربسات    دنیایەکی پان دەرئەخا لەلات
بانگ ئەکا لەوەی ناوی ئینسانە    ئەڵێ لای خودا ئیشت ئاسانە
دێنێ بۆ پەردەی دەماخت زۆزۆ    بۆنی نەسیمی ( ولا تیأسوا )
ئەڵێ شەو ئەڕوا و ڕۆژ ئەبێتەوە    غونچە لە باخا ئەگەشێتەوە

★ ★ ★

ئەمەی پێموتێ هیوای مەردانە    ئەمەلی خێری خێرۆمەندانە
هیوایێ نیە ڕۆی لە هەوا بێ    سەری سەرخۆش و چاو لە خەوا بێ
هیوایێ نیە بۆ خۆپەرستێ    شەرەف ڕاکێشێ بۆ خانەی پەستێ
هیوایێ نیە بە خەیاڵی خاو    ئیش بەجێ‌بێڵێ نیوە و ناتەواو
بێ پایەی دنیا و بێ سەرمایەی دین    ببێ بە هاوڕێی لەعنەت و نەفرین
ئەم جۆرە هیوا بە ( علم الیقین )    نە دینی تیایە و نە سەرمایەی ژین

★ ★ ★

بیستومە قەدیم کوردێکی زانا    بۆ خەیاڵ بازان شیعرێکی دانا :
(( شەوگاری پایز قەت بە ساڵ نابێ    ئەبلە بە خەیاڵ قەت بە ماڵ نابێ ))
خەیاڵ بۆ پیرە و پیر لە بۆ ئیشە    ئیش بۆ ڕزگاریێ دەردی تەشویشە
هیوایێ هۆ بێ لە بۆ ڕزگاریێ    دیاریێ خودایە بۆ بەختیاریێ
ئەمەیە دەرسی مامۆستای زانا    هیوا سپێرە بۆ ڕۆژی هانا

★ ★ ★

ئەو هیوا دوورە لە ئادابی دین    وا لەسەر هەوای شەیتانی لەعین
نەك ئەو هیوایە لەسەر یاسای دین    ببێ بە پایە لە بۆ مایەی ژین
ببێ بە ئەساس بۆ کردەوەی چاك    بۆ تێکۆشانی ئینسانی چالاك
بۆ ئاوەدانیێ مەدرەسە و مزگەوت    بۆخەستەخانەی‌ئەوەی ئەخۆش‌کەوت
بۆ خوێندەواریێ نەخوێندەواران    بۆ چارەی کاری ئاوارەی شاران
بۆ ڕێکخستنی دڵ پەرێشانان    بۆ دەس‌بەستنی پەستێ نیشانان
بۆ دەرهێنانی کانی بنی ئەرز    بۆ چەسپاندنی خۆوڕەوشتی بەرز
بۆ ڕێگەی یاسا و نیظامی ئیسلام    لە بۆ دادگا و تەطبیقی ئەحکام
ئەم نەوعە هیوا و طوڵی ئەمەلە    فەرمانی خودای ( عزّ و جلّ )ە
ئادەمی ( ئامێ ) ئەبێ عاقڵ بێ    لە عیلمی حەقدا تەواو کامڵ بێ

# گوڵی پانزەهەم ـ گوڵی ئەخلاقی جوان و پەسەند

بارانی هەوری ڕەحمەت و ئیحسان
کە بارێ لەســەر دەروونی ئینسان
ئەخـلاقی پەســەند لە دڵیا ئەڕوێ
لێوی بێپەروا بە حیــکمەت ئەدوێ

بُعِثْتُ لِاُتَمِّمَ مَکارِمَ الاَخلاقِ

ئادەمیزاد کە بەرزترینی مەخلوقاتی خوایە نرخی بریتییە لەو سوودەی کە هەیەتی بۆ خۆی و بۆ باقی ئادەمیزاد . سوودیش هەمووی بەستراوە بە ئەخلاقی بەرز و بە ڕەوشت و خوی چاکەوە و ئینســانی بەدخو نە خۆی و نە خەڵکی ، کەس سوود لە ژیانی وەرناگرێ .

دینی ئیسلام گەلێ تەعریفی خولقی باش ئەکا . حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : خوای تەعالا بۆئەوەی ڕەوانە کردوم بە پێغەمبەر بۆسەر عالەم کە خولقی باش تەواو بکەم ، یەعنی ئەو خولقە باشــانە دابمەزرێنم کــە لەناو میللەتانی پێغەمبەرانیترا نەبوون . ئەوانەش کە بوون و کەم و کورتییان تیا بوە یا کەم و کورتییان بەسەرا هاتوە تازە و نوێیان بکەمەوە .
بەڕاستی هاتنی حــەزرەتی خاوەنی ڕیسالەت درودی خــوای لێ بێ ئاسوی دنیای گۆڕێ و ئینســانییەت بە هــاتنی ئەو شــێوەیەکی تــازە و جوانی بەسەرا هات، وەك چۆن کە بارانێکی زۆری بەسود بباریٚ بەسەر زەویوزاردا گیاوگوڵ ئەڕوێنێ ، ئەویش وەها عالەمی ڕازاندەوە و هێزی نور و ڕوناکی دەرونی حەزرەت سەلامی خوای لێ بێ ، وەك گڕ لە بەنزین بەربدەی ، وا دڵی خەڵکی بە نوری مەعریفەت هەڵئەگیرساند . ئەو دەشتەکییە دور لە شار و ئاوەدانییانە کە لە هەمو جۆرە زانست و ئوسوڵێکی شارستانەتی بێبەش و بێئاگا بون ، کە بە خزمەتی ئەو ئەگەیشتن حاڵیان ئەگۆڕا و کە ئەگەڕانەوە بۆ ناو خێڵ و هــوزی خۆیان ئەبون بە ئینســانێکیتر . ئەمە هیــچ جێگای سەرسوڕمان نیە ، چونکــە حەزرەت درودی خوای لێ بێ گەنجینەی ئەخلاقی بەرز بوە و بە ڕەوشت و خوی چاك وەکو دەریای بێبەی شەپۆلی داوە . بۆیە خوای تەعالا لەبارەیەوە فەرمویەتی : « وَاِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظيمٍ » . واتە : ئەی پێغەمبەری من تۆ بەڕاستی لەسەر ڕەوشت و خویەکی بەرزی . هەروا خوای تەعالا لە قورئاندا پیشانیداوە کە لەبارەی ڕەوشت و هەڵسوڕانەوە چاو لە پێغەمبەرانیتر بکا و لەمڕوەوە فەرمویەتی : « اولئِكَ الَّذينَ هَداهُمُ اللهُ فَبِهُداهُمُ اقْتَدِهْ » . واتە : ئەو پێغەمبەرانەی باسیان ڕابورد خوا شارەزای کردون بۆ ئەخلاقی چاك و دڵی ڕۆشن کردونەتەوە ، پێویستە لەسەر تۆیش

بکەویتە سەر ئەو ڕێگایەی ئەوانی کەوتوونەتە سەر و هەموو خوڵقە باشەکانی ئەوان وەرگری و دیارە وەریشی گرتوون .

هەر لەبەر نرخ و پایەی ئەخلاقی باشە پێغەمبەر فەرمویەتی : «خِیارُکُم احاسِنُکُمْ اخلاقاً » . واتە : چاترینی ئێوە ئەوانەتانن کە خوو و ڕەوشتیان لەوانی ترتان باشترە . ڕەوشتی باش وەکو باوەڕ بە خوا و بەوانەی باوەڕ پێ کردنیان پێویستە و ، وەك پاکێ و بێ گەردێ لەگەڵ خـوا و ، خۆڕاگرتن لەسەر دەرد و بەلاَ و ، ڕاستێ لەگەڵ خەڵك و ، بەردەوامێ لەسەر چاکە و ، ئارامێ و هێمنێ و ، دڵ فراوانێ و حەوسەڵە و ، شەرم و ، گونجان لەگەڵ خەڵك و ، دەس پێوەگرتن لە خەرج کردندا و ، ڕاگرتنی حەقی خەڵك و ، خۆپاراستن لە حەرام و ، قەدرگرتنی دراوسێ و ، ڕووخۆشێ لەگەڵ خەڵك و ، پاکێ دەم و دەست و دڵ و ، ڕاگرتنی خاوێنێ گیان و جل و بەرگ و ، بەخشش و ، لەبەرچاوبوونی حەقی خەڵك و ، میهرەبانێ و ، بەزەیێ و دڵ نەرمێ و ، دەس پاکێ لەئاست ماڵی خەڵك و ، قسە نەکردن لە پاشملەی خەڵکدا و ، دوورکەوتنەوە لە شوێنێ یا لە شتێ گومانی خراپی لێ بکرێ و ، چاودێرێ مافی خەڵك و ، لە خۆ پرسینەوە و ، خۆ بە زل نەزانین و ، غیرەت و ڕاگرتنی ناموس و ، پیاوەتێ و ، چاو نەترسان و ، پشت بە خوا بەستن و ، قەدری خۆ ڕاگرتن و ، خۆ قورس ڕاگرتن و ، چاوپۆشێ و ، میانەڕەوێ و ، بە کەم ساچاندن و غەیری ئەم خوڵقانە کە زۆرن و لقی زۆریشیان لێ ئەبێتەوە و هەموو بە ڕەوشتی بەرزی ئینسانێ دائەنرێن .

بەرابەر بە هەر صیفەتێکی باش صیفەتێکی خراپیش هەیە کە ڕەذیلەی ئینسانین و ئەبن بەهۆی تێکدانی کۆمەڵ و بڵاوبوونەوەی هەرا و ئاشووب و ، تەنانەت ئەگەر خاوەنی یەکێ لەو صیفەتە خراپانە صیفەتی چاکەشی هەبێ ، صیفەتە خراپەکەی صیفەتە چاکەکەشی بێ نرخ و قیمەت ئەکا . وەکو حەزرەتی پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « الخُلُقُ السَّیِّئُ یُفسِدُ العَمَلَ کَما یُفسِدُ الخَلُّ العَسَلَ » واتە : خو و ڕەوشتی ناشیرین کردەوەی جوانی ئینسان خراپ ئەکا وەك چۆن سرکە ئەگەر بیکەیتە ناو هەنگوینەوە هەنگوینەکە خراپ ئەکا . بۆیە پێویستە ئینسان ئەگەر عیبادەتێکی کرد ئاگای لە خۆی بێ تووشی خۆ بە باش زانین نەبێ و ، ئەگەر کەسێك خزمەتێکی کەسێکی کرد ، بە منەت دانان و سەر کۆنەکردنەوەی بەتاڵی نەکاتەوە .

( بزانن ) خوڵقی چاك یا خراپ لەسەر یەك ئەندازە نیە ، بەڵکو گەلێ پایەی هەیە و هەندێ پلەی بەنیسبەت هەندێ پلەی تریەوە بەرزتر یا نزمترە .

یەکەم کەس لە جیهانا لەبارەی ئەخلاقی بەرزەوە کە یەکە هەڵکەوتی

چەرخ بوە حەزرەتی فەخری عالەم ( محمد المصطفى )یە درۆدی خوای لێ بێ . ئەمەیش بە دەلیلی عەقڵێ و نەقڵێ دەرکەوتوە . پاش ئەو پێغەمبەرەکانیتر سەلامی خوایان لێ بێ ، ئەمجار هەڵکەوتوانیتر لەجیهاندا .

ئەخلاقی باش ، یا خراپ ، بۆ گەلێ کەس هەر بەهرەیە لە خواوە و بۆ گەلێ کەسیتریش بە کەسب و هەوڵدان و پەیداکردنە . بۆ گەلێ کەسیش لە هەردوو جۆرەکەیە .

پێشتر ناوی هەندێ لە ڕەوشتە بەرزەکانمان وت . وا وردە وردە کەمێك بە درێژێ لەسەر هەندێ لەو ڕەوشتانە قسە ئەکەین .

## گوڵی شانزەهەم ـ گوڵی ڕاستێ ( صیدق )

صەد هەزار سەلام لە ڕەهبەری دین
کە ڕاستێ دانا لەبۆ ساغێ دین
وایدانا ڕاستێ یەکەم ڕەوشتە
ڕەهنومای ڕێگەی باغی بەهەشتە

**انّ الصّدقَ یَهدی الی البِرّ و انّ البِرّ یَهدی الی الجنّة .**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خوای لێ ڕازێ بێ ئەگێڕێتەوە کەوا حەزرەت درۆدی خوای لێ بێ فەرمویەتی : ڕاستێ ئادەمیزاد لە قسەدا ڕێگای پیشانئەدا بۆ لای کردەوەی باش و کردەوەی باشیش ڕێگای پیشان ئەدا بۆ بەهەشت . مەبەستی لەوەیە ئادەمیزاد کە دەوامی کرد لەسەر وتنی ڕاستێ لە بارەگای خوادا بە ڕاست و ڕاساڵ ناوی ئەنوسرێ .

بەپێچەوانەی ڕاستییەوە درۆ کردنیش ئینسان ئەخاتە سەر ڕێگای کردەوەی ناپەسەند و ناشیرین و کردەوەی ناپەسەند و ناشیرینیش ئینسان ئەگەیەنێتە دۆزەخ . ئادەمیزاد کە درۆی زۆر کرد و لەسەر درۆکردن بەردەوام بۆ ، لای خوا بە درۆزن ئەنوسرێ . ڕاستێ لە هەرکەسێکدا بێ ئەبێ بە مایەی بەختیارێ بۆی . بە ڕاستێ ئادەمیزادی نەناسراو ئەناسرێ و بێناو ناو پەیدا ئەکا و بێپایە پایەدار ئەبێ و لە ڕۆژی ڕەشا دائەمێنێ و هەمو کەسێ قەرز و قۆڵەی لەگەڵ ئەکا و قسەی لەناو کۆمەڵدا بەنرخ ئەبێ و بە هۆی هاوڕێیەتێ ئەویشەوە خەڵکێ فێری ڕاستێ ئەبن و بەوجۆرە ئەگەر ڕاستێ بەناو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە دنیا پڕ ئەبێ لە فەڕ و پیرۆزێ . بۆیەشە خوای گەورە فەرمویەتی : « یا ایها الذین آمنوا اتقوا الله و کونوا مع الصادقین » . واتە : ئەی ئەوکەسانەی

که باوەڕتان بە خوا هێناوە ، لە خوا بترسن و لەگەڵ ڕاستان بن و ببن بە هاوڕێی ئەوان تا لەوانەوە فێر ببن .

ڕاستەکەی ئادەمیزاد بەهۆی ئامادەیی و قابیلەتی خۆیەوە کەسبی ئەحواڵی هاوڕێی خۆی ئەکا هەرچۆن بێ . جا لەبەر پارێز لە خولقی خراپی خراپەکان و بۆ سوودوەرگرتن لە خولق و خوی ڕاستەکان ، خوای تەعالا فەرمانی داوە کەوا موسوڵمان هاوڕێی موسوڵمانی ڕاست و ڕاساڵ بێ . بە بەراوردی زانا دڵ ڕووناکەکان دەرکەوتووە و ئیسپات بوە کەوا یادکردنەوەی پیاوی ڕاست و دڵ ڕووناك دڵی ئینسان ڕۆشن ئەکاتەوە ، چ جای ئەوە کە ئینسان بە مەحەبەتەوە لەگەڵیا ڕابوێرێ و لەسەر شێوەی ئەوکەسە مەشغوڵی کردەوەی پیاوانە بێ ، تا پێئەگا ، ئەمجار خەڵکیتریش لەمکەسەوە سوود وەرئەگرن .

**ڕۆڵەی عەزیزم ، هوشیاری دڵدار ! بۆ خۆت گوێ شلکە بۆ مەعنای وتار**
**ئەوەی بەڕاستی دەروونی خۆی ڕەشت بە کردەوەی چاك ڕۆیی بۆ بەهەشت**
**ڕاستان بەڕاستی شۆرەت وەرئەگرن لەسەر گەنجینەی شاهان جێئەگرن**
**ڕاستییە بۆ خەیر شارەزات ئەکا لە دەرد و ئازار بێقەزات ئەکا**
**چاکەیش بە وێنەی ڕەهنموونی گەشت شارەزات ئەکا بۆ باغی بەهەشت**

★ ★ ★

**ڕاستان بەڕاستی ئەبنە موستەشار ئەکرێن بە وەکیل بۆ ئیدارەی کار**
**کاتێ زوبانی کەوتە سەر وتار ڕێی دوژمن نابێ بۆ ڕەخنە و ئازار**
**کە بۆ کەس نەکرا ڕەخنەت لێ بگرێ دوژمنی حەسوود لەداخا ئەمرێ**
**هەر بەهۆی ڕاستی لەبەر پیرۆزی ئەگەی بە پایەی بەرزی دڵسۆزی**
**دڵسۆز پیرۆزەی ئەمۆستیلەی ژین دنیا پڕئەکا لە فەڕ و نگین**

★ ★ ★

**ڕاست کرداری خۆی یەکیەك لەبەرە ئەگەر دنیایە یاخود مەحشەرە**
**چون ئاگادارە لە کتێبی خۆی دڵی ناڵەرزێ لە حسێبی خۆی**
**درۆزن کاتێ گەیشتە حیساب ئەکەوێتە ناو دەریایی عەزاب**
**لە ڕاستان ڕاستی ئەوەشێتەوە باریشی لار بێ ڕاست ئەکرێتەوە**
**درۆزن دایم بارەکەی لارە جارێکیش ڕاست بێ بێئیعتیبارە**

★ ★ ★

**ئەو درۆ ئەڵێن جاربەجار فەرزە کردنی هەروەك دانەوەی قەرزە**
**ماوەی ناچاری دیاری کراوە چەند ماددە هەیە ئیزن دراوە**
**ئەنجامی هەموی پاسی ڕاسییە ناحەق لەبۆ حەق حەق شوناسییە**

لەسەر ڕێگای ڕاستگۆیش ڕێ ئەکا    ساتێ پاش و پێش هەر بەجێ ئەگا
بەڵام لەسەر ڕێی قەمچ و پێچ و لار    چاوساغ ون ئەبێ (فی وضح النهار)
گوێمەدەن بەوەی ئەڵێن (بین الناس):    «دنیا بە درۆ و قیامەت بە ڕاس»
ئەو قسە وایە بە ڕۆی حەقناسێ :    « دنیا بە دراو ، قیامەت ڕاستێ »
( دراو ) پارەیە بۆ ژین بەکارە    ڕاستییش لەو دنیا بە ئیعتیبارە
(بایێ) بە درۆ خۆی خەڵتێ ئەکا    درۆزن جارێ قاوەڵتێ ئەکا
کردم بە دەگمەن ئینسانێ دەرچۆ    بە درۆزنێ خاوەن دەوڵەت بۆ
دەوڵەتی درۆ زێڕ و گەوهەر بێ    قەت باوەڕ نەکەی کەوا تا سەر بێ
مادەم کە وایە گوێمەدە بە کەس    بە ڕاستێ بژێ تا ئاخر نەفەس
بە ڕاستێ بنۆ و بە ڕاستێ هەستە    بڕۆ بۆ هەرچێ بە دڵ مەبەستە
عالەم بە ڕاستێ ئەنازێتەوە    عالەم بە ڕاستێ ئەڕازێتەوە
ئەمەیە دەرسم بۆ ڕۆڵەی حەقناس    بژێ بە ڕاستێ بە تەقوا و ئیخلاص
( نامێ ) ئەیەوێ هەتا بۆی بکرێ    بە ڕاستێ بژێ و بە ڕاستێ بمرێ

## گوڵی حەڤدەهەم ـ گوڵی خۆڕاگرتن ( صەبر )

بارانی ئیحسان لە باخچەی یاران
گوڵی ئەڕوێنێ لەبۆ دڵداران
هەرکەس بۆنی‌کرد تا کاتێ ئەمرێ
بۆ خاری گوڵزار بە دڵ خۆ ئەگرێ

الصَّبرُ مِفتاحُ الفَرَجِ

پێغەمبەری نازدار ئەرمۆیەتی : خۆڕاگرتن لەبەر باری قەزای خوادا کلیلی کرانەوەی دەرگای موشکولاتە . ئادەمیزاد کە کەوتە دنیاوە بۆ ژیانی خۆی و بۆ گەیشتن بە دڵخوازی و بۆ سەرکەوتن بە ڕێگای بەختیاریدا ، گەلێ هەوڵ‌ئەدا و بە طەبیعەتی حاڵ هەمۆ کاتێ بە دڵخوازی خۆی ناگا . بەڵکو سەرەڕای ئەوە کە بە دڵخوازی خۆی ناگا تۆشی گەلێ مەینەتیش ئەبێ .

هەروەها ئادەمیزاد یەکێکە لە مەخلوقاتی خوا و لەژێر هێزی تەوانایێ ئەوایە و هەروەکو گەلێ‌جار خوای تەعالا نیعمەت ئەڕێژێ بەسەریا پایە و مایەی پێ‌ئەدا و هۆی خۆشێ و دڵشادێ بۆ جێ‌بەجێ ئەکا و ئەولاد و عەلاقەی باشی بۆ ڕێك‌ئەخا ، گەلێ‌جاریش پایە و مایە و ژن و ڕۆڵە و پەیوەندی خۆشەویستی لێ ئەسێنێتەوە . هەروەکو گەلێ‌جار بە ساغێ و تەندروستێ دڵی خۆش ئەکا ، گەلێ‌جاریش گیرۆدەی ناساغێ و پەرێشانێ ئەکا .

جا ئەوکەسەی باوەڕی بە خوا و بەتوانایی و بە حیکمەتی ئیشەکانی خوا بێ ، پێویستە بۆ نیشاندانی بەندەیی و ملکەچی خۆی هەروەکو ئەو نیعمەتانەی لێ وەرگرتوە ، ئەبێ ئەم زەحمەتانەیشی لێ وەربگرێ ، بەڵکو ئەبێ ئەم زەحمەتانەیش بە ڕەحمەت بزانێ چونکە بەرابەر بە هەمو زەحمەتێ تۆڵە و مزەیەکی میهرەبانانەی لەلای خواوە بۆ دانراوە ، وەکو خوا فەرمویەتی : « وبَشّرِ الصابرینَ الذینَ اذا اصابَتْهُمْ مُصیبَةٌ قالوا انّا للهِ وانّا الیهِ راجعونَ ، اولئكَ علیهِمْ صَلَواتٌ من رَبِّهِم و رَحْمَةٌ واولئكَ هُمُ المُهْتَدونَ » . واتە : مژدەبدە بەو خۆڕاگرانەی لەکاتی مەینەتی ترس و برسێتی و هەژاری و دەرد و مەینەتیتردا خۆیان ڕائەگرن و بەندەیی خۆیان بۆ خوا دەرئەبڕن و ئەڵێن ئێمە هەمو بەندەی خواین و سەرەنجام بۆلای ئەو ئەگەڕێینەوە ، مژدەیان بدەرێ کەوا لەلاینی خواوە ڕەحمەتیان بەسەردا ئەبارێ و شارەزا کراون بۆ ڕێگەی وەرگرتنی ڕەزای خوا .

بێجگە لەم تۆڵەی خێرە ، تەنها باوەڕکردن بەوە کە خوا ئەو ئازارەی ناردوە و خوایش ئەتوانێ چاری بکا و چاوەڕوانی کردنی نیشانەی میهرەبانی خوا لەسەر شێوەی کاری خوا خۆی کە پاش مەینەت خۆشی ئەنێرێ ، ئەمە بە بەندەیی و عیبادەت ئەژمێررێ وەکو حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « انتِظارُ الفَرَجِ منَ اللهِ عبادَةٌ » واتە : چاوەڕوانی کردنی گوشادی و دەرو لێکرانەوە لەلایەن خواوە عیبادەتە و پاداشی چاکی لەسەر ئەدرێتەوە . لە لایەکیتریشەوە لای موسوڵمانان ئاشکرایە کەوا خوا فەرمویەتی : « فَانَّ مَعَ العُسْرِ یُسْراً ، انَّ مَعَ العُسرِ یُسْراً » . هەر لەسەر ئوسوڵی مەعنای ئەم ئایەتەیە و لەسەر باوەڕ بەوە کە پاش هەر ناڕەحەتییەك ڕەحەتی دێت ، حەزرەت فەرمویەتی : « اشْتَدّی ازْمَةُ تَنْفَرِجي » واتە : ئەی تەنگوچەڵەمە تا ئەتوانی توند و ئاڵۆز بە ، چونکە بەتوندی و ئاڵۆزیت ئەکرێیتەوە و ڕزگارمان ئەبێ . هەروا لەسەر ئەم ئوسوڵەشە فەرمویەتی : « منْ صَبَرَ ظَفَرَ » واتە : هەرکەسێ خۆی بگرێ بە مەبەستی خۆی ئەگا ، چونکە لەپاش زەحمەت نۆبەی ڕەحمەتە . بەکورتی صەبر و خۆڕاگرتن لەسەر ئوسوڵی ئیسلام صیفەتێکی زۆر گەورە و بە شانە . بۆیە خوا فەرمانی صەبری داوە بە حەزرەت و پێی فەرموە : « فاصْبِرْ كما صَبَرَ اولوا العَزْمِ منَ الرُسُلِ » واتە : ئەی پێغەمبەر خۆت لەبەر باری گەیاندنی ئاییندا بگرە و بۆ ئازاری کافرەکان تەحەمولت بێ وەك پێغەمبەرە گەورەکانی پێش خۆت خۆیان گرتوە و تەحەممولیان بوە ، چونکە مەبەستی گەورەی پێغەمبەران کە گەیاندنی فەرمانی خوایە بێصەبر و خۆگرتن نایەتەدی .

هەر لەبەر گەورەیی صەبرە ، خوای تەعالا تەعریفی ئەو کەسانە ئەکا کە ئامۆژگاری خەڵك ئەکەن کەوا صەبر بکەن و ، سورەتی (عَصْر)ی ڕەوانەکردوە و

لەو سوڕەتەدا فەرمویەتی سوێندم خواردوە بە پەروەردگاری زەمان هەرچی ئادەمیزاد هەیە هەموان لە زیاندان مەگەر ئەو تاقمە کە باوەڕیان هەیە بە هەرچی خوا فەرمویەتی و کردەوەی باش و بەسود ئەکەن و خەڵکیش رائەسپێرن بۆئەوە کە لەسەر حەق بەردەوام بن و لە بەرابەری ئازار و ئێش و نارەحەتیدا خۆیان بگرن .

بێجگە لەمانە هەر ئینسانێ خۆی بە ئینسان بزانێ ، ئەزانێ بەشی زۆری ژیانی لە ئازار و مەینەتایە . بۆیە مادەم خۆی ڕاگیر نەکا ئەفەوتێ و دۆستانیشی ئازار ئەدا و دوژمنانی شادمان ئەکا . مەردیش ئەوەیە نە ئازاری دۆستی بدا و نە دڵی دوژمنیشی شاد بکا .

بزانن : صەبر لەسەر دۆ جۆرە . یەکەمیان صەبرە لەسەر دەردی دەوامدار وەکو صەبر و خۆگرتن بەرابەر بە دوژمنی بەدئەندێش و بە پایە و مایە کە لاچونی گرانە. ئەم صەبرە بەڕاستی زۆر زەحمەتە و پیاوی خاوەن دەماغ و دڵ و مودارای ئەوێ . دۆهەمیان صەبرە لەسەر ڕوداوێکی نابار وەکو مردنی کەسێکی خۆشەویست یا فەوتانی ماڵێك یا پایەیەك . ئەم جۆرە شتانە شتێکی وەختین ، هەر لە سەرەتاوە ئێشیان زۆرە و کە ماوەیەك بەسەرچو ئەو گڕە و گرپەیەی نامێنێ و ، جەزای خێر لەوەدایە کە ئینسان لە سەرەتاوە خۆیبگرێ و ناسوپاسی بەسەریا نەیەت وەکو پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « الصَّبْرُ عِندَ الصَّدْمَةِ الاولى » واتە : نرخی صەبر لای خوا و قازانجی زۆری دینێ و دنیایی بۆ ئینسان لەوەدایە لە سەرەتای هاتنی مەینەتدا خۆی ڕابگرێ و صەبر بکا ، ئەگینا کە هێرشی لافاو سوك بۆ صەبرکردن ئاسانە .

**ماموستای دڵسۆز دێتە گفتوگۆ — دەرسێکی بەسود دائەدا بۆ تۆ**
**ئایەت و حەدیث فەرمان ئەدەن پێت — فەرزە خۆت بگرێ دەردێ هاتە ڕێت**
**قسەی پێشینان ڕاستە و موعتەبەر — بەراوردکرا ( مَنْ صَبَرَ ظَفَر )**
**حەزرەت کە سەری پێغەمبەرانە — کانی ئەنواری گشت ڕەهبەرانە**
**بە هێزی صەبر و بە قایمی جەزم — بۆ بەسەرداری دەستەی (اولوا العزم)**

★ ★ ★

**هەرکەس خۆی نەگرێ لەبەر گریانا — ڕانەیێ لەگەڵ سینەی بوریانا**
**نە چاوی ئاوی شادێ ئەڕێژێ — نە دڵی تامی مەردێ ئەچێژێ**
**تا ڕەنجێ نەدەی دەسکەوت نابینێ — تا گەنجێ نەدەی صیحەت ناهێنێ**
**یاسای ئەم دنیا وابوە و وایە — کەس بە بێ زەحمەت ناگا بە پایە**
**صەبرە وەسیلەی عیززەت و نەصرە — ئەمە تەفسیری سورەی (والعصر)ە**

★ ★ ★

زەویۤ خـۆی نـەگریۤ لـەبەر بارانا | چۆن بەهـرەی ئەڕوا بەنـاو شارانا
کوێستان زسـتانان جێـگای ئازارە | بۆیە بەهـاران باخچـەی گوڵـزارە
کێوان تا سەرمای زستان نەنۆشـن | بەهاران بـەرگی زمـڕوت ناپۆشـن
تا گـڵ وەرنەگریۤ گـەرمیۤ لە هەتاو | شنۆ لـە شەماڵ ، هێرش لە لافاو
تیایا نـاڕوێ نـەرگس و نەسـرین | دەم ناکاتـەوە گوڵ غونچەی شیرین

★ ★ ★

عەرعەر خۆ نەگریۤ لەبەر بای چەمەن | نابیۤ بە هـاوڕێی داری یاسـەمەن
سەرو و سنەوبەر شۆڕەبیۤ و چنـار | ئەگەر خۆ نەگرن لەبـەر بای بەهار
نایـەن بەیـەکا کـاتی بەهـاران | دەس ناکەن لە مـل بە وێنەی یاران
تـۆویۤ ون نـەبیۤ لـە بێخی چـاڵا | دەرنـایێ لەگـەڵ گوڵاڵـەی ئـاڵا
سێویۤ خۆی نەگریۤ لەبەر سووەیلا | نابیۤ بـە وێنەی سەرگـۆنای لەیلا

★ ★ ★

داریۤ خـۆی نەگریۤ لەبـەر مشارا | نابیۤ بـە صەفحە و نابـریۤ بە شارا
شەمعـیۤ نەسـوتیۤ نـابیۤ بـە چرا | نابیۤ بـە هاوڕێی نـازداری سـەرا
شەو بێـدار نـەبیۤ بـۆ لایـە لایە | دایـە ، پیۤنـاکا ڕۆڵـەی بەمایـە
ئەمڕۆ سبەینیۤ و سـبەی ئەمڕۆیە | گیانی ئەم خەلکەش بە وێنەی تۆیە
ڕۆژیۤ بۆ تۆیـە و ڕۆژیۤ بـۆ ئەوە | یانـیۤ ڕۆژی تۆ لەبـۆ ئەو شـەوە
ئەو بۆ خۆی نەگریۤ بۆ پایە و شانی | تۆ بۆ خـۆت نەگریۤ بۆ جـاویدانیۤ
بـیۤ مەکـەرەوە ئـەم بیـرە چایـە | هەزاران مـار و دۆپشـکی تیایـە
( ثانِي اِثـنَينِ اِذْ هـُما فِي الغَار ) | پێی خۆی دا بە مار لەبۆ ژینی یار
گەلیۤ جیۤ تاریك وەکـو شەوەزەنگ | ڕۆناك بوەوە بیۤصـەدا و بیۤدەنگ
لە جێـی تاریـکا چـاوت نابینـیۤ | فریشتە چـرای نـورت بـۆ دێنیۤ
بۆیە حـەزرەتی ( نبـيّ الرحمـة ) | گەلیۤ جار ئەیوت ( اشتدّي ازمة )
گەر ئەڵێی کێیە گەردۆن سـوڕ ئەدا | چرای پڕتـەودار بۆ مـن هەڵئەکـا
پێت ئەڵێـم خـودای بەتەوانـایە | جیهـان لەلای ئـەو بە وەزنی کایـە
هەزار بەدبەختی کرد بە خاوەنبەخت | کردی بە پادشای خاوەن تاجوتەخت

★ ★ ★

بیۤئومێـد بونـی ئینسان لـە پایە | شێوەی کەسـێکە بیۤ ئایـە و مایە
سا مەگـەر قـەزا وا بـڕیار بـدا | هەڵبێـکی بەسـود بۆ تـۆ ڕۆنـەدا
( لا حـــول ولا قـــوة الا | بـالله العظیـم ، عـز و علا )
باسم لە صەبرە ، زینهار صەد زینهار | لە کاتی نەهـات مەیـەرە هـاوار
لەگـەڵ نەهاتـا پەرێشـان حـاڵیۤ | قـۆرتی نەگبـەتە هاتـوەتە پـاڵیۤ

هاوار لای خودا کاری مەردانە | لەلای ناخودا بۆ نامەردانە
گریان لەلای خەڵك جەزا ئەکا کەم | دوژمنی بەدخوایش ئەکا خاترجەم
بۆ گیانی خۆت و ماڵ و منداڵت | دەردێکی‌ترە هاتوەتە پاڵت
دڵی کۆمەڵی دڵدارانی تۆ | بە وێنەی قیمە ئەبڕێ تۆ تۆ
قەزای ڕابوردوویش ناگەڕێتەوە | جەزای لای خودایش کەم ئەبێتەوە

★ ★ ★

چاکوایە بە دڵ ڕۆ لە خودا بێ | بە سۆزی سینە و دەم بێ‌صەدا بێ
( اِنَّمـا اَشْـكُو بَثّي و حُـزْني | اِلیَ الله كَـیْ یكْشِـفَ عَنّـی )
وا ئەڕۆیتە ڕیز لەگەڵ صابیران | وەها ئەژمێردرێی لە ئەکابیران
باوەڕت بێ صەبر و دڵشادێ | ئەبن بە مایەی پایەی ئازادێ
ئەمەیە فەیضی بارانی بەهار | دەم بکاتەوە غونچە لە گوڵزار
سا بەڵکو ( نامێ ) بە وێنەی بوڵبوڵ | ذەوقێ وەربگرێ لە دیداری گوڵ

## گوڵی هەژدەهەم ـ گوڵی بەردەوامێ لەسەر چاکە

بارانی بەهار هەتا ئارام بێ
چاترە مادەم خاوەن دەوام بێ
ئیستیقامەتە مایەی پیرۆزێ
بۆ ئینسان خۆی و بۆ گەل و هۆزێ

فَاسْتَقِمْ كَمـا اُمِرْتَ

پەروەردگاری جیهان فەرمانی‌داوە بە پێغەمبەری مەزن کەوا بەردەوام بێ لەسەر ڕەوشت و کردار و گوفتاری چاك و لە خۆشێ و ناخۆشێ و لە ساغێ و نەخۆشییا لەسەر ئەم حاڵە بێ نەگۆڕێ و نەلەقێ . ئەمەیە مەعنای ئیستیقامەت کە پێچەوانەی ڕاڕاییە .

ئادەمیزاد یەکەمین یادگاری ڕۆژگارە کە پەروەدگاری جیهان کردوێەتی بە کارگوزار لەسەر زەوێ . یەکەم پایەی ئادەمیزادیش ئەوەیە کە بەر لە هەموو شتێ هوشیار و زانا بێ چونکە لە بێ‌هۆشێ و نەزانێ هیچ سوودێ پەیدا نابێ و لە سەرگەردانێ و پەشیمانێ و ناتەوانێ بەولاوە هیچی لێ ناوەشێتەوە . دوهەم پایەشی ئەوەیە مادەم زانستێکی بەرز و بەنرخی دەسگیر بوو کەوتەکار لەو مەیدانەدا ، لەسەر ئەو کارکردنەی پایەدار و بەردەوام بێ و لا نەدا .

هەر ئیشێ کە سوودێکی تیابێ وەك ئایین‌پەرستێ یا وەك پیشەوەرێ یا بێدارکردنەوەی خەڵك بۆ هەوڵدان و بۆ تێکۆشان بۆ بەختەوەرێ و بۆ دەرکردنی کۆمەڵەی ئادەمیزاد لە نەخۆشێ و گەدایێ و نەزانێ و هەر بەرهەمێکی

بەسوودیتر ، پێویستە ئادەمیزاد لەسەری بەردەوام بێ ، ئــەگینا هەوڵەکەی بێسوود دەرئەچێ .

( ڕوونکردنەوەیەك ) هەر ئیشێ ئینسان دەستی پێکرد ، ئەگەر نەیگەیەنێتە ئەنجامێك زیانی لە سوودی زیاترە . بۆ وێنە خوێندەوارێ لە ئاییندا و تێکۆشان بۆ فێربوونی هونەری تەندروستێ (طب) کە لە بەرزترین زانستەکانی ئادەمیزادن، ئەگەر نەگەنە ئەندازەی خۆیان کۆمەڵەی ئادەمیزاد بەرەو چاڵی مەینەت و مەرگ ڕائەکێشن وەکو مەشهوورە ئەڵێن : « نیوە مەلا دین ئەبا و نیوە حەکیم گیان » .
لەسەر ئەم ئوسوڵەیە کەوا پێغەمبەر فەرمویەتی : « اَحَبُّ الاَعمالِ اِلیَ اللهِ اَدْوَمُها واِنْ قلَّ » واتە پەسەندتر و شیرینترین کــار و کردەوەی چــاك لە بارەگای خوادا ئەوەیە دەوامدار بێ با ئەندازەکەیشی کەم بێ . گــەلێ کەس بە سۆز و ئارەزوومەندییەکی زۆرەوە خەریکی گەلێ ئیشی سوودمەند ئەبن ، کەچێ پاش ماوەیەك لەو کارە دەستبەردار ئەبن و لەبەر ماندووبوونە بێسوود و بەهرەکەی خۆیشیان ئەبن بە دوژمنێکی ناهەمواری ئەو ئیشە کە خەریکی بوون هەرچەند ئیشێکی زۆر بەســوودیش بوبێ . هەر لەبەر ئەم ئارەزوو گۆڕانەیە خەڵــکێ بۆ گاڵتەپێکردن بەوجۆرە کەسە گۆڕاوانە ئەڵێن ( کتێب بۆ ئاخری ئەگیرێتەوە ) .
واتە : کتێب گرتنەوە بۆئەوەیە ئینسان بزانێ سەرەنجامی کتێب بــۆ گیراوەکە چۆنە ، واتە باوەڕ بە تێکۆشانی تێکۆشەرێك ناکرێ مادەم تێکۆشانەکەی تا سەر نەبێ و هەمیشە بەردەوام نەبێ لەسەری .

بۆیە زۆر پێویستە لەسەر ئادەمیزادی هوشیار کاتێ کە ویستی دەسبداتە کارێکی بەنرخ و بایەخدار ، لەپێشاندا بیری خۆی بخاتە کار و سەروبەری ئەو کارە لێكبداتەوە و ڕاوێژ بکا بە کەسانی ژیری ئەو سەردەمە و ئیستیخارەیشی بۆ بکا ، ئەوجا بکەوێتە ناو ئیشەکەوە ، ئەگینا پاشان پەشیمانێ لەدوا ئەبێ وەکو ئەڵێن « سوار بوون عەیبێکە و دابــەزین دوو عــەیب » . قســە قســە ئەهێنێ ڕاوێژکردن و لێكدانەوە لەپێشاندا ، ئەبێ بەهۆی ئەوە کە بنیــادەم نەکەوێتە هەڵەوە و پەشیمانێ بەسەردا نەیەت . زۆر کەســیوا بــوە بێ تــاقیکردنەوە دۆستایەتییان لەگەڵ کەسێ دامەزراندوە ، لەئەنجاما بوە بە مایەی زیان بۆیان . کاری بێسەرەتا و بێلێکدانەوەی ورد هەر لە سەرەتاوە بنیادەم دەستی نەداتێ چاکترە ، وەك کورد ئەڵێن « ناتوانم لە ئەوەڵەوە نەك پەشیمانم لە ئاخرەوە » .

**خانووی بێ سەربان ، باخی بێپەرژین دەرگای بــێ چەپەر زیانــن بۆ ژین**
**نەگبەتە سواری ئەسپی سەرکێش بێ جا نەخــوازەڵلا بێ لەغــاو و زین**

بەڵێ هاتو ئادەمیزاد خوا یارمەتێ دا و کەوتە ناو ئیشی باشەوە و دەوامی لەسەر کرد ، ئەوسا بە هەموو بارێکا بەرهەمی ئەو ئیشەی وەرئەگرێ ، بەتایبەتێ ئەگەر ئیشی دینپەرستێ بێ وەکو خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی : « انَّ

الَّذِينَ قالوا رَبُّنَا اللهُ ثُمَّ اسْتَقاموا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمِ المَلائِكَة » . واته : بەڕاستی ئەوکەسانەی کە دان ئەنێن بە خواپەرستیدا و بە ڕاسـالی لەسەری بەردەوام ئەبن ، ئەوکەسانە لەکاتی تەنگاوی دنیادافریشتەی ڕەحمەت دائەبارێ بەسەر دڵیاندا و دڵیان بە پشتەسـوری بە خودا ڕوونـاك ئەبێتـەوە و لەکـاتی سەرەمەرگدا فریشتە دێتە سەریان و دڵیان بە میهرەبانی خوا ڕۆشن ئەکاتەوە و لە پەریشانی دوارۆژ و لە سەرگەردانی مەحشەر ڕزگاریان ئەکا .

ئەبێ بزانین کە ئیستیقامەت و بەردەوامی لەسەر چاکە کاری زۆری ئەوێ و هەمو کەس لە عوهدەی نایەت . بۆیە لەکاتێکا کە ئایەتی ئەمر و فەرمان بەدەوام ئەهاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ، پێغەمبەر فـەرموی : « شَيَّبَتْنِي هُودٌ » واتە : سورەتی هود پیری کردم . عەرزیان‌کرد : بۆچی ئەو سورەتە پیری کردی ؟ هەڵبەت لەبەر ئەوەیە کە باسی عەزاب و ئازاری کافرانی تیـایە و لە نابارێ و زەحمەتی تاوانباران قسە ئەکا . فەرموی : نەخەیر ، لەبەرئەوە نیە ، بەڵکو لەبەر ئایەتی « فاسْتَقِمْ كَما أُمِرْتَ » کە واتە خوا ئەمر ئەکا پێم بەردەوام بم لەسەر گەیاندنی فەرمانی خوا و بەجێ‌هێنانی دەستور و ڕێ و شـوێنەکانی و ئەوەش کارێکی گرانە و پیاوی لێ‌هاتوی ئەوێ .

زانایان ئەم مەسئەلەیان زۆر بەئەهمیەت تەماشا کردوە و گەلێ لە هۆیەکانی بەردەوامی و ئیستیقامەت دواون و لەئەنجاما دایان‌ناوە کە هۆی دەوام یەکـەم بریتییە لە یارمەتی خوای میهرەبان . دوهەم کەوتنە ناو ئیشەوە و بیرکردنەوە لێی و ڕاوێژکردن بە کەسانی ژیر . سێهەم هاوڕێیەتی ئینسـانی سـاغ و دڵ ڕوناك و زانا . بەم سێ شتە ئینسان ئەتوانێ لەسەر کاری مەردانە بەردەوام و پایەدار بێ .

ئەگێڕنەوە فەقێیەك بوە هەرچەند دەرسی ئەخوێند دەرسـەکەی بۆ لەبەر نەئەکرا و ڕەنجەکەی بێ‌هودە ئەمایەوە . نائـومێد بـو ، ناچار بو دەسـت لە خوێندن هەڵبگرێ . ڕۆژێکیان بە ڕێگەیەکدا ئەڕۆیی ، ڕێی کەوتە کاچێکی بەرز و سەخت . کە تەماشای کرد دیتی ئاوێك لەو کاچەوە دێتە دەرەوە و دڵۆپ دڵۆپ ئەتکێتە خوارەوە بۆ سەر تەختە بەردێکی پان . کەمێ لە تەختـە بەردەکە ورد بوەوە دیتی تەختە بەردەکە بەهۆی ئەو دڵۆپە ئاوانەوە چاڵێکی تیـا پەیدا بوە . زۆر سەری سوڕ ما ئاخو چۆن بەهۆی ئەو دڵۆپە ئاوەوە بـەو نەرمی و ناسکییە ئەو بەردە ڕەقە کون بوە . لەئەنجاما حاڵی بو کەوا بەهۆی بەردەوامی داچۆڕانی ئاوەکەوەیە . لەم بیرکردنەوەی خۆیەوە بێدار بوەوە بۆ حاڵی خۆی و وتی چۆن ئەو دڵۆپە ئاوە بەهۆی بەردەوامییەوە کار لەو بەردە ئەکا و من نەتوانم بەهـۆی بەردەوام بونەوە لەسەر خوێنـدن فێری خوێندن ببم هەرچـەند ڕۆژی یەك وشەیش فێر ببم . گەڕایەوە بۆ خوێندنگاکەی خـۆی و دەسـتی کردەوە بـە

خوێندن و خوایش بەهرەیەکی باشی پێ بەخشی و بۆ بە خوێندەوارێکی باش .
لەمەوە ئینسان بەڕاستی باوەڕ ئەکا کەوا کەس لە بەری کۆشش بێبەهرە نابێ و
بە مەرامی خۆی ئەگا .

ڕۆڵەی هوشیاری پڕ زانست و فام    دەرسم وەربگرە و بڕۆ بە مەرام
ئادەمی نازێ بێ زانست و هۆش    بێهیواو بێکار سەرسام‌و سەرخۆش
ئەوەی بێهۆش و بێبەهرە و کارە    لە هەردوو دنیا هەر شەرمەسارە
هاتو کەوتە ئیش با ئاگادار بێ    ئیشی بەسوودە کە پایەدار بێ
ئادەم بێ‌دەوام بە پایە ناگا    بێ خۆڕاگرتن بە مایە ناگا
پایەی بوڵندی دنیا و قیامەت    بە تێکۆشینە و بە ئیستیقامەت

★ ★ ★

( جوودی ) بە بەرزی و بە پایەداری    بۆ بە ئارامگای سەفینەی باری
پڕتەوی خودا لە طوری سینا    دلی موسای کرد بە صەفحەی مینا
لەبەر دەوام بۆ بە خزمەتکاری    بۆ مەردی خودا بە پایەداری
بۆ ( خلیل الله ) لەبەر ڕاوەستان    کورەی ئاگری کرد بە گولستان
ڕەهبەران هەمو بە ئیستیقامەت    بوون بە مەعدەنی ئەسراری حیکمەت
بۆیە سەرداری زومرەی ڕەهبەران    بۆ بە تاجی سەر بۆ پێغەمبەران
بۆیە خاوەنی مەقامی مەحموود    جارێکیان فەرمووی (شَيَّبَتْنِي هود)
تەقدیسی قورئان بە دینی ئیسلام    لەبەر ئیعجازە بە شێوەی دەوام
دڵی ئەسراری خودا ڕانەگرێ    لەکوێ پڕتەوی صەفا وەرئەگرێ
هەتا بگۆڕێ ڕەنگ و ڕووی ئینسان    ناشێ بۆ جیلوەی پڕتەوی ئیحسان
کە لە ڕەنگ بازێ بەڕاستی دەرچوون    بۆ دڵی دڵدار ئەبنە ڕەهنموون
لەبەر دەوامە قەترەی ئاوی تاف    خەت‌وخاڵ ئەدا لە ڕووی بەردی ساف
یاران مانەوە لە موغارانا    لە تۆفی سەرما و تاوی بارانا
بۆیە لەسەری بەرزی سەماوات    لە سوورەی کەهفا ئەنایان بۆ هات
زیارەتی ئەکرێ مەتحەف لە شاران    لەبەر مانەوەی ئاثاری یاران
لەبەر وەستانە نمێ لە باران    ئەبێ بە گەوهەر ئەبرێ بۆ شاران

★ ★ ★

لە سێ بەردەباز گەر هەڵنەخزێ    یەعنی نەخۆشی و نەبوونی و گزێ
لەسەر پێتەختی سەربەرزی و مەرام    تاج ئەنێیتە سەر بە خۆشی و ئارام
بینای پێشینان کە زۆر مایەوە    ناوی بە گەور کرد دێتە کایەوە
بەرگ و پۆشاکی وا لە بەردەسمان    لەلای گەدامان یا خاوەن دەسمان
ئیستیقامەتە نرخی ئەداتێ    لە هەر بازاڕێ ، لە هەر وڵاتێ

یاری بێوەفــا صــەد کــە زێبــایە لەبــۆ دڵــداران مایــەی جەفایــە
مێــژوی بێوەفا پڕ لــە نەفرینــە هێ وەفــاداریش هــەر ئافــەرینە

★ ★ ★

کاکە بەکــورتی سەربەرزی ئــادەم بە ئیســتیقامەت دێتەدی هــەردەم
بۆیــە عاریفــان ئەپارێنــەوە لــە ئیستیقامــەت نەکەرێنــەوە
هەتا بە شــادی لــە ( دار البقــا ) بگەن بــە بەهــرەی ئەنــواری لیقا
ئەمەیە دەرسی مامۆستای ( نامی ) ئیستیقامــەتە مایــەی ئــارامی

## گوڵی نۆزدەهەم ـ گوڵی ئارامی

ئەو هەورەی مەنگ بێ پڕە لە باران
پڕ ئەکا لە فەڕ دەشــت و کۆساران
خۆزگەم بەوکەســەی لە خۆدا مەنگە
کرداری بــەرز و بــە تــام و ڕەنگە

پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی :

العَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطانِ

واتە : پەلە لە شەیتانەوەیە .

ئارامی بریتییە لەوە کە ئینسان لە وتار و کردەوەدا لەسەرخۆ و هێمن بێ. ئەم خووە گەلێ خزمەت بە ئادەمیزاد ئەکا لە ماوەی ژیانیا . هەرکــەسێ ئــەم خووەی ببێ بۆی ئەبێ بەهــۆی ئاســایش لە خۆیدا و لەنــاو هــۆز و نەتەوە و هاونیشتمانانیا و ئەبێ بە قەڵایەکی قایم بۆ پارێزگاری هەمویان . بەپێچەوانەی ئەمەوە هەرکەسێ خوی لەسەر پەلەپەل و هەڵەیێ و بێئــارامی بێ هەمیشــە ئیشی ناتەواوە و خۆی و پەیوەندی لە ئازاردان . هەروا ئادەمیزادی سەرچڵ و پەلەپەلکەر ، بۆ خۆی و پەیوەندی زیانە و بۆ خەڵکیش هەر ئەبێ بە مایەی زیان، چونکە گەلێ ئیشی بەسود هەڵئەکەوێ ئەو مەیدانی ئەوە نادا خەڵکیتر بیکەن و سودی لێ وەربگــرن و خۆیشی وای‌نــاکا سود و کەڵکی ببێ . لــەم جۆرە وەزعە نابارەدا چەند کارەساتی پڕ لە ئاشوب و هەرا ڕوئەدا . جا لەسەر ئــەم بینــاغەیە پێغەمبــەر درودی خــوای لێ بــێ فەرمویــەتی پەلەپەلکردن لــە شەیتانەوەیە ، واتە خوی ناشیرینی پەلەپەل کردن لەئەنجــامی وەسوەســەی شەیتانەوەیە کە دێ بۆ ئادەمیزاد ، یاخود ئەم خووە ناپەسەندە کاڵای شەیتانــە بە باڵای ئادەمیزادی ئەبڕێ .

خوی ئارامی لە هەمو کات و شوێنێکدا و بۆ هەموکەسێ و بەرابــەر بــە هەموکەسێ باشە . بەڵام لە گەلێ کاتا و لە گەلێ شوێنا بەسودترە . یەکــەم :

بەرابەر بە ئادەمیزادی بەدەست بەتایبەتی ئەگەر ستەمکار و بەدخو و بەدسروشت بێ ، چونکە بەرابەر بە ئینسانیوا هەڵە و پەلە گەلێ زیانی لێ ئەوەشێتەوە . دوهەم : بەرابەر بە یەکێ کە ئیشی ئینسان لەژێردەستیا بێ یاخود مامۆستای دەرس پێوتنی ئینسان بێ . سێهەم : بەرابەر بە ئینسانی نەفام و هەرزەکار چونکە هەڵە و پەلەی ئینسان بەرابەر بەوکەسانە ئەبێ بەهۆی ئاشوب لە وڵاتدا . چوارەم : بۆ ئینسان خۆی بەرابەر بەو ئیشانە کە تۆزێ غامیض و تاریکن . ئەمجۆرە ئیشانە ئەبێ بە ئارامێ چاربکرێن و ، پێویستە ئینسان بەرلەوەی دەست بە چارەیان بکا باش تەماشای هەمو ئەو شتانە بکا کە لەو ئیشانەوە پەیدائەبن و سەنگ و سوکییان لێكبداتەوە، بۆیە حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی هەرکاتێ ئیشێ هاتە پێش ئینسان ، بەرلەوەی ئیشەکە بکا بڕوانێ بۆ ئەنجامی ئەو ئیشە .

پێنجەم لە وەڵامی کەسێکا کە پرسیارێکت لێ بکا ، پێویستە هەرکاتێ ئینسان پرسیارێکی لێ کرا ، بەرلەوە کە وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە باش لە وتار و وەڵامەکەی کە وا لە دڵیا ورد ببێتەوە بۆئەوە کە بە بێسود نەبێ بە داوی قسەی خۆیەوە و نەکەوێتە ناو ئیشی هەڵەوە . مەشهورە حەزرەتی عەلێ خوای لێ ڕازێ بێ فەرمویەتی هەرکەسێ بتوانێ چوار خو لە خۆی دور بخاتەوە ، ئەوە شایانی ئەوەیە کە گیرۆدەی خراپە نەبێ . یەکەم جەدەل و دەمبازێ و زماندرێژێ . دوهەم پەلەپەل کردن لە ئیشا . سێهەم تەمەڵێ و ئیش نەکردن . چوارەم بەخۆدانازین . ئەنجامی دەمبازێ سەرگەردانییە . ئەنجامی پەلەکردن پەشیمانییە . ئەنجامی تەمەڵێ داماوییە . ئەنجامی بەخودا نازین ئەوەیە کە ئینسان لە کومەڵا سوك و بێنرخ ببێ . بێجگە لەمانە زوربەی ئەو ئیشانە کە بە پەلە کراون باش دەرنەچوون ، چونکە ئیشی پەلە لەگەڵ تێفکریندا نیە و هەر کارێ ئینسان لە سەرەتادا وردی نەکاتەوە بێسەروبەر ئەبێ .

**ڕۆڵەی عەزیزم ، هەی نازدارەکەم !     دەرمانی دڵەی بریندارەکەم !**
**ئەگەر ئەتەوێ بژیت بە مەرام     کار و وتارت ئارام بێ ئارام**
**پەلەپەل مەکە لە واتە و ئیشا     خۆت مەدە بەسەر تیری تەشویشا**
**باران بەئارام بڕژێتە زەوێ     ئەبێ بە بەهرە بۆ بەرز و نەوێ**
**پڕ ئەکا لە فەڕ سەراسەر دنیا     چ بۆ کشتوکاڵ چ باخ چ گیا**
**ئادەمیزادیش وێنەی بارانە     مادەم ئارام بێ فەڕی جیهانە**
**ئینسانی هەڵە و پەلەپەل کردو     خۆی و هاودەمی ئەفەوتێنێ زو**
**ئیشی پەلەپەل شێوەی شێتانە     بنکەی دەرسەکەی لەلای شەیتانە**
**ئەوەی نایەوێ توشی نەگبەت بێ     پێویستە ئیشی لەسەر مۆڵەت بێ**
**مەبەست دێتەدێ بە پلەپلە     پلە مۆڵەتە نەك پەلەپەلە**

بەماوەی شەش ڕۆژ خوای پەروەردگار    دنیای دروستکرد بو ژین و ژیوار
منداڵ کە داکەوت هاودەمی شیرە    لەپاش هەژدە ساڵ هاودەمی تیرە
بەڵێ ئەو ئیشەی بۆنی بە هەلە    کەمەندی کێشی بە پەلەپەلە

★ ★ ★

ویستت قسەیەك گەر بکەی بەیان    یەکەم تێفکرە بە وردێ جوان
مەکینەی وردیت کە هێنایەکار    بۆ سوود و زیان ئەبێ بە میمیار
جا بەقەد پێویست بێژە گفتوگۆ    هەر حەرفێ صەرفێ دەرئەخا بۆ تۆ
کە چۆی بە ڕێدا ئاگات لە ڕێ بێ    بیری بەرودوای پێکانت پێ بێ
ڕێگا ڕۆیشتن بە ئەمن و ئەمان    ئەمنایە لە بۆ ( عِبادُ الرَّحمان )

★ ★ ★

لە کردەوەتا بە تەئەممول بە    لەکاتی ئیشا بە تەحەممول بە
واتە و کردەوە بە پەلەپەل بێ    لە دەدا هەشتیان ئەبێ موختەل بێ
وتار و ڕەفتار ئەگەر ئارامێ    بەردی بناغەی خانۆی مەرامێ
خەڵکێ لە مەعنا تێشەفکرێن ورد    ناڵێن بە چەند سات ئەو قسەیە کرد
نەظەرگای عالەم هەندەسەی ماڵە    ناپرسن بینا کاری چەند ساڵە
بە ماوەی دە ڕۆژ تیپی پەلەوەر    باڵ ئەگرنەوە هەڵئەفڕێن بۆ دەر
منداڵ بە دوو ساڵ دەست و پێ ئەگرێ    بە سێ ساڵ بە عیلم دنیا دائەگرێ

★ ★ ★

لەسەر بەراورد بەرگی نەگبەتێ    تەمەڵێ و پەلە تان و پۆیەتێ
تەمەڵێ مەکە و پەلەپەل لابە    ئەم جارە ئیشت ڕۆ لە صەوابە
هێمنێ فەرزە بۆ تۆ لە چەند شوێن    ئەگەر حەز ناکەی لە شەڕ و لە جوێن
یەکەم کە لەگەڵ کەسێکی نەفام    ئەبێ بە هاوڕێ و هاودەنگ و مەقام
نەفام بەردێکە وا لەناو ئاوا    کە پێت هەڵخزا ئەڕۆی بەناوا
دووهەم کە قینی هەستێ ستەمکار    هێمنێ فەرزە بۆ مەردی هوشیار
ستەمکار عەینەن وێنەی لافاوە    خۆی لائەدا لێی هەرکەسێ پیاوە
خۆتی لێ لادە تا دێت و دەڕوا    بۆئەوەی نەچێ بە زایە هەروا
ئارامێ ئینسان بەرەوڕۆی بێداد    بەختیارییە بۆ ئادەمیزاد
سێهەم ئەوکەسەی سەرۆکی تۆیە    هەر ڕۆژێ بۆ تۆ کاتێکی نۆیە
بە ساتێ گونجان خۆت ڕزگار ئەکەی    ئەم خەڵکەیشی لێ خەبەردار ئەکەی

★ ★ ★

بە مۆڵەت لەبەرد دروست ئەکرێ جام    بە زەحمەت ئۆممەت ئەگا بە ئەنجام

ئەو سەرقافلـەیەی بەمۆلەت ئەڕوا — ئەشـگاتە شـار و دیتیشـەوە دوا
بەلاّم ئەوکەسەی کـەو یەلفار ئـەکا — ناگا و چەنـد پشتیش برینـدار ئەکا
ئەمە بۆ دەرسی ( نامێ ) بۆ ئـەییام — هـەر زۆلەی هێمن ئـەگا بە مەرام

## گوڵی بیستەم ــ گوڵی بەراورد و لێکدانەوە

لە بارەگای پـاك زاتی ( ذو الاکرام )
ئەڕژێتـە سـەر دڵ بارانی ئیلهـام
ئەڵێ ئەی بەنـدەی بـەختیاری ورد
دەست مەکە بـە ئیش بە بێ بەراورد

پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ فەرموێەتی :

**التَّدْبِيرُ نِصْفُ المَعِيشَةِ ، والتَّوَدُّدُ الى النـاسِ نِصْفُ العَقْـلِ ، والهَمُّ نِصْفُ الهَرَمِ .**

واتە : تێفکرین لە ئەنجامی ئیش‌وکار نیوەی گوزەرانە و خۆ خۆشەویست کردن لای خەڵك بە ڕەفتار و کرداری باش بەشێکە لە هوشـیاریێ و خەفەت خواردنی بێ‌سوود نیوەی پیریە .

ئەم فەرموده بەرزە دەرسێکی بەسودە بۆ ئینسانی بەختیار چونکە ژیانی ئینسان بێ‌تێکەڵێ لەگەڵ خەڵك نابێ و ئینسان بە تەبیمەتی حاڵ ئەگەر لەپێش دەست کردنەوە بە ئیش ورد نەبێ و ئەنجامی کارەکەی لێك نەداتەوە ، تۆشـی گەلێ کۆسپ ئەبێ . ئەو کۆمەڵە ئادەمیزادەی کە ئینسـانی تیا ئەژێ ، ئەگـەر ئەو ئینسانانە لەگەڵیا ڕێ‌نەکەوێ و بە خۆ و ڕەوشتی چاك خۆی تیا خۆشەویست نەکا و خۆی نەباتە پێشەوە ، ئیشی بۆ ناکرێ تیایدا و هەر بەهرەیێکی کۆمەڵایەتێ بێ هەمۆی بەزایە ئەچێ و سۆد لە خـۆی نـابینێ . کەواتە پێویسـتە خۆی وردببێتەوە و ڕاوێژ بە زانایانی سەردەمەکەی بکا و ، بەهۆی بەراورد کردنـی ئەفرادەکانی ئەو کۆمەڵەوە کە تیا ئەژێ و لەگەڵیـانا بەسـەر ئەبا و بەهـۆی بەراوردکردنی ئەو ئیشانەوە کە ئەیەوێ بیانکـا ــ ڕۆنـاکێ بدا بە دڵی خـۆی بۆئەوەی بە چاوڕۆنییەوە بکەوێتە ئیشەوە و بڕواتە نـاو کۆڕی تێکۆشـەرانی ڕێگای ژیانەوە .

بەراوردکردن یەکە هۆیە بۆ بەرچاوڕۆنی ئادەمیزاد ، چونکە ئەگەر ئینسان خۆوڕەوشتی کۆمەڵەیـەك نەزانێ نـاتوانێ ببێ بە هـاوڕێیان و پێـی نـاکرێ خزمایەتییان لەگەڵا بکا و پەیمانیان لەگەڵدا ببەستێ . گەلێ‌کەس هەن لە دۆرەوە بەشۆرەت و دەنگ‌وباس باشن ، کەچی لەپاش بەراوردکردنیان بە غـەیری ئەو

وەزعەی پێیت ناسیون ، بۆت ساغ ئەبنەوە . بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموێەتی : « وجدت الناس اخبر تقله » . واتە : وام بۆ دەرکەوتوە گەلێ کەس هەن ئەگەر بەراوردیان بکەی بەهۆی هەندێ ڕەوشتی ناپەسەندیانەوە دڵ زویر ئەبێ لێیان .

**دەخیل بە داهۆڵ قەت غـەڕە نەبێ بە دەنگی دەهۆڵ دەسخـەڕە نـەبێ**
**هەتـا نـەزانی ئـەوزێ بـە هێزە ئاشنـای پـاچ و پێمـەڕە نـەبێ**

بەراورد زۆر بەسودە ، چونکە ئەبێ بەهۆی ئەوە لە کاکڵەی مەبەستەکەت بگەیت . بەراورد بەکار ئەهێنرێ بۆ خواردن و نوستن ، بۆ پیشە و کار ، بـۆ خزمایەتی ، بۆ ئاڵوویێل کردن لەگـەڵ تەنهـا کەس و لەگـەڵ کۆمەڵـدا ، بـۆ پەنابردنە بەر دوکتۆر لە دیاریکردن و چارکردنی ناساغیدا ، بۆ سەفەر لەگەڵ کردن ، بەتایبەتی بۆ پەیمان بەستن لە کاری گرنگ و ئەنجامدارا . گەلێ کـەس ئەکەی بە یـار و دڵدار و هاوقەتاری خۆت و وای تێئەگەی کەوا گیانی خۆیت لەپێناودا بەخت ئەکـا ، کەچی هەر ئەوەنـدە تەمـاعێکی خرایـە بەردەم وای بەسەردێ وەکو بەدرێژایی عومری نەیدیبێ . بۆیـە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموێەتی : « وَجَدتُ النّاسَ کَابِلٍ مِئَةٍ لا تَجِدُ فیها راحِلَةً » واتە : وام بۆ دەرکەوتوە کەوا کۆمەڵی ئادەمیزاد وەك کۆمەڵێ حوشـتر وایـە وشتری بە هێز و هەڵمەت و لەکارنەکەوتـوی تیـا نەبینـێ کە بۆ کـارپێکردن بشێت . بەڕاستی ئەم فەرمودەیە دەرسێکی زۆر بەرز و بەسودە و پێویستـە ئادەمیزاد کەڵکی لێ وەربگرێ .

زیاتری کاتی دەرکەوتنی ئەنجامی بەراورد سێ کاتە . یەکەم : کاتی تەماعی دنیـا . دوەهەم : کاتی ترس . سێهەم : کاتی هێرشی قین . هەرکەسـێ لـەم سێ کاتەدا بەرچـاوی ڕون بێ و خـۆی لێ ون نەبـێ ئەوە ئینسـانی تەواو و برادەری ڕاستەقینەیە . هەندێ لە زانایان وتویـانە بەراوردی برادەری سـاغ بەوە ئەکرێ کە لەکاتی داماوێ و پەككەوتنتا دەسبەردارت نەبێ و دەسگرۆییت بکا ، وەکو وتراوە :

**کـاتی دامـاوێ و کـزێ و بێشـانێ**
**بـاش حـاڵێ ئەبـێ لە بـرای گیـانێ**

ئەم قسەیە دیارە ڕاستە ، بەڵام نیشانە پێشوەکان بەسن بۆ دیاریکردنی برادەری ڕاستەقینە و ئینسـانی ساغ ، چونکە برادەرێ کە بەرابەر بە تەمـاعی دنیا و ترسی گیان و لەکاتی شەپۆلی ڕق و قیندا لەسەر پەیمان بمێنێ ، دیـارە لەکاتێکیشا کە کز و داماو بێ و پەکت بکەوێ دەستبەردارت نابێ .

(بۆئاگاداری) . بەراوردی تەواو کاتی زۆری ئەوێ. ئەو بەراوردەی سودی

بۆ ئێمە ببێ ، یا ئەبێ لە بەراوردی پێشینان وەریبگرین یا ئەبێ بە بەراوردێکی کەم بساچێنین . پیاوێ چۆ بۆ خزمەتی حەزرەتی عومەر خوای لێ ڕازێ بێ لە مەسەلەیەکدا شایەتێ بدا . حەزرەتی عومەر لێیپرسی : تۆ دراوسێی ئەو کابرایەی ؟ وتی : نەخەیر . پرسێ : ئەی سەفەرت لەگەڵدا کردوە ؟ وتی : نەء. پرسێ : ئەی مامەڵەت لەگەڵدا کردوە ؟ وتی : نەء . فەرموی : کەواتە بڕۆ تۆ شارەزای ڕەوشتی ئەو کابرایە نیت . لەبارەی پێویستێ کاتێکی زۆرەوە بۆ بەراوردێکی تەواو ، سەعدێ شیرازێ فەرمویەتی :

**ئینسانی ژیر و بە ویڵ و کەماڵ — دۆ عومری ئەوێ هەریەکێ صەد ساڵ**
**لە یەکەمیانا بەپێی بەراورد — لە چەرخی زەمان تێبفکرێ ورد ورد**
**لە دۆهەمیانا بەپێی مەعلومات — بەجێی بهێنێ بۆ هات و نەهات**

بەکورتێ هەرچەند ئادەمیزاد لە عومری خۆیا بە هەمۆ دڵخوازی خۆی ناگا، بەلام هوشیارێ و ئاگادارێ و بەراورد بەقەدەر حاڵ گەلێ بەسۆدە چ بۆ ئینسان خۆی و چ بۆ هاونیشتمانانی .

(بێدارێ) هەرچەند لەسەر بەراورد ، تەنیا کەسێ یا کۆمەڵێ کە لە بەراوردا دەرچن ، زۆر کەمە و بە چەند ساڵ ئەمە بۆ ئینسان ڕێناکەوێ ، بەلام مەبەست ئەوەیە تا ئەندازەیێ بۆی ڕێبکەوێ ڕەفتار بەگوێرەی بەراورد بکا باشە و لە بەراورد کراوەکانیشا زۆرباش و مامناوەندێ و پاشکەوتۆیش هەیە. جا تا زۆر باش دەست بکەوێ نابێ ئینسان ڕۆ لە مامناوەندێ و لە پاشکەوتۆ بکا. ئەوەیش پێویستە کە بزانین ئەبێ ئادەمیزاد هەمیشە چاوپۆشێ هەبێ ، ئەگینا لەگەڵ باوك و دایك و برا و خوشك و کەس‌وکاریشیا هەر بە دڵخوازی خۆی ناگا .

**ڕۆڵەی عەزیزم ! بە بیرێکی ورد — بڕوانە بۆ ڕۆژ لەسەر بەراورد**
**هەتا تێبگەی لە وەزعی جیهان — تا دەرکەوێ بۆت ئەسراری پەنهان**
**ئەوەی ئەیبینێ بە بینایێ چاو — هەر ڕۆی ئەمدیوە نەك ڕۆی دیوی ناو**
**ئەودیو تێئەگەی بە بەڵگە و دەلیل — بە بەراورد و تەمیز و تەحلیل**
**لەسەر تێکەڵێ و مامەڵەی بازاڕ — بە دراوسێتێ و سەفەر و ئازار**

★ ★ ★

**دایەن ئەزانێ سروشتی منداڵ — هاوماڵ تێئەگا لە حاڵی هاوماڵ**
**لە بەهارانا کێو و دەر و دەشت — بە گوڵ و گوڵزار ئەبێ بە بەهەشت**
**مەرج ئەوەتانێ کە مانگی ئەیلۆل — نەبێ بە گەرد و تۆز و تەمەڵۆل**
**هەتا سەربەرزی ، برا برایە — بۆ ڕۆناکێ تۆ وێنەی چرایە**
**کاتێ سەرکز بۆی برایێ ئەبڕێ — پێیبکرێ ئەڕوا وەك بە باڵ بفڕێ**

★ ★ ★

که لێت‌هەڵسوڕا چەرخی زەمانە  بڵاوە ئەکەن ئەو برایانە
دنیای گوشادت لەسەر تەنگ ئەبێ  ڕۆژت بە وێنەی شەوەزەنگ ئەبێ
نە دۆست نە برا نە ئاشنایە  نە کاکە کاکە و نە ( مەولانا )یە
ڕەحمەت لەوکەسە بەڕۆی حەقیقەت  فەرموی بەشێوەی طەوری طەبیعەت
شەو حاڵێ ئەبێ چرا لەکوێیە  شەڕ حاڵیت ئەکا هاوبەشت کێیە

★ ★ ★

کەواتە فەرزە بەراوردی مەرد  بۆ فەرقی ڕێوێ و شێرانی نەبەرد
هەرکەسێ کوڵك و مۆ شێ کاتەوە  کایێ بە کێوێ لێك‌بداتەوە
هەتاکو ئەمرێ نابێ بە ئینسان  تۆ چۆن دای‌ئەنێی بە خاوەن ئیحسان
بەڕاستێ جیهان خەرمانی کایە  کەمێکی ساغە و ئەوی‌کەی بایە

★ ★ ★

بەڵێ نایابە پیاوی بێ نوقسان  وەکو نایابە ئیخلاص و ئیحسان
کەس نیە بەشێ نوقسانی نەبێ  لە ڕۆژی ڕەشا ترسانی نەبێ
کەماڵ ئەوەیە صوڕەت و سیرەت  هەردوو تەواو بن لەسەر بەصیرەت
ئەویش ڕەهبەری فەردی مەعصومە  کە لەلای خودا وەزعی مەرسومە
کەوایە نیسبەت لە واجباتە  پایە ڕاگرتن لە موهیمماتە

★ ★ ★

برایێ بێ و باوەڕی چا بێ  پایەی پیاوەتێ و فەڕی باڵا بێ
ئەوە لە عورفا پیاوی زەمانە  شایانی شکۆ و مەرتەبە و شانە
لە خوی شیرینە دڵ و دەم پاکێ  وەفا و ئینساف و ناوچاو ڕۆناکێ
ئەمەیە بۆ تۆ ڕێکەوتی ئیمکان  لَيسَ في الامكانِ ابدَعُ مما كانَ
وەرنە گەر دۆستی زۆر ڕاست ئەوێ  یاری بەوەفا و ئیخلاصت ئەوێ
بێ بە فیدای بەژن و باڵای تۆ  ڕاوەستێ لەلای سایەی ئالای تۆ
بە پێ بگەڕێی ئەم ڕوی دنیایە  دەستت ناکەوێ هەتا هەتایە
ڕەهبەری نازدار سەرچاوەی ئەنوار  سەلامی لێ بێ هەزاران هەزار
ئەمەی فەرموە بۆ دەرسی هوشیار  بیکا بە سەرمەشق لە ڕۆی ڕۆژگار
وا حاڵێ بووم ئەم خەڵکە وەهان  زۆر لە یەك جیان ئاشکرا و پەنهان

★ ★ ★

جا ئەبێ ئینسان دڵی گوشاد بێ  بە یاری ( لاباس ) دەروونی شاد بێ
پێویستە ئینسان کە خەتاپۆش بێ  بۆ باسی ئولفەت زۆر جەفانۆش بێ
وەفا ڕابگرێ بە قەدری ئیمکان  چ بۆ حاضران چ بۆ غائیبان

| | |
|---|---|
| بۆ غائیب نامە و دیاریَ و دیدار | بۆ حاضر لوطف و شیرینیَ ڕەفتار |
| کاتیَ نەخۆشکەوت زۆ بڕۆی بۆ لای | هاتوکۆچیکرد حاضر بیَ لەدوای |
| موشکیلیَ ڕۆیدا لەلای حازر بیَ | بۆ ئەمانەتی بە دلّ ناظر بیَ |
| بۆ پاشکەوتوان هەرچەند بۆت ئەکریَ | خزمەتیَ بکە کە جێگە بگریَ |
| لەکاتی باسا چیت بە باش زانیَ | ئەوەی باس بکە هەتا ئەتوانیَ |
| دوعای لیَخۆشبۆن خیتامی میسکە | برا وانەبیَ بە وێنەی نیسکە |
| ئەمەبۆ دەرسی ( نامیَ ) بە وردیَ | مەردی ئەگەر زۆ لە بەراوردی |

## گولّی بیستویەکەم ـ گولّی دۆربینیَ

خوا بە سورمەی فام دلّیَ بڕەژیَ
ئەو دلّە ئەوزاع پوختە ئەبێژیَ
بێجگە لەو چەرخەی کە تیایا ئەژیَ
بۆ پاش مردنیش درەخت ئەنێژیَ

پێغەمبەری نازدار فەرمۆیەتی :

**إذا ماتَ ابنُ آدمَ انقطعَ عملُهُ إلا مِنْ ثلاثٍ ، صَدَقةٍ جاريةٍ ، وعِلمٍ يُنتفعُ بهِ ، أوْ ولَدٍ صالحٍ يدعُو لهُ .**

واتە : کە ئادەمیزادی موسولّمان کۆچی دوایی کرد ، پاداشی کرداری ئەبڕیَ و هیچ خێرێکی بۆ نارۆا لە یەکیَ لە سیَ ڕێگاوە نەبیَ . یەکەم : خێرێکی نەبڕاوە کە پاش مردنیشی پایەدار و بەردەوام بیَ . دۆهەم : زانستیَ کە لە ماوەی ژیانیا بە دەرس بە موسولّمانانی گەیاندبیَ و ئەوان پاش ئەو کەلّکی لیَ وەربگرن . سێهەم : کوڕێك یا کچێکی چاك و کردار پاکی لەپاش بەجیَمابیَ دوعای خێری بۆ بکەن و لە خوا بپاڕێنەوە بۆی کە بیبۆریَ و لیَی خۆش بیَ .

با لەم شوێنەدا کەمێك لە وشەی ( صَدَقَة جارِيَة ) ورد ببینەوە کە واتە خێری نەبڕاوە ، تا حالّیَ ببین کە خێری نەبڕاوە لقی زۆری لیَ ئەبێتەوە .

یەکەم زیندۆکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر درۆدی خوای لیَ بیَ ، یەعنیَ لە چەرخێکدا کە سوننەتی پێغەمبەر هەندێکی فەرامۆش کرابیَ و ، یەکیَ ببیَ بەهۆی زیندۆ کردنەوەی ئەو سوننەتە فەرامۆش کراوانە و هۆی جیَبەجیَ کردنیان ، ئەوە ئەوکەسە تا ڕۆژی قیامەت لە خێری هەمۆ ئەو کەسانەدا خاوەنبەش ئەبیَ . بۆنمۆنە وەکو نوێژی شەونوێژ کە ئیستا لە گەلیَ شوێندا پشتگویَ خراوە و ناوی نەماوە ، یا وەك بەکارهێنانی سیواك لەپێش نوێژ کردن

یا لەکاتی نوێژ دابەستنا کە ئیستا زۆر کەم بوەتەوە ، یا وەك نوێژی چێشتەنگا ( صلاة الضحی ) و ، نوێژی بەینی مەغریب و عیشا ( صلاة الاوابین ) و ، وەکو دانیشتن ڕۆ بە قیبلە لەبەینی بەرەبەیانو ڕۆژهەڵاتندا و لەبەینی ڕۆژاوابون و نوێژی نوستنانا و ، وەکو قورئان خوێنـدن لە هەمو ڕۆژێکا و ، وەکو قورئان فێرکردن بەمنداڵ کە ئیستا تەنها لە چەند جێگایەك بایەخی ئەدرێتێ .

لە بابەتی ماڵ و پارە خەرج‌کردنیشـدا وەکو وەقف کردن بۆ مزگـەوت و قوتابخانەی ئایینێ و خزمەت‌کردنی ئەوکەسانەی چـویان نـابینێ و ئەیـانەوێ قورئان لەبەربکەن و ، وەکو هەوڵدان بـۆ کوژاندنەوەی هەرا و ئاشوب لەنێوان موسوڵماناندا و ، وەکو یارمەتی‌دانی پیـاوی بەشەرەفی لێ‌قەوماو .. ئەمانە هەمو بەر صەدەقەی نەبڕاوە ئەکـەون . واتە با ئەسـڵی ئیشـەکە خۆیشی ببڕێتەوە ، تازەکردنەوەی ئەم ئوسوڵانە کە بەشێکن لە ئـادابی موسوڵمانەتی ، ئەبێ بە صەدەقەی نەبڕاوە . جا ئەگەر موسوڵمانێکی خاوەن دەست یا کۆمەڵە موسوڵمانێکی بەحورمەت یارمەتی یەکتری بدەن بۆ زیندوکردنەوەی ئەم ئادابانە ئەوە خێرەکەیان نابڕێتەوە .

تەماشاکردنی ئەم کارانە بە دوربینی ئەژمێرری چونکە خاوەنەکەیـان بـۆ دور ئەڕوانێ و ئەڵێ ئەگەر ئێمە لەم فرسەتەدا ئەم کارانە نەکەین ، نەتەوەمان بۆ پاشەڕۆژ بەجاری لەم کردەوانە دورئەکەوێتەوە و وڵاتەکـەمان پەیوەندی بە موسوڵمانەتییەوە نامێنێ . بە بیری من گەورەترین کارێکی لەم چەشنانە کـە ئیستا پێویست بێ لەسەر موسوڵمانان بیکەن بریتییە لە کردنەوەی قوتابخانەی ئەهلی بۆ خوێندنی قورئان و فێربونی عەقیدە و باوەڕی ئیسلامەتی و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و فێربونی ڕەوشتی موسوڵمانانە . لە وڵاتانی وەکو هیندستان و پاکستان و مالیزیا و ئەندەنوسیا و گەلێ شوێنیتردا ئـەم جۆرە قوتابخانانەیان کردوەتەوە بۆ خوێندنی نەك تـەنها قورئان بەڵـکو بۆ خوێندنی تەفسیری قورئان و حەدیث و شەرع و ئەو عیلمانەی‌تریش کـە پێویسـتن بۆ موسوڵمانان و بەهۆی سندوقی یارمەتییەوە ئەوەندە پارە کۆئەکرێتەوە بەشی مەسرەفی قوتابخانە و مامۆستا و قوتابییەکانیش بکات .

ئەگەر لە هەر شارێکا لیژنەیەکی موناسب لە موسوڵمانانی دەوڵەمەند و دو سێ مەلای باش و باوەڕ پێکراو پێك‌بێ ئەم ئیشە بەئاسانی جێ‌بەجێ ئەبێ . مەسەلا لە قەزایەکدا کە بە خۆی و دەور و پشتیەوە دو هەزار کەسێکی تیابێ هەریەکێ لەم موسوڵمانانە ڕۆژی دە فلس بـدەن بۆ سـندوقی خێراتی دینێ و زانستێ ئەوە لە هەمو مانگێکا شەش‌صەد دینار کۆئەبێتەوە . ئەمـە بێجگە لە خێراتی‌تری موسوڵمانان . بەم‌جۆرە بە ماوەیەکی کـەم لـە هـەر قەزایەکدا خوێندنگایەکی گەورەی ئایینێ ئەبرێ بـەڕێوە . موسـوڵمانانی وڵاتان لە ئێمە

دوربین‌تر بوون چاویان له پاشه‌ڕۆژی گه‌له‌که‌ی خۆیان بوه ، بۆیه له دیندا پێش‌که‌وتوون وه‌ك له کاروباری دنیایشدا پێش‌که‌وتوون .

له دوربینییه بۆ دین و دنیا ئه‌م خاڵه باشانه‌ی وا لێره‌دا ئه‌یانووسین :

یه‌که‌م : هیچ تاقه که‌سێك و هیچ کۆمه‌ڵێ له موسوڵمانان ده‌س‌به‌رداری په‌روه‌رده‌کردنی منداڵی خۆیان نه‌بن و ئه‌و هونه‌ر و پیشه و زانستانه‌یان فێربکه‌ن که ئه‌بن به‌هۆی ژیانی دوارۆژ و سه‌رکه‌وتنیان به‌سه‌ر ئامانجی ڕاست و به‌جێی خۆیاندا .

دوهه‌م : هیچ‌که‌سێ یا هیچ کۆمه‌ڵێ له موسوڵمانان دوژمنی دین و نیشتمانیان به سوك و بێ‌ئه‌ندیشه ته‌ماشا نه‌که‌ن ، چونکه هه‌ر که‌مه و زۆر ئه‌بێ و هه‌ر شتی سوکه قورس ئه‌بێ و هه‌ر داماوه ده‌سه‌ڵات په‌یدا ئه‌کا ، له‌به‌رئه‌وه که دنیا له‌سه‌ر بناغه‌ی تێکۆشان دامه‌زراوه و خوایش یارمه‌تی ئه‌وکه‌سانه ئه‌دا که هه‌وڵ‌ئه‌ده‌ن و تێ‌ئه‌کۆشن و هه‌لیان بۆ ڕێك‌ئه‌خا .

سێهه‌م : هه‌ر کاره‌ساتێ که ئینسان ترسی ئه‌وه‌ی ببێ ڕوبدا و ببێ به کۆسپی ڕێگای ژیان و سه‌رکه‌وتن ، هه‌ر له‌پێش ئه‌وه‌دا که سه‌ر هه‌ڵبدا هه‌وڵ‌بدرێ بۆ چارکردنی چونکه له‌پێش په‌ره‌سه‌ندنی هه‌ر شتێکدا چارکردنی ئاسانه ، به‌ڵام که ڕوی‌دا و به‌هێز بو چاری گرانه .

چواره‌م : ئاده‌میزاد له‌گه‌ڵ هه‌ر هاوماڵ و هاونیشتمانێکدا دڵ‌عاجزییه‌کی هه‌بو و دوژمنایه‌تی له‌گه‌ڵدا کرد ، هه‌ر له‌و کاته‌دا چاوی له ڕۆژی دۆستێ ببێ و به‌شی ئه‌وڕۆژه‌ی تێدا بهێڵێته‌وه . یاخود ئه‌گه‌ر دۆستێ له‌گه‌ڵدا کرد ئه‌وه‌نده زیاده‌ڕه‌وێ تیا نه‌کا و به‌شی ڕۆژێکی پێچه‌وانه‌ی تیا بهێڵێته‌وه .

پێنجه‌م : وڵاتێکی‌وا نه‌کا به نیشتمان که یاسا و نه‌ریتی خراپ تیا فه‌رمانڕه‌وا بێ و ، له‌گه‌ڵ پیاوی ناپیاوا نه‌بێ به هاوماڵ و شه‌ریکی موعامه‌له و نه‌یکا به هاوڕاز و نیازی خۆی ، چونکه ئه‌نجامی ئه‌مانه هه‌مو به زیان ته‌واو ئه‌بن .

شه‌شه‌م : هه‌ر موعامه‌له‌یه‌ك که ئه‌همیه‌تی ببێ یا نه‌یکا ، یا هه‌رچی پێویستییه‌کی هه‌یه هه‌موی به‌جێ‌بێنێ چونکه ده‌ردی‌سه‌ری یه‌که‌مجار له ده‌رده‌دڵی سه‌ره‌نجام گه‌لێ چاتره .

حه‌وته‌م : ئینسان له‌به‌ر ناچاری و داماوییه‌کی زۆر بێ‌ئه‌ندازه نه‌بێ په‌نا نه‌باته به‌ر ئینسانی نامه‌رد ، چونکه کلکه‌ی په‌نابردنه به‌ر نامه‌رد هه‌رگیز نابڕێته‌وه ، وه‌کو مه‌شهوره ئه‌ڵێن : « بده له ئاو بتبا ، مه‌ده له پردی نامه‌رد » . هه‌رچه‌ند ئه‌مڕۆ گه‌لێ‌که‌س ئه‌م قسه‌یه به ڕاست نازانن و لایان‌وایه به هه‌ر بارێکا بێ هه‌ر مودارا چاتره .

هەشتەم : ئەوەیە ئینسان لەناو موڵکی غەیرەدا بینا و باغ و بێستان و تەعمیراتیوا نەکا کە مەنعی بکا لە کۆچکردن لەو موڵکە یاخود ئەگەر ویستی دەرچێ ئەو باخ و موڵکەی لە دەست وەربگرن . شارەزایان هەموو ئەم خاڵانەیان بە دووربینی ژماردوە .

نۆهەم : ئەوەیە ئینسان بە لاف و گەزافی دۆست و برا و خزمان دەستخەڕۆ نەبێ و هەمیشە تەماشای هێزی عیلم و زانست و توانا و دارایی خۆی بکا ، چونکە ئینسان لە ژیانا لەسەر غەیری خوای تەعالا و شان و قابیلەتی خۆی بەولاوە ، نابێ پشت بە کەس ببەستێ . هەرچەند یارمەتی بەسوودە ، بەڵام بە بەراورد دەرکەوتوە کە ئەوجۆرە یارمەتییانە هەموو وەختێ و بۆ پشت پێ بەستن ناشێن .

دەهەم : هەڵبژاردنی پیاوی ژیر و ئەمین و لێهاتوو بۆ هەر کارێ کە ئەتەوێ بە کەسێکیتری جێبەجێ بکەی .

ڕۆڵەی شیرین و بینایی چاوم     هێزی دوو ئەژنۆ و بەندی هەناوم
جیهان بە وێنەی ڕەزمگای جەنگە     ئادەمی بێ چەك مەیدانی تەنگە
ئەبێ دوور بین بی بە هەموو حاڵێ     با ئاگادار بی لە هەموو قاڵێ
دڵی دووربینان وێنەی دووربینە     وەزعی سبەینێی لەلا یەقینە
دووربینی بۆ دڵ دووربینی جامە     بینینی ئەمڕۆی وەکو ئەنجامە
ئەنجامی ئەوزاع کەوتە بەر نەظەر     زۆ چارەی ئەگرێ بە بێ دەردی سەر

★ ★ ★

هەمیشە تەگبیر لە تیر چاترە     خاوەنی تەگبیر هەر خۆی ظافیرە
کە تیر و تەگبیر بۆت بوون بە ڕەفیق     ئینجا بڕوانە بۆ تاوی تەوفیق
خۆت بەدەستی خۆتوەربگرە دەرمان     تیماری بکە ناسۆری زامان
کەس ناخورێنێ وەکو خۆت پشتت     بۆت تیمار ناکا برینی زوشتت
هەتا پەنجەی خۆت پشتت بخورێنێ     پشتت بە منەت خۆی ئەنوێنێ
جا ئاگاداربە پشتت نەخورێ     پاك بێ تا باری منەت هەڵنەگرێ
دوو چاو پێویستە لەبۆ دووربینان     چاوێ بۆ ژیان ، یەکێ بۆ ئیمان
جا چونکی ژیان وا لەبەرچاوا     باسی پێش ئەخەم لەم پەڕە و ناوا

★ ★ ★

تۆ نەوەی باوکی خاوەن شمشێری     نەتەوەی شێری شەرزەی دلێری
تێناگەم بۆچی ئەبێ بە ڕێوێ     یا بۆچی ئەبێ بە وەحشی کێوێ
دنیا دەشتێکە بۆ گەلی گیاندار     هەرکام بە توانای تیا ئەگرێ قەرار
هەرکەسێ بژێ بە هێزی بازوو     بۆ خۆی ڕائەگرێ وەزن و ترازوو

ئەخاتە بەرچاو سەنگ و سۆکێ خۆی　　هەتا کەرامەت دابمەزرێ بۆی
کەواتە فەرزە پێویستی ژیان　　ئامادە بکەی بە هێزی گیان

★ ★ ★

یەکەم پێویستە نانێك و شانێ　　بە پیشە و صەنعەت بۆ نیشتمانێ
تا خۆت و یاران بحەسێنەوە　　وەکو شەمشەمە نەسوڕێنەوە
دۆهەم پێویستە ئاگات لە خۆت بێ　　نەوەك هێرشێ بە ڕاسەرتۆ بێ
شێر و قەڵفانی باوکی مەردی خۆت　　بکەیتە شانت بۆ نەبەردی خۆت
هەرکەس بێ شیرە حەڵوا ناتۆشێ　　پیاوی بێ کەللە کڵاو ناپۆشێ
چاوی دۆهەمیش بڕوانێ بە دڵ　　بۆ حەقپەرستێ تا ئەڕۆیتە گڵ
هەرکەس ون بکا ڕێی حەقپەرستێ　　بەرەو لێژ ئەڕوا سەر بەرەو پەستێ
ناسینی خودا پیشەی مەردانە　　خوانەناس دائیم هەر سەرگەردانە
خودا ناس لەسەر نیعمەتی خودا　　سوپاس گوزارە لە ڕۆژ و شەوا
لەسەر مەینەت و قەزای نازڵ بۆ　　خۆ ئەگرێ بە دڵ تا بۆی دێ دەرۆ
بەڵ ئەو مەینەتە لای ئەو نیعمەتە　　بۆ پاشەڕۆژی مایەی ڕەحمەتە

★ ★ ★

خۆگرتن بە دڵ قەڵای ژیانە　　مایەی حورمەتە و ڕەحەتێ گیانە
موسوڵمان نابێ پاڵ بداتەوە　　بۆ پاشەڕۆژی لا نەکاتەوە
دنیا ڕێبازە بۆ جیهانی نۆ　　تۆشەی ئەو دنیا پێویستە بۆ تۆ
ڕەهبەری نازدار سەری سەرداران　　سێ شتی دانا بۆ ئاگاداران
یەکەم ئەو دوعا کە نەتەوەی تۆ　　بینێرێ بە دڵ بۆ ڕزگاری تۆ
دۆهەم ئەو عیلم و ئامۆژگارییە　　لە دەمی تۆوە یادگارییە
سێیەم خێراتێ بمێنێتەوە　　مردۆ بەو خێرە ئەحەسێتەوە

★ ★ ★

لە وەقفی باخێ یا زەوێوزارێ　　مزگەوتێ ، پردێ ، خانۆی بیمارێ
پاداشی ئەمە لەپاشی مردن　　وەك ملوانکەی گوڵ ئەیکەیتە گەردن
فەرمۆدەی حەزرەت بۆ موسوڵمانان　　وەها هاتوە و گەیوە پێمان
« خَيْرُ الاَمْوالِ عَيْنٌ ساهِرَةٌ　　لِنائِمَةٍ » مەعنای ظاهیرە
واتە چاکترین ماڵی هەڵکەوتۆ　　چاوی بێدارە بۆ چاوی نۆستۆ
لە چاوی بێدار مەبەست خێراتە　　لە چاوی نۆستۆیش چاوی ئەمواتە
ئەگەر ئەو ماڵە داگیریش بکرێ　　خێرەکەی هەمۆ بە مردۆ ئەدرێ
چونکە ئەمانە بە بێ کەیف و کەم　　بە کردەوەی خۆت ئەدرێنە قەڵەم
بەڵام ئەو خێرەی کەسێك ئەینێرێ　　شەرع بە ئیحسانی ئەوی ئەژمێرێ

★ ★ ★

ئـەگەر ئەپرسی لـە یاسای شەرعا ‏ لَیسَ لِلاِنسانِ اِلا ما سَعی
کەوابی خێری کەسی‌تر بیکـا ‏ چلۆن بـە ڕۆحی مردوێك ئەگـا
ئـەڵێم لـە دینـا یاسـا دوانـە ‏ یەکەمیان عەدلـە ، دوەهەم ئیحسانە
هەرچی خۆت بیکەی یـا بەهۆی تۆیە ‏ کردەوەی خۆتە ، عەدلە لـەو جێیە
ئەوەیش کە خەڵکی ئەیکەن بۆ ئینسان ‏ ئەگا بە مردو بە یاسای ئیحسان
قـاپی ئیحسانی خـودا گوشـادە ‏ هەر بەو قاپییـە دەرونمـان شـادە
بەستنی دەرگـای ئیحسانی خودا ‏ مەحـاڵە مەحاڵ مەکـەوە سـەودا
کفری لی دەرکـە خەرمانی تـاوان ‏ سـاتی ئەسوتی بە نوری ئیحسان
ئەگەر بە دو چاو لە چـاوی دوربین ‏ بژیت ئەگەییت بـە دنیا و بـە دین
ئەمـەیە دەرسـی باسـی دوربینی ‏ ئەگـەر بتـەوی ڕاسـتی ببینـی

## گوڵی بیست‌ودوەهەم ـ گوڵی ئاگاداری

**ئەنـوار ئەباری بەسـەر یارانا**
**بەسەر کۆمـەڵی خەبـەردارانا**
**دڵی خەبـەردار بە ئاگـاداری**
**خەڵات وەرئەگری لە ذاتی باری**

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموێەتی :

**اِنَّ فِي ذلِكَ لَذِكرى لاِوُلِي الاَلباب**

واتە : بەڕاستی لە بەیان و دەربڕینی ئەوەدا کە باسمان‌کرد بیرکردنەوەیەکی سودمەند هەیـە بـۆ ئەوکەسـانەی خاوەن مێشـك و دەمـاغن . مەبەسـتی لەوکەسانەیە کە خاوەنی عەقڵی ئاگادار و خەبەردار و وردبینن .

ئاگاداری و دەمـاغی ساغ بۆ ئادەمیزاد زۆر بەسودە ، بەڵکـو ئینسان ئەتوانی بڵی هەرچی سودێکی مایەدار بۆ ئینسان پەیدا ئەبی لە ماوەی ژیانیا ، هەموی بەهۆی دەماغ و ئاگادارییەوەیە و ، ئەگەر بە هەڵکەوت بی و کابرا خۆی دەماغی نەبی ئەو دەسکەوتەی بی‌سود ئەڕوا و قازانجی نابی .

ئینسـانی ئاگـادار و دەماغدار وەکو ئەندازیارێکی بەرز چـۆن کە سەیری کۆشکێك بکا ئەزانی توانای مانەوەی چەند ساڵی هەیە ، یا وەك دوکتۆرێکی شارەزا چۆن کە تەماشای نەخۆشی بکا ئەزانی نەخۆشییەکەی چیە ، یا وەك زانایەکی پایەبڵنـدی کان شناس چۆن تەماشای خاکێك بکا ئـەزانی چ‌کانێکی پێوەیە ، یا وەکو ئاسمان‌شناس و لە هەوا زانێکی وریا چۆن بە چۆنیەتی گۆڕانی

هەوا ئەزانێ ، ئەمیش هەروا بە دەرد و دەرمانی خۆی و کۆمەڵی دەوروپشت و وڵاتانی‌تر ئەزانێ .

لەسەر ئەم ئوسوڵ و یاسایە تاقە ئینسانێکی ئاگادار لە هەر کۆمەڵێکا بێ ، ئەگەر خەڵکەکە بە گوێی بکەن و بە ڕاوێژ و تەگبیری ئەو بجوڵێنەوە و بڕۆن بەڕێدا ، ئەوا سوودێکی باش لە بوونی ئەوکەسە لەناویاندا وەرئەگرن .

ئاگاداری بەگوێرەی مەعلومات چەند جۆرێکی هەیە . یەکەم : ئەوەیە ئینسان ئاگادار بێ لە بیروباوەڕی خۆی و ئەو بیروباوەڕەی کە بەهۆی حەقیقەتی یاسای ئیسلامەوە وەری‌گرتوە و لەدڵیا دامەزراوە بە شوبهەی پیاوی بێ‌باوەڕ تێکنەچێ و ئاگادار بێ نەهێڵێ ئەو شوبهە فرۆشانە بە فکری ناپەسەند دڵی نەخۆش بخەن و بیروباوەڕەکەی بفەوتێنن و تۆشی گرێ و گۆڵی نەفسێ بکەن . هەروا ئاگای لە کردەوەی خۆیشی بێ ، هەر واجبانێ و هەر سوننەتێ کە ئەیکا بەپێی ئوسوڵی دین بیکا و خۆی لە هەر کردار و گوفتارێکی ناڕەوا و ناپەسەند دووربخاتەوە . بەکورتی موحاسەبەی نەفسی خۆی بکا وەك چۆن خاوەن‌ماڵ حیسابی خەرج و مەسرەف لەگەڵ خزمەتکاری خۆی ئەکا . لەسەر ئەم ئوسوڵەیە وتراوە : « حاسِبْ نَفسَكَ قَبْلَ اَنْ تُحاسَبَ » . واتە : لە نەفسی خۆت بپرسەرەوە بەرلەوەی لێت‌بپرسنەوە واتە بەر لەوەی بمرێ و بکەویتە بەر حیساب و لێ‌پرسینەوەی قەبر و قیامەت و حوزووری خوا .

دووهەم : ئەوەیە ئینسان ئاگاداربێ لە ئەحواڵی پەیوەندی خۆی لە گەورە و بچووك بەئەندازەی حاڵی خۆی ، وەکو پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « كُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ، وَالرَّجُلُ راعٍ في اَهْلِهِ وَهوَ مَسْؤولٌ عنْ رَعيَّتِهِ ، والمَرْاَةُ راعيَةٌ في بَيْتِ زَوجِها وهِيَ مَسْؤولَةٌ عَنْ رَعيَّتِها ، والخادِمُ راعٍ في مالِ سَيِّدِهِ وهوَ مَسْؤولٌ عَنْ رَعيَّتِهِ ، وَالرَّجُلُ راعٍ في مالِ اَبيهِ وَهوَ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ، فَكُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤولٌ عنْ رَعِيَّتِهِ » . واتە : موسوڵمانینە ! ئێوە هەموتان چاودێرن و هەموتان بەرپرسن لەو شتەی وا لە چاودێریتانا . سەرکردەی هەمو موسوڵمانان چاودێری هەمویانە و بەرپرسە لە هەمویان . پیاو چاودێری خێزانی خۆیەتی و بەرپرسە لە هەمویان . ژن چاودێرە لە ماڵی شوەکەیدا و بەرپرسە لە ماڵی شوەکەی . خزمەتکار چاودێرە لە ماڵی گەورەکەیا و بەرپرسە لە ماڵی ئەو . پیاو چاودێرە لە ماڵی باوکیا و بەرپرسە لە ماڵی ئەو . کەواتە هەموتان بەرپرسن لەوەی لە چاودێریتاندایە . بەڕاستی ئەم فەرمودە بەرزە گەلێ دەرسی بەنرخی‌وای تیایە ئەگەر ئینسان بەڕاستی جێ‌بەجێیان بکا هەموکەسێ لە سێبەری ئارامێ و هێمنیدا ئەژێ و سەربەرزی هەردوو دنیای دەسگیر ئەبێ .

سێهەم ئەوەیە ئینسان ئاگادار بێ لەوە کە خەڵکێ دەربارەی بەردەست و پەیوەندی بەهەڵەیدا نەبەن . واتە : هەرکەسێ کۆمەڵێ لە بەردەستیا بێ وەکو پیاو بەنیسبەت ژن و منالیەوە و سەرۆکی خوێندنخانە بەنیسبەت قوتابییەکانیەوە و گەورەی ئاوایێ بەنیسبەت خەڵکی ئاواییەوە و کاربەدەستی ناوچە بەنیسبەت خەڵکی ناوچەکەیەوە و غەیری ئەمانە ، ئاگایان لەوە بێ کەوا هەمیشە کەسانی ئاژاوەگێڕ و ئاشوبخواز بە درۆ و دەلەسە باسی خەڵکیان لا ئەکەن و هەواڵی خراپیان لەبارەیانەوە بۆ ئەگێڕنەوە و دڵیان لە ژێردەستەکانیان کرمێ ئەکەن و ئەیانەوێ وایان لێبکەن زیان بەوکەسانە بگەیەنن . لەم کاتەدا ئاگادارێ و دەماغی ساغ بۆ ئەو گەورانە ئەوەیە هەروا بەئاسانێ قسەی ئەو کەسە فیتنانەیان نەچێ بەگوێدا و باوەڕیان پێنەکەن و بکەونە لێکۆڵینەوە تا کاکڵە و پوختەی مەسەلەکەیان بۆ دەرئەکەوێ . جا ئەگەر ئەو قسانەیان بۆ بەڕاست دەرچۆ ئەوا چێ پێویستە ئەیکەن . ئەگەر بە درۆیش دەرچۆ ئەوا تۆڵەی پێویستی ئەو کابرایانە بدەن کە درۆکەیان بۆ هێناون بۆئەوەی کەس نەتوانێ بە بێ گوناە کەسێکی تر بکا بەداوەوە .

خوا لەم بابەتەوە فەرمویەتی : « یا أَیُّها الَّذینَ آمَنُوا إِنْ جاءَکُمْ فاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَیَّنُوا ، أَنْ تُصیبُوا قَوْماً بِجَهالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلی ما فَعَلْتُمْ نادِمینَ » . واتە : ئەی ئەوکەسانەی کە باوەڕتان بە ئایینی ئیسلام هەیە ئەگەر کابرایەکی گوناهبار هەواڵێکی خراپی دەربارەی کەسێك یا کۆمەڵێك بۆ هێنان ، بکەونە کۆڵینەوە و پەیجۆر بۆئەوەی بزانن ئەو هەواڵە ڕاستە یا درۆیە ، نەوەك لەخۆڕایێ و بە نەزانێ کۆمەڵێکی بێتاوان تۆش بکەن و پاشان لەو کردەوەی خۆتانە پەشیمان ببنەوە و هەڵەکەی خۆتان بۆ چار نەکرێ . ئەم ئایەتە پەندێکی پڕمەعنایە لەبارەی چۆنیەتێ هەڵسوڕاندنی کاروباری کۆمەڵەوە و تێمان ئەگەیەنێ بۆ حوکمدان بەسەر خەڵکا لەخۆڕایێ شوێنی قسەی خەڵك نەکەوین .

چوارەم : ئەوەیە ئینسانی ئاگادار بە فڕوفێڵی کەسانی فێڵباز هەڵناخەڵەتێ ، چونکە هەمیشە لێکۆڵینەوە و وردبونەوە ئەکا بە چرای دەستی خۆی و چێو لە تاریکێ ناکوتێ ، چونکە ئینسانی بەقیمەت بەتایبەتێ سەرۆك ئەگەر هەڵبخەڵەتێ بۆ خەڵك ، ئەو وڵاتە یا ئەو شوێنە کە ئەو گەورەیەتی ، ئاسایشی لێ ئەبڕێ و وێران ئەبێ . ئەگەر هاتو جارێکیش لەبەر دڵسافێ و نیازپاکێ پێی هەڵخەڵەتا ، جارێکیتر پێی هەڵناخەڵەتێ ، وەکو پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « لا یَلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ واحِدٍ مَرَّتَیْنِ » . واتە موسوڵمان دۆ جار لەکونێکەوە مار نایگەزێ . مەبەستی لەوەیە موسوڵمان ئەبێ هوشیار و ئاگادار بێ و بەهۆی یەك شتەوە دۆکەڕەت تۆشی زەرەر و زیان نەبێ . مەسەلەی کوردێ ئەڵێ : جارێکیان هەڵخەڵەتاندم خوا بیانگرێ ،

جارێکی‌تریان هەڵخەڵەتاندم خوا خۆم‌بگرێ ، چونکە ئینسان ئەبێ وریا بێ و خەڵك بناسێ . بەتایبەتێ لە چەرخێکا کە فڕوفێڵ زۆربوبێ ، ئینسانێ پایە و مایەیەکی هەبێ گەلێ‌کەس بە چەند شێوە و چەند ڕەنگ بۆی ئەڕۆنە پێشەوە بۆئەوە کە بیخەڵەتێنن . جا ئەگەر جاری یەکەم بۆیان هەڵنەخەڵەتا ، لە کۆڵی نابنەوە ، بۆ جاری دوهەم بە جۆرێکی‌تر لەگەڵی دێنە کایەوە و هەروا بەوجۆرە یا تا ئەیکەن بەداوەوە یا نائومێد ئەبن لێی و دەس‌بەرداری ئەبن و بەدوای چارەیەکی‌ترا ئەگەڕێن بۆ هێنانەدێ مەبەستەکەی خۆیان .

ڕۆڵەی عەزیزم ، نوری دیدەکەم ! ڕاستێ قامەتی خەم چەمیدەکەم !
گوێم لێ ڕاگرە ، من بۆ تۆ ئەدوێم سبەی من لەناو گۆڕمدا ئەنوم
تۆی جێگەداری مەردانی مەردی تۆی بۆ خانەدان جەوهەری فەردی
شەخسی بە جەوهەر ئەبێ هوشیاربێ بە دڵ و دەماخ ، زۆر ئاگادار بێ
دڵی هوشیار بێ لە خۆی و عالەم بەڵکو لە هەمو نەوەی بنیادەم
چونکە هوشیاری بۆ هەرکەسێ بۆ خۆی و پەیوەندی لە مەینەت دەرچو
گەورەی هەر گەلێ خەبەردار ئەبێ ئەبێ لە خۆشێ قەمت بەشدار ئەبێ
نەك بە تەنیا خۆی ، بەڵکو پەیوەندی هەمو ئەفەوتێن بە حەسرەتمەندی

★ ★ ★

جا ئاگاداری یەکەمین پایە بۆ حالی خۆتە نەیدەی بە زایە
ئاگات لە خۆت بێ بە بیروباوەڕ لە کرداری خێر دوور لە دەردی‌سەر
دوهەم بۆ دەستە و مال و خێزانت بۆ خزم و خوێشان ، بۆ ئازیزانت
( کلکم راع ) واتەی ڕەسوڵە فەرمودەیەکی بەرز و مەقبوڵە
سێهەمین پایە ڕێ‌نەدەی بە کەس خەڵکی‌تر تۆش‌کەی هەروا بە هەوەس
پیاوی فێتنەجۆ ئاگری سوورە پارێز لە ئاگر بۆ تۆ زەرورە
لێکۆڵینەوەی قسەی بەدخواهان فەرزە بۆ گەورە و بۆ خاوەن جاهان
چوارەم وریا بە نەتخەڵەتێنن لەسەر تەختی خۆت هەڵت‌نەفڕێنن

★ ★ ★

حیکایەتەکەی تیتیل و بیبیل کە بیستوتانە وەك ڕازی تەمسیل
لەسەر دوژمنی خاوەن تەزویرە حەفتەیێ جوانە و دو حەفتە پیرە
ڕۆژێ ڕەش‌باوە هەروەك شەوەزەنگ موی ئاڵۆز بوە وەك شێر و پڵەنگ
جارێ‌تر زەردە و جارێ سپێ ڕەنگ چاوانی شینن وەك خەڵکی فەرەنگ
جاربەجار ڕەنگی قاوەیێ بامە غەیرە مەرغوبی دەستەی عەوامە
ئەمانە هەمو بۆیەی بەرچاون داوی دەرونی پیاوی شێواون
ڕەسسامی وریا ڕەسمی خۆ ئەگرێ کەی ڕەسمی ڕەنگ‌و کرژێ مۆ ئەگرێ

زینهـار وریا بـە برای هۆشـمەند تیتیل وەکو دیل نەتخاتـە کـەمەند
تیتیلی عەیـار تـا بۆی ڕێ کـەوێ تۆی بـۆ خزمەتی ورگـی خۆی ئەوێ

★ ★ ★

ئەگەر بە قەزای خـودایێ ، جـارێ کەوتیتـە داوی یـەك بـەدڕەفتارێ
بۆ جاری دووهەم ئاگات لە خۆت بێ بـۆت نەیەتـەوە کایـە وەکـو دوێ
لادێیێ داماو کە هـات بـۆ بـازاڕ نـازانێ حـالی جـانبازی عەیـار
ئەشێ یەکەمجار بـە خـۆی نەزانێ بۆ بزنـەکانی چەنـد گورگێ دانـێ
بەلام کـە سـبەی هاتـەوە بـازاڕ بخلەتێ ، دانێ خـۆی بـە تاوانبار
فێلبـازی دوێنـێ خـودا بیـگرێ بۆ ئەمڕۆ خودا با ئەم خـۆی بگرێ
لـە کونێکـەوە لەبـەرچی دوجـار پەنجەت بگەزێ دووپشـك و ڕەشمار

★ ★ ★

کاکە بـەکورتێ پیـاوی موسـوڵمان ئەبێ هوشیار بێ لـە چەرخی زەمان
لە سورەی یوسف نەصصی ئایـەتە دەعـوەتی ئیسـلام بـە بەصـیرەتە
ڕێکی واقیـع و حـەقیقەت ئـەڕوا واتـە لەسەر ڕێی شەریعەت ئەڕوا
نابێ موسـوڵمان ئـەوەندە گوێل بێ بکوژرێ و شوێنی تا ئەبەد چۆڵ بێ
ئیسـلام پـاکییە و دەروون ڕۆناکێ عەقلە و عەمەلە و بەرزێ و چـالاکێ
ئەمـەیە دەرسـی پـیری ئاگـادار ( نـامێ ) ناگـیرێ بەداوی عـەییار

## گوڵی بیستوسێهەم ـ گوڵی دادگەرێ

باران کـە بارێ ئـەبێ بـە گەوهەر
ئەڕژێتە خـاکی گـەورەی دادگـەر
بـەلام لـە موڵکی پیـاوی زۆردارا
دڕك سـەوز ئـەبێ لەجێی گوڵزارا

وَزِنوا بِالقِسطَـاسِ المُستَقِيمِ

خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی داوە بە دادگەرێ و فەرمویەتی بە ترازوی ڕاست و سەرنەکردو شت کێشانە بکەن . مەبەستی لەوەیە کارێ مەکەن حەقی کەسێك بشکێتەوە بەلای کەسێکی تردا .

ئەم جیهانە هەموی بە ئەرز و ئاسمان و باقی ئەستێرەکانەوە لەسەر میزان دروست کـراوە و هەریەکێ لە بەشەکانی میزانێکی تایبەتی هەیە ئەگـەر ئەو میزانەی تێك‌بچێ ، بەڕێوەناچێ . مەبەست ئەوەیە لە هەمو شتێکدا عەدالەت و

میزان ڕاگرتن پێویستە بۆ مانەوەی ئەو شتە و ئەم مەوزوعە بە بەراورد ثابت بوە و پێویستی بە بەڵگە و دەلیل نیە . لەسەر ئەم ئەساسەیە خوای گەورە لــە قورئاندا گەلێ هەڕەشەی لەوکەسانە کردوە کە غەدر ئەکەن لە خەڵك و ترازوی دادپەروەری ڕاناگرن ، وەکو ئەوە کە ئەفەرموێت : « اِنَّ رَبَّكَ لَبِالمِرْصادِ » . واتە : بەڕاستی خوای تۆ ئــەی ڕەهبەری خۆشەویست وا لە کەمینــدا بۆ ئەوکەسانەی لە ڕاستی لائەدەن و باوەڕ بەخوا ناکەن و خەریکــی بێدادی و ستەمکــارین ، یــا وەکــو ئــایەتی : « ولا تَحْسَبَنَّ الله غافِلاً عَمّا یَعْمَلُ الظّـالِمونَ ، اِنَّمـا یُؤَخِّرُهُـمْ لِیَوْمٍ تَشْخَصُ فیـهِ الابْصـارُ » . واتە : وا گومــان مەبە کەوا خــوا ئاگای لەو کــردەوە ناپەسەندانە نیــە کە ستەمکارەکان ئەیانــکەن ، حاشا بێئاگا نیــە ، بەڵکو تۆڵــە لێسەندنەوەش بە ســەرەیە و ئەوانــەی لە دنیادا تۆڵــەیان لێ ناســێنێ ، بــۆ ڕۆژێکیوای هەڵگرتون و دوایخستون چاوی تاوانبارانی تیا ئەبڵەق ئەبێ لە ترسی سزای سەختی خوا . هەروەها وەکو ئەو ئایەتە کە ئەفەرموێت : « فَلا تَحْسَبَنَّ الله مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ ، اِنَّ الله عَزیزٌ ذو انْتِقامٍ » . واتە : وا مەزانە خوا ئەو گفتەی خۆی ناهێنێتەدی کە داویە بە پێغەمبەران کەوا تۆڵە لە تاوانباران ئەسێنێ ، نەخەیــر گفتەکەی خۆی ئەهێنێتەدی و خوا تۆڵەســێنێکی دەست ڕۆیشتوە و مەسەلەکە هەر درەنگ و زوییە و لەوە زیاتری تیا نیە . هەروەها وەکو ئایەتی : « وَعَنَتِ الوجوهُ لِلْحَیِّ القَیّـومِ وَقَــدْ خابَ مَــنْ حَمَــلَ ظُلْماً » . واتە لــە ڕۆژی قیامەتدا ڕوی زۆرداران کز ئەبــێ و هەموکەسێك بەهۆی ئەوەوە بەردەوام و بەڕاســتی دائەمێنێ و هەرکەس کە کۆڵێکی ستەم بەکۆڵیەوە بوبێ بێچارە و نائومێد و هەناسە سارد ئەبێ چونکە کەس نیە ڕزگاری کا و تۆڵەی کۆڵەکەی لە کۆڵ بکاتەوە . هەروەها وەکو ئایەتی : « وَخابَ کُلُّ جَبّارٍ عَنیدٍ » . واتە بەڕاستی هەرکەس زۆردار و کەللەڕەق بوبێ لە دنیادا ، لە قیامەتدا پــەکی ئەکەوێ و بێهیوا و بێچارە ئەمێنێتــەوە . قورئانی پیرۆز ئایەتی لەمجۆرەی زۆر تێدایە کە هەمو دوارۆژی ستەمکارانمان پیشانئەدەن .

پێغەمبەریش گەلێ فەرمودەی بەهێــز و بەمەعنای لەم ڕوەوە هەیە و لە فەرمودەکانیا هەڕەشەی توند و سەختی لە زۆرداران کردوە ، وەکو ئەوە کە ئەفەرموێت : « الذَّنْبُ لا یُنْسی ، وَالبِــرُّ لا یَبْلی ، والدَّیانُ لا یَموتُ ، فَکُنْ کَما شِئْتَ » . واتــە : تاوان لەبیر ناچێتەوە و ، کــردەوەی باشیش نازڕێ و تۆڵەسێنیش نامرێ و تۆیش چۆن ئارەزو ئەکەی وابە . بەڕاستی ئەم فەرمودەیە ئەوەندە ورد و مەعنادارە بنیادەم لێی سەرسام ئەبێ و بە کورتترین وشە زۆرترین مەعنای لەبارەی چارەڕەشی و بێئەنجامی ستەمەوە پیشانداوە. پێــغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ پەیڕەوانی خۆی تۆقاندوە لە ئەنجامی خراپــی ستەم و ئەوەی دەربڕیوە کەوا ئەگەر تۆڵەی هەر تاوانێ دوابکەوێ تۆڵەی ستەم

دواناکەویّ و ئەبیّ هەرچۆن بیّ ستەمکار بە تۆڵەی حەقی خۆی بگات ، وەکو ئەوە کە ئەفەرمویّت : « اعجَلُ الاشیاءِ عقوبَةً الظُلم » . واتە : لە هەمو تاوانیّ نزیکتر بە تۆڵەی سەخت ، تاوانی ستەمە . بەڕاستیّ ئیّمە هەر لە ژیانی خۆماندا بە چاوی خۆمان گەلیّ ستەمکارمان دیوە زوّ بە تۆڵەی حەقی خۆی گەیشتوە و تۆڵەی لیّ سەندراوە لە شویّنیّکەوە کە کەس گومانی ئەوەی نەبردوە تۆڵەی لەو شویّنەوە لیّ بستیّنریّ . ئەمەیە مەعنای ئەوە کە خوا لە قورئانا ئەفەرمویّت : « واللهُ غالبٌ علی امرِه ، ولکنَّ اکثرَ الناسِ لایَعلَمونَ » . واتە : خوا دەسەلاتی بەسەر ئەو شتەدا ئەشکیّ کە ئەیەویّ بیکا ، بەلاّم زوربەی خەڵك کە بیّباوەڕانن بەوە نازانن و ئاگایان لیّ نیە .

لەبەر ناباریّ و ناڕەوایی ستەم و ستەمکارە خوا نەهیی فەرموە لە نزیك کەوتنەوە لە ستەمکاران ، چجای ئەوە کە ئینسان خۆی ستەمکار بیّ و ، فەرمویەتی : « ولا ترکَنوا الی الّذینَ ظَلَموا فتَمَسّکُمُ النارُ » . واتە : نزیك مەکەونەوە لەوانەی کە ستەمکارن بۆئەوەی ئاگری ئازاری ئەوان نەتانگریّتەوە . ئەم ئایەتە زۆر بەلیغە و چەند تەفسیر و لیّکدانەوەی هەیە . یەکیّکیان ئەوەیە مەیل مەکەن بۆلای ستەمکاران چونکە بەهۆی ئەم مەیل و خۆشەویستییەوە بەشیّ لە ئاگری تۆڵەی ئەو ستەمەتان بەرئەکەویّ کە ئەوان کردویانە . بەڕاستیّ ئەگەر ئینسان پیاوی ستەمکاری خۆش بویّ هەرچەند لەبەر ستەمەکەیشی نەبیّ ، بەڵکو لەبەر پەیوەندیکیتر بیّ هەر وای لیّ دیّ چاو لەو ستەمەی بپۆشیّ و بایەخی نەداتیّ و دیارە ئینسان بەمە تاوانبار ئەبیّ و لە دوارۆژا بە ئاگری دۆزەخ ئەسوتیّ . مەعنایەکیتری ئەم ئایەتە ئەوەیە نزیك مەکەونەوە لەوکەسانە کە ستەمکارن ، چونکە زۆیی تیّئەچیّ بەشیّ لەو سودە دنیاییانە کە ئەوان دەستیان کەوتوە بلکیّ بە ئینسانەوە ، سا بەهۆی خواردنی نانیانەوە ، یا بەهۆی ئیستیفادەکردن لە مالیانەوە ، یا بەهۆی ڕازیّبونەوە لە هەندیّ کردەوەی ناباریان ، یا بەهۆی باوەڕ پیّکردنیانەوە لەوەدا کە هەندیّ ئیشیان ئیشی بەجیّیە و ڕەوایە . جا بەهۆی ئەوەوە بەپیّی شەرع ئینسان تاوانبار ئەبیّ و لە پاشەڕۆژدا بە ئاگری دۆزەخ ئەسوتیّ .

مەعنایەکیتری ئەوەیە ستەمکار بە شومیّ ستەمەکەی لە مەعنادا وەکو ماددەیەکی سوّزندەی زیانبەخشی لیّ دیّ و ، ئینسان وەك چۆن کە لەکاتی سەرمادا زۆر نزیك ببیّتەوە لە ئاگر ئەسوتیّ ، هەروەها ئەگەر لە ستەمکاریش نزیك ببیّتەوە بەهۆی ئینطیباعاتی ڕۆحییەوە توشی زیان ئەبیّ و حالەتیّکی دەرونیّ ناموناسبی بەسەردا دیّ . مەعنایەکیتریشی ئەوەیە ئینسان بەپیّی ئوسوڵی دنیا کە نزیك بوەوە لە پیاوی ستەمکار ، بە لایەنگری ئەو ئەدریّتە قەڵەم و لە ڕۆژیّکا کە ئەو ستەمکارە گیرۆدەی کردەوەی خۆی ببیّ ، ئەم کابرایشە بەهۆی ئاموشۆی لەوەوپیّشی ئەوەوە بە ستەمکار ئەناسریّ و گرفتار

ئەبێ . بەپێی ئەم مەعنایەیە پێغەمبەری نازدار درۆدی خوای لێ بێ فەرموویەتی :
« مَنْ اعانَ ظالِماً سَلَّطَهُ اللهُ عَلَيْهِ » . واتە : کەسێ مەیل و موناسەبەت لەگەڵ ستەمکارێکا پەیدابکا و یارمەتی بدا ، خوا ، لە تۆڵەی ئەو کردارە ناپەسەندەیدا ، لەجیاتی ئەوەی ئەو ستەمکارە چاکەی لەگەڵ بکا ، ناکۆکی ئەخاتە نێوانیانەوە و ستەمکارەکەی بەسەردا زاڵ ئەکا ئازار و ئەزیەتی بدات .

ئەوەندەی ستەمکار لای خودا ڕەش و تاوانبارە ، دادگەریش ئەوەندە بەڕێز و پایەدارە ، ئیتر خواه گەورەی خێزان بێ یا گەورەی ئاوایی یا هۆز یا کاربەدەستی دەوڵەت بێ کە کاروباری کۆمەڵێ لە موسوڵمانانی بەدەستەوەیە . دادگەری واتە عەدالەت بریتییە لەوە کە ئینسان لە هەمو وتار و ڕەفتارێکیا لە ئیش‌وکاری دین و دنیای خەڵکدا ڕێگای حەق و ئینساف بگرێتەبەر و لە حەق لانەدا و هیچ شتێ نەکا بە بیانۆی لادان لە حەق وەکو خزمایەتی و هاوپیشەیی و هاونیشتمانی و هاوزمانی و هاومەشرەبی و تەماعی مایە و پایە و هیوای هەندێ شت کە لە ڕێگای لادانەوە لە حەق دەستی بکەوێ . کەسێ کە حاڵی وای لێ‌هات ئەوە بەڕاستی دادگەرە . وتەیەکی مەشهورە : « قولوا الحَقَّ ولَوْ على انفسِكُمْ » . واتە : قسەی ڕاست بکەن با زیانی خۆیشتانی تیابێ .

دادگەری بناغەی هەمو پیرۆزی و سەرکەوتنێکە . بناغەی ئاسایشی جیهان و وڵاتە . ئاسایشیش بناغەی بڵاوبونەوەی زانست و هونەر و پیشە و گەشەکردنی کشتوکاڵ و باخ‌ناشتن و حەیوانداری و سنعات‌سازییە . بەهۆی دادگەرییەوە دارایی زیاد ئەکا و سوپا بەهێز ئەبێ و خەڵك دڵیان بە ژیانی خۆیان خۆش ئەبێ و لەشیان ساغ و دڵیان شاد ئەبێ و باوەڕ بە یەکتری زۆر ئەبێ لەناویانا و دەستی یارمەتی بۆ یەکتری درێژ ئەکەن .

خەلیفەی یەکەم حەزرەتی ئەبوبەکری صیددیق خوای لێ ڕازی بێ بە یەکێ لەوانەی وت کە کردبونی بە فەرماندار لە شارەکانی موسوڵماناندا : هەرگیز لە دادگەری جیا مەبەرەوە و بەدەوام لە ستەم دور بە و ئەگەر لەگەڵ یەکێکدا پەیمانێکت بەست مەی‌شکێنە و ئەگەر دۆستیتان کرد تێکی‌مەدەن . خەلیفەی دوهەمیش حەزرەتی عومەری فارۆق لە فەرمانڕەوایی خۆیا هەرگیز شاە و گەدای لە یەك جیانەکردوەتەوە . ( جِبِلَّەی کوڕی اَیهَم ) لە ترسی شکاندنەوەی ددانی لە تۆڵەی ددانی پیاوێکی هەژارا کە شکاندبوی هەڵات ، چونکە ئەیزانی کەوا بێ‌گومان ددانی ئەشکێننەوە . عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش بە یەکێ لە کاربەدەستەکانی خۆی‌وت کە ڕقتان لە یەکێ هەستا بیر لەوە بکەنەوە کە خودایش ڕقی لە ئێوە هەستێ . یەکێ لە زانا بەرزەکان ئەڵێ : بە دادگەری هەیبەت و شکۆ دائەمەزرێ بۆ سەرۆك و بە ستەم شکۆی ئەشکێ . هەرکەسێ بڵێ هەیبەت بە ستەم دائەمەزرێ بەهەڵەدا ئەچێ ، چونکە ئەو هەیبەتەی

ستەمکارە ماوەی ئەوەندە نیە ، کەواتە بناغەی هەیبەتی ڕاستەقینە بریتییە لە دادگەریێ .

ئەنەوشیرەوان وتویەتی هەرکەسێ بیەوێ گەورەیێ بکا نابێ گەنجینەی خۆی بە ماڵی ڕەعیەت پڕ بکات ، چونکە ڕەعیەت بناغەی سەرداریە و وەرگرتنی دارایێ لەوان بۆ پڕکردنی گەنجینە وەکو ئەوە وایە یەکێ گڵی بناغەی دیواری خانوی خۆی هەڵکەنێ بۆئەوەی سەربانی پێ پڕبکاتەوە .

دادگەریێ لە پیاوی زۆر گەورەوە جیلوەی باش دەرئەکەوێ . ئەگەر دادگەریێ بۆ پیاوی بچوك سوننەت بێ ، بۆ پیاوی گەورە فەرزە . ئەگەر بۆ بچوك فەرزی کیفایە بێ ، بۆ گەورە فەرزی عەینە ، چونکە ئەو ئیشانە ئەو ئەیانکا بە بچوك ناکرێن ، بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی گەورەی دادگەر سێبەری میهرەبانێ خوایە بەسەر زەویەوە .

ڕۆڵەی عەزیزم ، ئەوەی دانایە — ئەزانێ خودا زۆر تەوانایە
ئەزانێ خودا خودای عالەمە — خوای گیاندار و بەنی ئادەمە
ئەزانێ خودای بە لوطف و ئیحسان — میهرەبانترە لە باوکی ئینسان
تۆڵە ئەستێنێ لەو ستەمکارە — لەبۆ گیانداران وێنەی خوێنخوارە
ئەم واتە بگرە بە خۆش نیهادێ — « اِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصادِ »
کێ ڕزگار ئەبێ لە کەمینگای حەق — عالِمی غەیب و شەهادەی موطلەق
ئەو ستەمکارەی لە خۆی غەڕڕایە — لای خودا هیچە بە وێنەی بایە
ئەوەی بە ظاهیر جەسورێ ئەکا — خوا بەئاشکرا مەهجوری ئەکا
ئەوەی نهێنێ دێتە سەر تاوان — خوا ئاگادارە بۆ ڕەقەم دانان
کامەی شەددادە بێڕەحم و بێداد — سەرنگون ئەبێ بەچەشنی فەرهاد
کامە نەمرودە ئەڵێ نامرێ — بە مێشوولەیێ هەناسەی ئەبڕێ
کامە فیرعەونە و حوکمڕانی نیل — هەر لەو نیلەدا ئەخنکێ زەلیل

★ ★ ★

یانێ ئەم دنیا و ئەو دنیا هەردوو — دوو دادگاهن ئەم یەکەم ئەو دوو
چاوشارکێ ناکرێ لەگەڵ خودادا — فێڵ لەگەڵ خودا دادی کەس نادا
( اَللّٰهُ نُورُ السَّماءِ وَالاَرْضِ ) — کە هەتاو دەرچوو ڕووناکە سەر ئەرز
ذەڕە لە بەڕدا و مووروو لە دەریا — ئاشکران لای خوای خاوەن کیبریا
چەندکەس لەکێوا چەند کەس لەشیوا — چەند کەسی ناکەس لەمدیوەودیوا
دەسیان درێژکرد بۆشەخصی بێکەس — تۆڵەی لێسەندن خودای فەریادڕەس
( مَرْتَعُ الظّٰلِمِ مُظْلِمٌ وَخِيمٌ ) — لەوەڕگای ستەم مەرگە بۆ لەئیم
جارێ ڕەشماری دای بە مەڕەوە — دوپشکێ گەستی بە ڕاسەرەوە

★ ★ ★

نازانم ئینسان بە چی بابییە      هەر ڕۆی لە ڕێگای نامرادییە
لە خوا ناترسێ بە بێویژدانێ      ناپرسێ چییە شێوەی ئینسانێ
جارێ تێفکرێ لە ئازاری خۆی      قابیلە شوعوور حاصڵ بێ بۆی
گورگێ مەڕێکی بخوا لە چۆڵێ      دز ماڵی ببا و داپاچێ قۆڵی
لە ئێش و دەردا نەڕوا بەتاسا      ڕاست نابێتەوە هەتا بە عاسا
دەی بۆچێ ئەوەند بێنرخ و کەڵکە      بیر ناکاتەوە لەم ڕەشە خەڵکە



من لەبۆ تۆمە ڕۆڵەی هوشیارم      ببێ بە بەندەی پەروەردگارم
ببێ بە خاوەن شوعوور و زانست      لادەی لە شێوەی پیاوی خۆپەرست
تۆ کە زانا بێ ، بە دەسەڵاتی      بەدەسەڵات بێ ، بە پیت و هاتی
نە ستەم ئەکەی لە پیاوی هەژار      نە خۆت ئەدەیتە بەر دەرد و ئازار
ئەو گیاندارانەی وەك تۆ گیاندارن      وەکو تۆ بە دڵ لە ئێش بێزارن
ئیمڕۆ کە لەوە سبەی لەتۆیە      درێژەی زۆرە ئەم تان و پۆیە
چەندبێکەس کوژران لەمەیدانی جەنگ      چەند بریندار بۆن بێ سرکەو بێدەنگ
خودا چەرخێکی وای هێنایەبەر      چەرخی هەموانی کێشا لە چەمەر
بڕوانە مێژۆی گشت ستەمکاران      با بێ بە عیبرەت لەبۆ بەدکاران
مادەم ئەم دنیا پڕە لە ستەم      بە ستەم جیهان پڕ ئەبێ لە ئەم
فەرزە سەرداری بۆ بەنی بەشەر      هوشیار و دانا و مەرد و دادگەر
هەتا ڕابگرێ ئوسوڵی ئایین      ئەم خەڵکەش هەمۆ بە خۆشی بژین
بەڵام بۆ حاڵی ئەم دادگەرە      چەند شتێ فەرزە ، وەرنە خەتەرە



پێویستە عەقڵ و زانست و شوعوور      لەگەڵ دڵێکی قایم و ئەستوور
سەرۆك مودارا و ڕەشادی ئەوێ      دڵێکی گەورە و گوشادی ئەوێ
دەست و دەهەندە و ناوبانگی ئەوێ      لە بیرا ئاسۆی شەشدانگی ئەوێ
بۆ خاوەن خزمەت تەقدیری ئەوێ      بۆ کاری زەحمەت تەدبیری ئەوێ
هێزی جاذیبە و تەسخیری ئەوێ      بۆ شەرحی مەوقیف تەنویری ئەوێ



سوپا و سەردار و ئالایێ ئەوێ      بۆ خزمەتی عام دارایێ ئەوێ
کورسێ بۆ بە تەخت لەنگەری ئەوێ      کڵاو بۆ بە تاج گەوهەری ئەوێ
خزمەتی دین و نیظامی ئەوێ      مەجلیسی شورای عەوامی ئەوێ
ئەهلی ڕاوێژ و تەگبیری ئەوێ      نائیبی ئەوێ ، وەزیری ئەوێ

بۆ داو و تەزویر تـەحقیقی ئـەوێ | لـە تەحقیقاتـا تـەدقیقی ئـەوێ
لـە موشـکیلاتا صـەدیقی ئـەوێ | لـە کارەسـاتا ڕەفیقـی ئـەوێ
سەفیری ژیـری پـڕ بـیری ئـەوێ | ئیعلامی خـاوەن تەئثـیری ئـەوێ

★ ★ ★

هەتا بۆی ئەکرێ خاوەن تـەلاش بێ | گەلی چـاو تێر و خاوەن مەعاش بـێ
ئەوەی داینـاون لە سوپا و سەرهەنگ | باشیان بژێێنێ بۆ مەیدانی جـەنگ
خـاوەن شـکۆ و داوێنـە پـاك بێ | ئازا و هەڵسوڕاو گورج و چالاك بێ
ناچـارێ نـەبێ قـەت درۆ نـەکا | لەگەڵ ڕەعیـەتا مـن و تـۆ نـەکا
ئەو قسەی کردی مۆری پـەیمان بێ | بـا میللەتـەکەی خـاوەن ئیمان بێ
ئـەوەی ئەینێرێ لەبـۆ ئیش و کـار | ژیر و ئەمین بێ عـەهد و وەفـادار
ئەوەی کـە ئەیکا بـە گەورەی وڵات | خاوەن ئیمان بێ و خـاوەن دەسەڵات
کە شـکات کرا لـە دەسـتی والیێ | تەحقیقی بکـا ( عَلـیٰ التَـوالیِ )
لە هەمۆ باشتر پێویسـتە لـەبۆی | پشتی ئەستوور بێ بە خالیقی خـۆی

★ ★ ★

کە گەورە وابـۆ فـەرمانی فـەرزە | چونکە گەورەیوا خێـری سەرئەرزە
یارمـەتێ فەرزە بە دڵ و بـە گیان | لەگەڵ سـەرۆکی بـە دین و ویژدان
گـەلی بێگـەورە خانـۆی بێبانـە | ئـەفرادی هەمـۆ هەر سەرگەردانە
ئیطاعەی خودا و ڕەهبەر و سـەردار | فەرزە لەسەرمـان تـا ( یوم القرار )

## گوڵی بیستوچوارەم ــ گوڵی تاوان لە خۆ گرتن

کـارێز و کـانێ و ئـاوی ڕۆبـاران
دێنەجـۆش بـە بـا و بـە بەفـر و بـاران
زۆر کـەم ئەبنـەوە لـە وشکە سـاڵا
هـۆی ئەمەش دیـارە لەلای هوشیـاران

پەروەردگاری جیهان لە قورئانی پیرۆزدا فەرمۆیەتی :

**انَّ اللهَ لا یُغَیِّرُ ما بِقَومٍ حتّی یُغَیِّرُوا ما بِاَنفُسِهِم**

واتە : خوای تەعـالا بەڕاستێ هەر نـان و شـانێ دابێتـێ بە کۆمەڵـێ نایگۆڕێ و نایسێنێتەوە لێیان تا ئەو کۆمەڵە ئەو وەزعـە باشـە و ئەو کردەوە پەسەندانەی لەسەری‌بوون نەیگۆڕن .

زوربەی زانایانی تەفسیری قورئان مەعنای ئەم‌ئایەتەیان وا لێداوەتەوە کە

ئیستە نوسیمان . بەڵام هەندێکیشیان مەعنای ئایەتەکەیان تەنها بەم ئەندازەوە نەبەستوەتەوە و بەشێوەیەکی ڕەساتر دەریان بڕیوە ، پالفتەکەی ئەمەیە ئەڵێن خوای تەعالا جیهانی لەسەر ئەسباب و هۆ دامەزراندوە ، وەکو فەرموێەتی : « وآتیناه من كل شيء سبباً ، فاتبع سبباً » . واتە : لە هەمو ڕویەکەوە و لە هەمو لایەکەوە ( ذوالقرنین )مان سەربەرز کردبو بەوە کە هۆی شتمان پیشاندابو ئەویش کوتایی نەئەکرد لە کەوتنە شوێنی هۆی ئەوشتانە ، واتە ئەم ئادەمیزادە مایە و پایەدارە ، خوا دروستیکردوە و دایناوە بە دیاریەکی بەنرخ لە عالەمدا و حورمەتی گرتوە بە عیلم و زانست و بە بیرکردنەوە لەم گەنجینەی جیهانە کە هەمو شتێکی تیایە ، بۆئەوەی تێبکۆشێ و شت ورد بکاتەوە و بیربکاتەوە لە ژین و ژیواری ئیمڕۆ و پاشەڕۆژی و ، حیسابی ژیواری ئەم جیهانە و سەربەرزی قیامەتی خۆی بکا و ، لەو گەنجینەیەدا کەوا لە بەردەستیا ئەسبابی ڕێکخستنی هەردو دنیاکەی تەواو بکا و یارمەتی خەلکیتریش بدا بۆ پێکهێنانی بەختەوەری خۆیان تا بەئەنجامی شیاوی خۆیان بگەن .

پایەی هەرکەسێك و هەر گەلێ لە گەلانی ئەم جیهانە بەئەندازەی یارمەتی خوا و تێکۆشانی خۆیانە بۆ سود وەرگرتن لە جیهان و بۆ سەرکەوتن . جا هەرکەس و هەر گەلێ خوا یارمەتی دان و تێکۆشان و پایەیەکی بەرزیان وەرگرت بۆخۆیان لە دین و لە دنیادا ، ئەوە خوا ئەو پایە و مایەیان لێناسێنێتەوە تا خۆیان لەو وەزعی خۆیانەدا دەستنەکەن بە سستی و پەستی و هەواپەرستی و ، کە کەوتیشنە ئەو شێوە ناشیرینە ئەوسا خوایش ئەو پایە و مایەیانە لێ وەرئەگرێتەوە و کز و کەلەلایان ئەکا . هەروا هیچکەس و هیچ گەلێ لە گەلانی کز و داماوی جیهان لەو کزی خۆیانە دەرناچن و خوای تەعالا لەو داماویە دەریاناکا تا خۆیان تێنەکۆشن و زەحمەت نەکێشن ، واتە بەهۆی ڕاستی و ڕاسالی و سەبەبسازییەوە لەو پایە نزمەی خۆیان دەرئەچن .

بەممەعنا هەرچەند خودا خۆی خالیقی هەمو شتێکە و هەرچی خواستی بێ ئەیکا ، بەڵام کردوێشیەتی بە عادەت و قانون کەوا ئادەمیزاد لەسەر ئەندازەی تێکۆشانی خۆی بەرز ببێتەوە ، وەکو فەرموێەتی : «وان ليس للانسان الا ما سعى » . واتە : کەس هیچی دەسگیر نابێ مەگەر بەهۆی سەعی و تێکۆشانی خۆیەوە نەبێ . کەواتە پێویستە ئادەمیزاد هەمیشە دو چاوی هەبێ ، چاوێکی لە ئەسباب و کەوتنە شوێنی ئەسباب بێ و چاوێکیشی لە خوداوە بێ بۆ یارمەتیدانیان . کەواتە هەرکەسێ توشی بەختیاری و پیرۆزی و بەرزی بو با ئەنای خودا بکا لەسەر ئەوە کەوا یارمەتیداوە بۆ هەولدان و خۆیشی هەولیداوە و ، ئەگەر توشی باری لار و بەدبەختی و ئازار بو ، با سەرزەنشتی خۆی بکا چونکە خۆی بە ڕێگەی ڕاستی پیرۆزیدا نەڕۆیشتوە .

( بناء علیه ) پێویستە ئینسان هەمیشە حیسابی خۆی بکێشێ و ئەگەر کردەوەیەکی لاری لێ وەشایەوە تاوان لە خۆی بگرێ واتە موحاسەبەی خۆی بکا و خۆی خەتابار بکا و باوەڕی وابێ کەوا خەتای خۆیەتی . ئەگەر گیرۆدەی دەردێ بۆ با باوەڕی وابێ کە بەهۆی بیروباوەڕی نابار و کردەوەی ناپەسەندی خۆیەوە تۆشی بوە وەك پێغەمبەر فەرمویەتی : «کَیْفَمَا تَکونوا یوَلّی علَیکمْ» واتە: ئێوە خۆتان هەرچۆن بن و ڕۆتان لە هەر شتێ بێ خوای گەورە بەوگوێرەیە گەورە و سەردار و سەرۆکتان بۆ ئەنێرێ . ئەگەر خراپیش بن پیاوێکی خراپتان بۆئەنێرێ وەك لە حەدیثایە : « کما تَدینُ تُدانُ » واتە : وەکو تۆ چۆن ڕەفتار ئەکەی لەگەڵ خەڵك خۆیشت هەروا ڕەفتارت لەگەڵ ئەکرێ . ئەمە یاسا و قانۆنی خوایە و خوایش لە قورئاندا فەرمویەتی : « ولَنْ تَجِدَ لِسنَّةِ اللهِ تَحْویلاً » واتە : قەت گۆڕانت بۆ یاسای خوای گەورە دەست ناکەوێ و تا ئەڕوا ئەم یاسایە هەروا ئەبێ .

ئەوەی تێبکۆشێ و ڕەنجبدا ئەبێ بکەوێتە خۆشییەوە . ئەوەش کە تێنەکۆشێ هەر بە داماوێ ئەمێنێتەوە ، تا ئەکەوێتە گۆڕینی حالی خۆی . کە کەوتە گۆڕینی حالی خۆی ، خوایش بە یاساکەی خۆی وەزعی ئەوکەسە ئەگۆڕێ . خوا لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت وەختی خۆی بەنیئیسرائیلمان هەڵبژارد و عیلم و زانست و پایەی بلندمان دانێ ، کەچی پاشان ئەوان دەستیان کرد بە پەیمان شکاندن و کوشتنی پێغەمبەران . ئێمەیش لەسەر ئوسوڵی ڕێوشوێنەکەی خۆمان نەفرین و لەعنەتمان لێ کردن و دوورمانخستنەوە . میللەتی ئیسلامیش وەختی خۆی تێئەکۆشان و ئایینی ئیسلامیان بە هەمو وڵاتێکدا بڵاوکردەوە و پایەی خۆیانیان بەرزکردەوە بەهۆی بیروباوەڕی چاکە و دەست گرتنەوە بە فەرمانی خواوە و غەزاکردن لە ڕێی خوادا . پاشئەوەش کە وەزعی خۆیانیان گۆڕێ و بیروباوەڕیان تێکچو و کردەوەیان خراپ بۆ ، خوایش ئەو پایەیەی لێ وەرگرتنەوە و بەو دەردەی بردن کە ئیستا هەمۆمان ئەیانبینین .

هەر لەسەر ئەم نیظامە هەر گەلێ پشت لە فەرمانی خوا هەڵبکا خوایش پشت لەو هەڵئەکا و گیرۆدەی ئەکا بە دوژمنی نابار و نامەرد . کاتێکیش کە ئەو گەلە بگەڕێتەوە بۆلای خوا ، خوایش میهرەبانێ لەگەڵ ئەنوێنێتەوە . هەر گەلێ دەردی بێزانستێ و بێناموسێ و بێغیرەتێ و بێئەخلاقێ تێدا بڵاو ببێتەوە و ئارەزۆی لەسەر پایەی بلند نەبێ ، خوایش لە پایەی بلند بێبەشی ئەکا و هەروا ئەبێ تا ئەگەڕێتەوە و پەشیمان ئەبێتەوە .

پاشئەوە کە دەوڵەتی ( سامانێ ) فەوتا لە خوراساندا و دەوڵەت کەوتە دەستی ( غەزنەوی )یەکان ، کابرایەك لە پیرێکی سامانێ پرسی کە بۆچێ ئەو گەورەییتانە لەدەست چو ؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی : «از بیداری شب و خوابیدن بامدادان» . واتە : وەختی خۆی سامانییەکان شەوان بەپێی ئوسوڵی ئادەمیزادی

ڕاساڵ ئەنوستن و سبەینان زۆ لە خەو هەڵئەستان بۆ نوێژ و ئەچوون بەدوای کاری خۆیاندا و بەوجۆرە پایەیان بەرزبووەوە . پاش‌ئەوە دەستیان‌کرد بە سەفاهەت و شەونوخنی و خەریکی ڕابواردن و شەراب‌خواردنەوە ئەبوون ، لەبەرئەوە سبەینان خەویان لێ‌ئەکەوت و نوێژیان نەئەکرد تا خوا ئەو دەستەڵاتەی کز کردن و خزمەت‌کارانی خۆیان حوکومەتەکەیان لەدەست دەرهێنان. ئەنجامی ئەم باسە ئەوەیە دوای خواستی خوا بەرزی و نزمی هەرکەسێ یا هەر میللەتێ بەسراوە بە هوشیاری و بێهۆشی خۆیانەوە، تا هوشیارتر بن پێشکەوتوتر ئەبن و تا بێ‌هۆش‌تر بن پاشکەوتوتر ئەبن . زوربەی ئەسبابی هوشیاری دینی و دنیایی گەل بەهۆی گەورەی دنیایی و دینی گەلەکەوە دەستگیر ئەبێ. واتە تا فەرمانداراننی دینی و دنیایی گەل ساغ‌تر و ڕاساڵ‌تر و بەهۆش و وێڵ و ماریفەت‌تر بن و دڵسۆزتر بن بۆ خەڵك و زیاتر لەسەر پەیڕەوی پێغەمبەری ڕەهبەر بڕۆن بەڕێوە سەلامی خوای لێ بێ ، کۆمەڵەکەیش بەرزتر ئەبێ و بەپێچەوانەشەوە.

پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموێەتی : « صِنْفانِ اذا صَلَحا صَلَحَ الناسُ واذا فَسَدا فَسَدَ الناسُ العُلَماءُ والاُمَراءُ » . واتە : دوو تاقم هەن لە ئادەمیزادا کە ئەوان ساغ و ڕاساڵ و بێ‌گەرد بن ، خەڵکیش ساغ و ڕاساڵ و بێ‌گەرد ئەبن . کە ئەوانیش خراپ و خودپەرست و ئارەزوپەرست بن خەڵکیش خراپ و خودپەرست و ئارەزوپەرست ئەبن . ئەوانەیش تاقمی مەلا و تاقمی حوکمڕانانن . بەڕاستی ئەم فەرمودەیە زۆر بەرزە و بە بەراورد و تەماشای مێژو دەرکەوتوە کەوا ڕاستە . بناغەی ڕاستی ئەمانەیش لەوەوەیە کە خواپەرست بن و خۆپەرست نەبن و بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد تێبکۆشن تا خۆیشیان و نەتەوەکەیشیان بە سەربەرزی بژین ، چونکە ئەگەر مەبەستیان لە تێکۆشانیان تەنها خۆیان بێ ئەوەندەی پێ ناچێ وەزعیان لەناو خەڵکدا دەرئەکەوێ ، ئەوسا کەس بەگوێیان ناکا و بەفەرمانیان ناجوڵێتەوە و لەئەنجامدا ئەفەوتێن و گەلەکەیشیان سەرگەردان ئەبێ ، چونکە دڵسۆزی و پاکی دەستەو بەستەیش بەسراوە بە دڵسۆزی و پاکی سەرۆك و فەرماندارەوە.

ئەگێڕنەوە چەندکەسێك لە یارانی پێغەمبەر سەلامی خوایان لێ بێ بە دیل کەوتنە دەستی کافرەکانی مەککە . ئەوانیش داوایان‌کرد لێیان ئەگەر لە ئیسلامەتی پاشگەز ببنەوە ئازادیان ئەکەن ، ئەگینا ئەیانکوژن . موسوڵمانەکان لەبەر ساغی خۆیان لە دینا گوێیان نەدا بە قسەی کافرەکان . لەئەنجامدا کافرەکان دوکەسیان لێ کوشتن . جا ڕویان‌کردە سێهەمەکەیان پێیان‌وت تۆ بۆچی خۆت بۆ ( محمد ) ئەدەی بە کوشت ؟ تۆ چەند منداڵی ورد و جوانت هەیە پاش تۆ بێ‌ناز ئەکەون و سەرگەردان ئەبن . بەڵام ئەگەر بێیتەوە بۆلای ئێمە خۆیشت و مناڵەکانیشت بە خۆشی ڕائەبوێرن . ئەویش لە وەڵامیاندا وتی : بە خوا قەسەم حەزئەکەم صەد ساڵ عومرم بێ و هەمو ڕۆژێ جارێ

سەرم‌ببڕن و زیندوّم بکەنەوە بۆ سەربڕینێکی‌تر ، بەڵام دڕکێ نەچێ بەپێی حەزرەتی موحەممەددا . کە ئەم قسەیەی کرد ئەمیشیان شەهیدکرد و گیانی پاکی چوە پاڵ گیانی دوّ هاوڕێکەی کە پێشتر شەهیدیان کردبوّن . مەبەست ئەوەیە نوّری ئیخلاص و دڵسۆزێ حەزرەت دروّدی خوای لێ بێ بەجۆرێ چوّبوە ناو دڵی یارانی پێغەمبەرەوە هەرکەسێ لەوان لەئاستی خۆیا بوّبوّ بە کێویّکی ئاگر و بە نوّری ئیخلاص ئەسوّتا .

ڕۆلە هوشیارە بەختیارەکەم !    شیرین ڕەفتار و خۆش‌گوفتارەکەم !
گەردوّن هەمیشە بە سوّڕ و دەورە    سوّڕێکی لەڕە و سوّڕێکی چەورە
واتە چەرخێکی پڕە لە خۆشێ    چەرخێکی پڕە لە تاڵێ و توّشێ
ناپرسێ چیە هۆی ئەم دوانە    بۆچێ ئەگۆڕێ ئەم نیشتمانە
تا من پێت‌بڵێم بە دڵ ئارامێ    بەڵکو توّش بە دڵ هۆکەی بفامێ
گەردوّن بە وێنەی دوّخی ئەستوّرە    فریشتەی خودای لەسەر مەئموّرە
دوّخ‌ڕێس حازرە وێنەی نیگەهبان    مادده وەرئەگرێ و ئەیڕێسێ بوّمان
لە خورێ و لوّکە ئاوریشم و کەتان    لە هەر نەوعی‌تر دەستکەوێ بوّتان
ئەویش ئەیڕێسێ و دای‌ئەنێ کوّکوّ    کارخانەیش ئەیبا لەبوّ تان‌وپوّ
ئەو تان‌وپوّیە ئەکا بە پوّشاک    لە حەریری پاك ، لە فاسوّنی چاك
لە شیرداخی ساغ لە شەیتان‌بێزێ    شەبەنەبەڕوّژ، سورمەی شەودێزێ
جا لەسەر دەفتەر بەپێی تەسلیمات    قوماش دەرئەچێ وڵات بە وڵات
هەرکەس ماوەکەی لەنرخا بەرزە    قوماشی ئەوە تاقانەی ئەرزە
ئەوەش ماوەکەی ئایەخە و نەوێ    ئەبێ بە پەندی خەڵکی سەرزەوێ
پوختەی ئەم باسە کردەوەی ئادەم    بەرگە و پوّشاکە و سەربەرزێ عالەم
خەتای خوّتانە بە بەد تەلاشێ    بوون بە عیبرەت بە بەد قوماشێ
دوّخی بێچارە کەللە دارێکە    دوّخ ڕێسیش وێنەی خزمەتکارێکە
ئەم باسە بەسە بوّ دنیا و بوّ دین    بوّ بەرزێ و نزمێ ، بوّ ژان و بوّ ژین

★ ★ ★

گەلێ زانا بێ و کرداری چاك بێ    بوّ پیرۆزێ خوّی چوست و چالاك بێ
دنیا وەرئەگرێ مایەی ئەو سەرجەم    ئەیکا بە بەرگی پیرۆزی عالەم
پەی‌پەی دێ لەبوّی ئەنا و ئافەرین    لە فریشتەوە بە نەوای شیرین
ئەبێ بە دارای ئەدەب و زمان    ئەبێ بە خاوەن پەیمان و ئیمان

★ ★ ★

گەلێ نەزان بێ و نەفام و ناشێ    بە صوّرەت ئادەم بە سیرەت وەحشێ
لەبەر نەفامێ تار ئەبێ لە شار    سەر و کەللەی خوّی لێ ئەبێ بە بار
گەردوّن لەمانەش مایە وەرئەگرێ    لەپاش ڕێسانی بوّ کارگە ئەبرێ

لەو تانوپۆیە بەرگی وا ئەگرێ      بۆ وەحشێ نەبێ کەلکی کەس نەگرێ
فریشتەی فەلەك لە جێی ئافەرین      بۆیان ئەنێرێ لەعنەت و نەفرین
لە تۆڵەی ئەمەدا گیرۆدە ئەبن      نەك هەر بە بەشەر ، بە دیو و بە جین
ئەمەیە مەعنای فەرموودەی ڕەهبەر      ( کَما تکونوا ) باش بیکەن لەبەر
( لا یُغَیِّر ) فەرمودەی خودا      بۆ خەیر و شەڕی تۆیە جاڕ ئەدا
ئادەمێ ئەبێ خوداپەرست بێ      ئەمجار شانازێ بە شان و دەست بێ
ڕۆڵە بۆ خودا وەك نەذری ژۆژۆ      بە دڵ بڕوانە بۆ پەڕەی مێژوو
گەلێ کەسی پەست لە ڕوی جیهانا      سەرکەوتن بەسەر تەختی شاهانا
شاهێ بە عیلمە و صەنعەت و ئەخلاق      بەمانە ئەگەی بە بەرزێ ئافاق
ئینسان ئەزانێ لەبەر نەزانێ      بێئاو ئەخنکێ لە ( هەزار خانێ )
گەلێ بێ صەنعەت لەبەر بێکارێ      دێتە ناو ڕیزی حەیوانی بارێ
گەلێ بێ بەهرەی ڕەوشت و ئەخلاق      چارەی دیزە و ترش وەك ترشەسماق
ئەخلاقی مەردان مایەی تەمکینە      مایەی نزوڵی ( روح الامین )ە
بۆیە خوا فەرموی بەشێوەی تەعظیم      (( انكَ لعلی خُلُقٍ عظیم ))
بە نوری ئەخلاق دڵ گوشاد ئەبێ      بە نوری فەیضی خودا شاد ئەبێ
بەگورتێ پیشە و زانست و ڕەوشت      دنیات بۆ ئەکەن بە باخچەی بەهەشت

★ ★ ★

ڕۆڵەم کە مەتلەب گەیشتە ئەم جێ      با شەرحی بکەم ئاگات سا لێ بێ
ئینسان کە پوختەی هەموو عالەمە      ئەتەوەی پاکی حەووا و ئادەمە
بەتەنیا ناژێ بە ژینێکیوا      پیت و پیرۆزێ پەیدا بێ لەوا
پێویستە کەوا بچێتە مەیدان      تا دابینیکا خۆشبەختێ ژیان
مەردێکیش پێ بە مایەی بینا      ئەبێ مەردێ بێ شیاوی ئەمنا
ئەم جۆرە مەردە کاتێ دێتەجێ      گەلێ هونەری بەشەرێ تیابێ
هونەریش بێجگە لە بەشی فیطرەت      هەمو دێتەجێ بە دەرد و زەحمەت
بە خوێندن لەلای عالمێکی بەرز      بە خزمەت لەلای گەورەیەکی ئەرز
یەعنی بە میر و بە مەردی زانا      ڕۆڵە پێئەگەن لە گشت زەمانا
حەزرەتی ڕەهبەر فەرموی (صنفانِ)      واتە دوو تاقم ماددێ و ڕۆحانێ
ئەگەر موخلیص بوون بۆ خودای عالەم      ئەسوڵحێ هەموو تیرەی بنیادەم
ئەگەر خراپ بن ئادەمێ هەموو      ئەکەونە گێژاو نەك هەر یەك و دوو

★ ★ ★

با فەرمانداران توزێ یەك دڵ بن      مایەی گوشادێ گرێ و موشکوڵ بن
گەلێ دوودڵ بێ ئاگا بە مەنزڵ      بیشگاتە مەنزڵ هەر ئەگلێتە گڵ
با زانایانی دینی پێغەمبەر      بۆ ڕەزای خودا ببن بە ڕەهبەر

بەڵکو چـرایێ هـەڵکەن لـە ژینـا دەستی خەڵك بگرن بـە ڕێگای دینا
وەرنە هەر سۆچێ کە بێتـە ڕێمان سەری ئەو سـۆچە مەربوطە پێمان
لەبەر ئەو سۆچە ئـەبێ بێ‌گومـان بەشێ لـە تـاوان بگرینـە خـۆمان
لەسەر بەراورد ئـەم دەردە ڕاسـە نەك لەلای عامـە ، فیکری خەواصە
( نامێ ) بە هیوای خوای ( عز و جل ) ئەڵێ حەل ئەبێ موشـکیلاتی گـەل

## گوڵی بیست‌وپێنجەم ـ گوڵی عیبرەت وەرگرتن

سەعید بەمەعنا شەخصی بەختیـار
بە کەسێ ئەڵێن زانـا بێ و هوشیار
عیبرەت وەربگرێ لە ئەوزاعی خەڵك
بە فێربونی دەرس چـەرخی ڕۆزگار

ڕەهبەری نازدار سەلامی خـوای لێ بێ فەرموێەتی :

السَّـعِيدُ مَـنِ اتَّعَظَ بِغَيْرِهِ

واتە : ئینسـانی بەختیار ئەوکەسەیە عیبرەت لەو کارەساتانە وەربگرێ کە بەسەر خەڵکدا دێن .

ئادەمیزاد هەر بە میهربانێ خوا بە فیطرەت بەشێکی هەیە لە بیروباوەڕ و وردبونەوە لە چاك و خراپ و جوێ‌کردنەوەیان لە یەکتر بۆئەوە کە چاکە بکا و لە خراپە لابدا . هەروا بەشێکیشی هەیە لە تەمێ و تەربییەی خانەدانی خۆی و لە خوێندنگای عادەتییەوە دەسگیری ئـەبێ و لەم‌ڕێگـایانەوە چەند دەرسـێك وەرئەگرێ .

بەڵام بەختیار ئـەوەیە ، وەکو لـەم ڕێگایانـەوە سـود وەرئەگرێ لەو کارەساتانەیش سود وەربگرێ کە بەسەر خەڵکدا دێن . بۆوێنە کە چاوی‌کەوت بە کەسێك لەبەر بەدکردەوێ و بەدڕەوشتێ خۆی تۆشی ناخۆشییەك بۆ ، ئەو ئەم ڕەوشتانە نەکات بە ڕەوشتی خۆی . یا یەکێك بەهۆی تەمەڵێ و بێکارییەوە تۆشی ناخۆشێ بۆ ، ئەو تەمەڵێ نەکا ، یا یەکێك بەهۆی نزیك کەوتنەوەوە لـە زۆردار تۆش بۆ یا بەهۆی برادەرییەوە لەگەڵ هەرزە و نەفامان تۆش بۆ ئەم لەم جۆرە وەزعانە دۆرکەوێتەوە . هەروەکو ئەگەر خۆی جارێ لە کردەوەیەکەوە زیانێکی تۆش بۆ جارێکی‌تر ئەو کردەوەیە نەکاتەوە . مەشهۆرە ئەڵێن : « کۆسە بەندێکی دێ و پەندێکی گرت » .

ئەگێڕنەوە پرسیاریان کرد لە لوقمانی حەکیم : لە کێــوە فێری ڕەوشتی باش و حیکمەت و ئەدەب بوی ؟ ئەویش وەڵامی‌دایەوە وتی : لە بێ‌ئەدەبانەوە ، واتە ئەوەی ئەوان ئەیانکرد من نەم‌ئەکرد و لێی دوڕئەکەوتمەوە .

**ڕۆڵەی خۆشەویست نوری چاوانم ! — کۆڵەکـەی ئەســتوور مـاڵی ژیانم !**
**گیان‌لەبەر گشتی گیـانی خۆش‌ئەوێ — بەتایبەت بەشــەر شـانی پێ ئەوێ**
**جا ئینســان کاتێ کەوتــە دنیـاوە — کارەســـاتی دێ لــە هــەمو لاوە**
**ئەو کارەســاتە بەرچـاوی ئــەگرێ — دەرسی کەرامەت بۆ خۆی وەرئەگرێ**
**کــە یەکێــکی دێ بــە تاوانبـارێ — پایــەی دانــەوێ بــە شەرمەسارێ**
**پێی عەیبە ئەویش هەر بــەو تاوانە — خۆی بهـاوێتە ئــەو شــەرمستانە**
**جەردەیێــکی دێ گــیرا و ســەربڕا — پیاوکوژێکی دێ تۆلــەی لێ ســەنرا**
**جەردەیێ نــاکا و کەسیش نــاکوژێ — نەکـا تــاڵاوی وەك ئــەو بچــەژێ**



**هــەر بەم‌وێنــەیە لــە هەمــو بـابێ — لە هەمو فەصڵێ و لە گشت حیسابێ**
**چ بـــۆ ئێنـاره چ بــۆ ئیـــداره — چ لە بــۆ غەوغا و فیتنــە و ئیشـاره**
**ئینسانی هوشیار عیبرەت وەرئەگرێ — نەکـا ســەرەنجام لــەداخا بمــرێ**
**یەعنێ بــەدڕەفتار نــەبێ بــە مایــە — تــا بــەختیاران بگــەن بــە پایــە**
**یا کەسێکیان دێ بــۆ خۆی تێکۆشا — لــەڕێی ژیانــا مەینــەتی کێشـــا**
**نــەبێ یــەکێ‌تر بــەو ڕێــدا بــڕوا — هیوایــە ڕەنجــی بــە زایــە نــەڕوا**
**یا گەلێکیان دێ یەك حاڵ و یەك دڵ — زو بە سەربەرزێ گەیین بــە مەنزڵ**
**بــا گەلێــکی‌تر چــاوبکەن لـــەوان — هیوایــە بگــەن بــە پایــەی ئــەوان**
**شاهەنگ کە ویستی لە کون بێتەدەر — هەنگ ڕیز ئەبەستن لەم‌بەر و لەوبەر**
**بە نەغمە و نەوای خــۆیان ئاسـایێ — بە مۆســیقای ساز شــێوە نەوایێ**
**تا شــا بــە جیلــوە دێتــە دەرەوە — ئەفــڕێ بە دو بــاڵ لە ڕاســەرەوە**
**کێ هەنگێــکی دێ لــەم هــەنگەژاڵە — مۆســـیقا لێــدا بــۆ زەردەواڵــە**
**جا زۆر بەســوودە لەســەر بســـاتا — عیبــرەت وەربــگرن لــە کارەســـاتا**
**ڕۆح و گیــانی تــۆ بــۆ ژین و دینــە — ئەم دەرسە دەرسی ( عين اليقــين )ە**
**لــە خودام ئــەوێ بگەن بــە پایــە — لە دەرسی ( نامێ ) وەربگــرن مایــە**

# گوڵی بیستوشەشەم
# گوڵی خۆدوورگرتن لە هەرچێ گومانی خراپەی لێ بکرێ

**ئەو دڵەی دوورە لـە وەهم و گومـان**
**پڕ ئەبێ لە نوور ، لـە دین لـە ئیمان**
**پێویستە چـاوت دوور بگرێ لە تۆز**
**وەڵا فەرزە پارێز لە ئاشووبی هـۆز**

پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی :

**دَعْ ما یَریبُكَ اِلی مـا لا یَریبُكَ**

واتە : لابدە لە هەرچێ بتخانە شوبهە و گومانەوە و ڕوبکەرە شتێ گومانی لێ نەکرێ .

پێغەمبەری نازدار لەم فەرمودە بەرزەیـدا موسوڵمانانی بانگ کردوە بۆ پارێزکردن لە هەر شتێ کە لەوانەبێ بکێشێتەوە بۆ تاوانبارێ ، چونکە مادەم ئینسـان خۆی نەپاراست لە جێگەی گوماناوێ ، جەسارەت پەیدا ئەکا و گـوێ نادا بە حەرام و لەوەوە ئەکەوێتە گوناهەوە ، وەکو کەسێ نزیك بکەوێتەوە لە ئاگرێکی گەورە و بەتین ، لەوانەیە بکەوێتە بەر شەپۆلی بڵێسـەی ئەو ئاگرە و بسوتێ . مەسەلا بۆ وێنەی ئەم فەرمودەیە ئەگەر کەسێ بکەوێتە گومانەوە لە ماڵی شەخسێکا ئاخۆ حەرامە لەبەرئەوە کە کابرا مەشهورە بە حەرامخۆر یا حەڵاڵە لەبەرئەوە کە مەعلوم نیە ئـەم میقدارە ماڵە لە حەرامەکە بێت ، ئەوە هەرچەند بەم گومانە حەرام نابێ ، بەڵام چاکوایە نزیکی ئەو ماڵە نەکەوێ .

هەروا لـە فەرمودەیەکیترا بەدرێژێ ئەم مەوضوعەی بەیـان کردوە بە فەرمودەیەك کـە مەعناکەی ئەمەیە : ئەوەی بە نەصصی قورئـان و حەدیث حەڵاڵ بێ یا حەرام بێ ئەوە ئاشکرایە کە تێکەڵبونی حەڵاڵ ڕەوایە و تێکەڵبونی حەرام ناڕەوایە . بەڵام لەنێوان ئەم دو بەشەدا گەلێ شت هەیە جێگای گومانی حەڵاڵێ و حەرامێن و گەلێکەس ئاگادار نین لێیان و نازانن ئاخۆ بەڕاستێ لە بەشە حەڵاڵەکەن یا لە بەشە حەرامەکەن لەبەرئەوە کە حوکمیان لە نەصدا نیە و هەڵئەگرێ لەولا بن یا لەملا . کەسێ خۆی لەم جۆرە شتانە بپارێزێ کە جێگەی شوبهەن ئەوە دینی خۆی ڕزگار کردوە چونکە پرسیاری لەسەر خۆی لابردوە و ناموسی خۆیشی پاراستوە چونکە دەمی خەڵکی لە خۆی گرتوە . هەرکەسێکیش بکەوێتە ناو ئەم شتانەوە ئەوە خۆی ئامادە کردوە کە بکەوێتە ناو حەرامەوە ، لەبەرئەوە کە بەهـۆی تێکەڵبونی بە شوبهەوە گوێ بە حەرامیش نـادا و ئەیکا یاخود لەبەرئەوە کە قابیلە هەر ئەو جێگە شوبهەیە حەرام بێ وەکو شوانێ کە

گەلەی خـۆی بە دەوری قۆرغـدا بلەوەڕێنێ دوور نیە گەلـەکەی بکەوێتە ناو قۆرغەکەوە .

جا ئەی موسولمانینە ! ئاگاداربن هەموو خاوەن دەسەڵاتێ قۆرغێکی هەیە بۆ حەیوان و ڕەوگی خۆی مەنعی خەلـکی لێ ئەکا . قۆرغی خوای تەعالایش ئەوەیە کە حەرام بێ و بە قەطعێ خوا ڕەزای نیە کەسێ نزیکی حەرام بکەوێ . بیشزانن لە لەشی ئادەمیزاددا پارچە گۆشتێك هەیە جێگەی بیروباوەڕە ، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە لەگەڵ یاسای ئاییندا سازا هەموو لەشی ئینسان لەگەڵ دیندا ئەسازێ . لەگەڵیشی نەســازا باقی لەشیش ناسازێ . ئاگاداربن ئـەو پارچە گۆشتەش پێی‌ئەڵێن دڵ . جـا حەزرەت درۆدی خـوای لێ بــێ وەکو مەنعـی موسولمانانی کردوە لە تێکەڵبوونی شوبهە ، خەڵکیشی ترساندوە لەوە کە بەهۆی خۆش‌ویستنی هەندێ شتەوە کەڕ و کوێر ببن و خۆیان پێ نەگیرێ . مەســەلا ئینسانێ خوازبێنێ ژنێ ئەکا و هەندێ کـەس بە واتــا ئەڵێن شیری یەکتریان خواردوە ، ئـەوە هەرچەند بەو واتەیە حەرام نابن لە یـەك ، بـەلام چاكوایە ئینسان خۆی دوور بگرێ لە ژن‌هێنانی‌وا و بەهۆی خۆش‌ویستنی ژنەکەوە چاوی لەئاست ئەم خۆپاراستنەدا کوێر نەبێ و گوێی کەڕ نەبێ ، وەك مەشهوورە ئەڵێن (حبُّكَ لِلشَّیْءِ یُعْمی وَیُصم) واتە خۆش‌ویستنی تۆ بۆ هەندێ شت کوێر و کەڕت ئەکا لەئاست ناڕەوایێ و ناڕەســایێ شتە خۆش‌ویستراوەکەدا . بۆیە پێویستە ئاگـات لە خۆت بێ بەهۆی ئـەو مەحەبەتەوە نەکەوێتــە گێژداوی میحنەتەوە .

هەروەك چــۆن پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ مەنعی خەلـکی کردوە لە نزیك‌بوونەوە لە حەرام و وریای کردوونەتەوە لەبارەی خۆ تێکەڵ‌کردنەوە لەگەڵ کەسێك یا شــتێك کە جێگەی شـوبهە بێ ، هەروەهــا مەنعیشی کردوون لــە گیرۆدەبوون بــە دوو شتەوە کە گەلێ تــاوان لە تێکەڵێ ئەو دوانــەوە ڕوو ئــەدا کە ئەوانەیش ماڵی دنیا و ئافرەتن و ، فەرموویەتی : « اِتَّقُوا الدُّنْیا واتَّقُوا النِّساءَ فانَّ اِبْلیسَ طلاّعٌ رَصّادٌ » . واتە : خۆتان بپارێزن لە بایێ‌بوون بە دنیا بــە هەموو بەشــێکیەوە و لــە مەیل‌کردن بـۆلای ژنان و خــۆ گیرۆدە کــردن بە خۆشەویستییانەوە ، چونکە بەڕاستێ شەیتان وا لە کەمیندا و خۆی مەلاس داوە ئەیەوێ هێرش بێنێ بۆ سەرتان . بەتایبەتێ ژن چونکە شەیتان هیچ‌داوێکی‌وای نیە کە ببێ بەهۆی دیل‌کردنی پیاو ئەوەندەی داوی تێکەڵبوون بە نافرەتەوە پتەو و بەتین بێ .

| | |
|---|---|
| **ڕۆڵەی خۆشەویست ، بینایێ چاوان** | **جێی هانا و هیوای دوارۆژی ئینسان** |
| **ئەگەر ئەتــەوێ بەدوور بێ و ئــازاد** | **لە قاری خــودا و لــە ژاری عیبــاد** |
| **ئیشێ هاتەڕێت جێی شوبهە و گومان** | **خۆتی لێ لادە دەخیـل صــەد ئامان** |

پارێز لە پیسی خولقی پاکانە / تێکەڵ بوونی پیس بۆ ناپاکانە
کاری نەزانی ڕەوایە یا نە / خۆی تێهەڵاوێ وێنەی دێوانە
ئیشی نارەوا لەبۆ ڕەوەندە / نەك بۆ ئینسانی مەردان پەسەندە
پێشینان وابوون بە وەرع و پارێز / لە ئاوی شەوێ ئەچوونە تەرێز
لەبەر یەك حەرام وا لایان ئەدا / لە چەند حەڵاڵیش ملیان بائەدا
نەئەچوونە پاڵ دیواری قەرزار / نەك لە سێبەریا بکەن بە ئازار

★ ★ ★

لەبەر ئیحتیاط بە وەرع و تەقوا / موفتی لای ئەدا لە گەلێ فتوا
ئەوەی خاریج بۆ لە بیری جومهوور / وەریان نەئەگرت هەتا لە مەشهوور
نەك وەکو ئیمڕۆ لەبەر یەك نیاز / دە فتوا ئەدەن بە دە قەولی شاذ
بۆ ئەحکامی دین زانای بەئینساف / نزیك نەئەکەوت لە شوێنی خیلاف
یا لای بەهێزی ئەکرد بە مەبەس / لەبەر سەربەرزی لای خودای ئەقدەس
تەفسیری ئایەت یا مەعنای خەبەر / حەواڵە ئەکرا بە زانای ڕەهبەر
نەك وەکو ئیمڕۆ هەرکەسێ بۆ خۆی / موجتەهیدێکە چۆن هەڵکەوێ بۆی
گوێ نادەن بەوە خەیر وا لای کۆمەڵ / چونکە تاك چاکەی قەت نابێ لەگەڵ
نازانن دەلیل حەدیث یا ئایەت / پێویستی جەمعە و ضەبط و دیرایەت
برام من و تۆ بۆ باسی ئیمان / ئەبێ لانەدەین لەو گفتەی دامان
گفتی لانەدان لە ڕێگەی خودا / دەس بەردار نەبوون لە ڕێگەی هودا

## گوڵی بیست و حەوتەم ـ گوڵی بەهەشتییەتی

بەهەشت وا لەناو ئێش و ئازارا
بە وێنەی گەنجە لە ئەڵقەی مارا
دۆزەخ وا لەناو ئارەزووی نەفسا
ئارەزووبازان نوقمن لە نەقسا

پێغەمبەری نازدار ، درودی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی :

**حُفَّتِ الجَنّةُ بِالمَكارِهِ وَحُفَّتِ النّارُ بالشّهَواتِ .**

واتە : بەهەشت دەورە دراوە بە زەحمەت‌کێشان و ئێش و ئازار و دۆزەخیش دەورە دراوە بە ئارەزووی نەفس و هەوەس‌بازێ .

لە ڕێبازی ئایین و شەریعەتەوە وا دەرئەکەوێ کەوا خوای تەعالا ئەم ئادەمیزادەی بۆ خوداناسین و بەندەیی و گەردن کەچی لە ئادابی دینا دروستکردوە و ، ئەیەوێ ئینسان ئینسانێکی کامڵ بێ و توانای بەسەر ئارەزووی نەفسی خۆیدا بشکێ ، چونکە ئیسپات بوە کە نەفس فەرمان بە شەهەوات و ئارەزووبازێ ئەدا و ، ئەگەر ئینسان بکەوێتە شوێنی نەفس

ئەبەستریتەوە بــە ئارەزۆبازییەوە . مادەم ئینسانیش کەوتــە دوای هەوای نەفس و ئارەزۆ ناتوانێ ئــەرکە گەورەکانی مرۆڤایەتێ بــەجێبێنێ . مەســەلا عەفو و چاوپــۆشێ و قەدری خەڵك ڕاگرتن و خزمەتی داماوکــردن و پەیمان بەجێهێنان و ڕاسالێ لە مامەڵەدا و ڕاستێ لە وتاردا و یەك دڵ بۆن لەگەڵ خەڵکا ، ئەمانــە هەمۆ ڕیاضەت و تەمێکردنی نەفسیان ئەوێ . هــەروا خۆ مەنعکردن لە ئارەزۆی نەفس لەکاتی تەماعدا و عیففەت و داوێنپاکێ لەکاتی هێرشی ئــارەزۆی نەفسدا کــە پەیوەندیان بە هێــزی ئینسانەوە هەیــە و ، غەزاکردن و خۆبەکوشــتدان لەڕێی خــوادا و بۆ بەرزکردنەوەی حــەق کە بێ فیداکارێ جێبەجێ ناکرێن و ، تا ئینسان مەنعی خۆی نەکا لە هەوا و ئارەزۆی نەفس ناگا بە پایەی بەرز و هەرکاتێ توانای بۆ بەسەر ڕاگرتنی نەفسی خوێدا ئەوسا پێئەنێتە بارەگای کەرامەت و پلە بڵندێ لای خودا ، وەکو لە قورئاندا وتراوە : « وَاَمّا مَنْ خافَ مَقامَ رَبِّهِ وَنَهی النَّفْسَ عَنِ الهَوی ، فَاِنَّ الجَنَّةَ هِیَ المَاوی » . واتە : ئەوکەسەی لە پلە و پایەی خوای خۆی بترسێ و نەفسی خۆی لە ئارەزۆبازێ بگێڕێتەوە دواوە ، ئەوکەسە بەهەشت ئەبێ بە ماوا و جێگەی .

جا لەســەر بناغەی پێشۆ پێغەمبــەری ڕەهبەر سەلامی خــوای لێ بێ فەرمۆیەتی بەهەشت دەورەی دراوە بە گەلێ بیروباوەڕ و بە گەلێ کردەوەیوا کە زۆر زەحمەت و پڕ ئێش و ئازارن بۆ ئادەمیــزاد . مەسەلا بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژ لە هەمــۆ شەو و ڕۆژێکا و ، ڕۆژۆی مانگی ڕەمــەزان لە هەمــۆ ساڵێکدا بە گەرما و سەرما و ، ماڵدان بە داماوان بە ناوی زەکاتەوە و سەفەری زیارەتی ماڵی خوا بە ناوی حەجەوە و ، غەزا لە ڕێی خوادا و ، خزمەتکردنی موسوڵمانان بــە هەر جــۆرێ کە ڕەوا بێ و ســۆدی تیا بێ ، ئەمــانە هەمۆ زەحمەت و مەینــەتن و دەوری بەهەشــتیان گرتوە ، تا موســوڵمان بەمانەدا تێنەپەڕێ و هەنگاویان بەسەردا نەنێ ناگا بە بەهەشتی پایەدار و نابێ بە جێگەی ڕەحمەتی خوا . هەروا دۆزەخیش لەناو ئارەزۆی نەفسدایە کە پێچەوانەی ئەو شتانەیە کــە باسمانکردن . ئەگەر ئینســان مەنعی خۆی کرد لەمانــە ئەوە بەهەشتییە وەکــو وتمان و ، ئەگەر خــۆی هاویشتە ناو کۆڕی ئــەم کردارە ناپەسەندانەوە ئەوە لەوێوە ئەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ پەنا بە خودا .

| | |
|---|---|
| هێزی زنجیرەی پشــتی چەمیدەم | بەنــدی هــەناو و بینــایێ دیــدەم |
| ئەوکەســەی بــاخێ پــەروەردە ئەکا | بــە ئــەمینێکی ئەســپەردە ئــەکا |
| دەورەکەی ئــەگرێ بە دڕك و بە دار | شیلان و تۆڕك زریسکی پــڕ خــار |
| یــەکێ بیــەوێ بگــاتە نــاو بــاخ | میوەی لێ بخوا بــە خواستی دەماخ |
| ئــەبێ پــێ بنــێ بــەو دار و خــارا | خــۆ بگــرێ لەبــەر ئێش و ئــازارا |
| کە بۆخواستی خۆی وەها جەسۆر بێ | بەسەر دڵخوازا ئــەبێ مەنصــۆر بێ |

★ ★ ★

بەهەشتیش وایە لەناو ئازارا  وەکو گوڵ لەناو کۆمەڵەی خارا
ئەگەر بتەوێ بگەیتە بەهەشت  ئەبێ خوێنی خۆت برێژیتە دەشت
بە زانستی چاك ، بە کردەوەی پاك  بە حەق‌پەرستی ، بە دڵی ڕۆناك
پێ بنێیی بەسەر خۆپەرستیبیا  نەمێنێ لەناو خانەی پەستیبیا
گیانەڵاو بکەی لەبەر نەخۆشی  دەس نەبەی لەبۆ کاسەی سەرخۆشی
دەس بدەی بەسەر سیخی تەمادا  خۆ بگرێ لەبەر تیغی جەفادا
دەست و دەم و دڵ پاك بکەیتەوە  بەلای تاوانا لا نەکەیتەوە
بەهیوای ئاوی کەوثەری ئەعظەم  دەس‌نوێژ بشۆرێ لە بیری زەمزەم
بەتەمای تاجی بەرزی ڕەئیسی  خۆت بپارێزێ لە داوێن‌پیسی
دڵت هەڵگیرسێ و بسوتێ بە تاو  بۆ جۆش و تاوی دڵی لێ قەوماو
کەسێ بەم‌جۆرە بژێ تا ئەمرێ  لەناو بەهەشتا جێگەی خۆی ئەگرێ
بۆ باخی بەهەشت ئەم تەکلیفانە  وێنەی پەرژین و شوورە و تەیمانە
پەرژینت برێ بێ‌شوبهە و گومان  ئەچیتە باخی ڕازاوە و جوان

★ ★ ★

هەروا دۆزەخیش لە ئارەزوودا  ژارە وا لەناو حەڵوای گەزۆدا
هەواپەرستی و ئارەزووبازێ  ئەنجامی نادا خوای لێ بێ ڕازێ
ئەوەی نان بخوا لەگەڵ ستەمکار  بێ‌شك دەرخواردی ئەدرێ ژاری مار
ئەوەی بە هەوا خۆی بایێ ئەکا  خۆی بە جەفای دەرد سزایێ ئەکا
خوڵاصە خودای زانا و تەوانا  ئەوەی پێ‌خۆشە کە بەندەی زانا
بە معنا و دیمەن بێ بە ئینسان  بێ بە بنکەی پیاوەتی و ئیحسان
خۆی ئازاد بکا لە شەهوەت‌ڕانێ  دەرچێ لە پایەی پەستی حەیوانێ
دڵی بکاتە لانەی بیری پاك  بە یادی خودا و ڕەهبەری ( لولاك )
ئەوسا ئەگاتە بەهەشتی بەرین  شاباشی ئەکرێ هەزار ئافەرین
هەتا ( نامێ ) بێ بە ناوی لەقا  دڵێ ئاو بدرێ بە ئاوی بەقا

## گوڵی بیست‌وهەشتەم ـ گوڵی هاوڕێیی

ئەرزێ گوڵزار بێ خاکی بۆن‌خۆشە
گوڵی سۆسەن بێ یاخود وەنەوشە
هاوڕێ لە هاوڕێ ڕەویە وەرئەگرێ
ئەگەر بێ‌خەوشە یاخود بەخەوشە

خوای گەورە فەرموویەتی :

**یا أیها الذین آمنوا اتقوا الله وكونوا مع الصادقين**

واتە : ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هەیە بە خودا ، خۆتان بپارێزن لە ناڕەزایی خودا و لەگەڵ ئەوانەدا بن کە ڕاستن .

هاوڕێیی و هاودەمی یەکێکە لەو شتە گرنگانە کە ئەبن بەهۆی بەرزی و نزمی پایە و مایە و شانی ئادەمیزاد . ئینسان ئەگەر قیاسی شتی نەبینراو لە شتی بینراو بکا ، لە گەلێ کاتا ئەگا بە ئەنجامی ڕاست و بە گەلێ شت ئاشنا ئەبێ . تەمـاشا ئەکەیـن زەوییەك گولزار بـێ بەهۆی بۆنی ئـەو گولانەوە زەوییەکەیش بۆنی خۆش وەرئەگرێ . هەروا لە شوێنێکدا مردارەوە بۆیەك کەوتبێ هەوای ئەو شوێنە بەلکو زەوییەکەیشی بۆنی پیس و ناخۆش ئەبێ .

خوای تەعالا لەسەر ئەساسی حەقیقەت و واقیعی حاڵ فەرمانی داوە بە موسولمانان کە لەگەڵ ڕاستاندا بژین و توخنی درۆزن و ساختەچی نەکەون . ئەو ئایەتە پیرۆزەی لەسەرەوە نوسیمانەوە داوای ئەوە ئەکا لە ئادەمیزاد کە مامۆستای زانا و هوشیار و دڵ ڕۆناك و دەست و داوێنە پاك و زمان شیرین هەڵبژێرێ و ، لە هەر ئیشێکا کە بە تێـکەڵێ بکرێ ئینسـان هاوڕێی چاك و پاك و چالاك دیاری بکا بۆ خۆی .

ئەوانەی کـە خاوەنی تەصەووف و ڕۆناکی دڵن ئەو ئایەتـەیان کردوە بە ئەساس بۆ یادی مورشیدی خاوەن ڕۆح . ئەڵێن مەبەس لە بون لەگەڵ ڕاستانا تەنیا ئەوە نیە کە ئینسـان بە لەش لەگەڵیانا بێ ، چونکە گەلێ جار ئینسان وا لەگەڵ یەکێکا و بە دڵ لەوکەسە بێزارە . ئـەم جۆرە هاوڕێیەتییە بێسـودە ، بەڵکو مەبەسـت بونـە لـەگەڵیانا بـە ڕۆح ، یەعنی ئینسـان بـە ڕۆح و بـە خۆشەویستی و بە یاد لەگەڵیانا بێ . جا بەهۆی دەوامی ئەم یادەوە ئینسان وای لێ دێ ئەحواڵی ئەو شەخصە لە دڵیا پەیدا ئەبێ . مەشهورە ئەڵێن ڕۆژێکیان لەیلای خۆشەویستی مەجنونی عامیرێ خوێنی باڵی خۆی گرت ، کەچی مەجنون لە جێگای خۆیەوە لە هەمان شوێنا خوێنی باڵی بەر بو .

لە واقیعدا بە بەراورد دەرکەوتوە هەرکەسێ هەمیشە هاوڕێی کەسێك بێ خووڕەوشتی ئەوکەسە ئەگرێ . کورد ئەڵێن : گای ڕەش لەگەڵ گای زەردا بێ ، ڕەنگی ئەو ناگرێ ، بەڵام خوی ئەو ئەگرێ . لەسەر ئەمبناغـە واقیعییەیە حەزرەت سەلامی خودای لێ بێ فەرموێەتی : «المُجاوَرَةُ مؤثِّرَة ، والرَّضاعُ يُغيِّرُ الطِّباعَ» واتە : دراوسێتی و هاودەمی کارئەکاتە سەر ڕەوشت و شیری دایەنیش سروشتی منداڵ ئەگۆڕێ. ڕاستەکـەی نەفسـی ئادەمیـزاد هێزی ڕاکێشان و دەرکردنی تیایە و، لەسەر خواستی خودا وائەبێ ئینسانی بەدخو و بەدبیر ماوەیێ ئەبێ بە هاوڕێی کەسێکی دڵ ڕۆناك و ڕۆح پـاك و بەهـۆی ئەو تێکەڵییەوە ڕەوشتی ئەم کەسە بە باری چاکەدا ئەگـۆڕێ ، وەکو ڕێئـەکەوێ ئینسـانێکی خووڕەوشت باش ماوەیەك ئەبێ بە هاوڕێی کەسێکی بەدڕەوشت و ناپەسەند و ئەوەش ئەبێ بەهۆی ئەوە کە ئەم ئینسانە پاکە ببـێ بە ئینسـانێکی بەدکردار و بەدخو . وەك ڕێئەکەوێ منداڵێکی سـاغ و سەلیم شـیری ژنێکی

نەخۆش ئەخوا و تووشی ئەو نەخۆشییەی ئەو ئەبێ ، یاخود ئەم منالە لە خانەدانێکی پاکە و باوك و دایکی ئینسانی خاوەن سروشت و ڕەوشتی بەرزن ، هەر لەبەرئەوە کە ئەو ژنە حەرامخۆر و بەدخولقە ، منالەکە کە گەورە بوو ئەبێ بە ئینسانێکی بەدکرداری ناپەسەند .

جا لەبەرئەوە کە هاوڕێیی و هاودەمی ئەوەندە بەهێز و کاریگەرە و ئەبێ بەهۆی گۆڕینی خوی ئینسان ، حەزرەت سەلامی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « المَرءُ علی دینِ خلیلِه ، فلینظرْ احدُکُم مَنْ ذا یُخالِلْ » واتە : بنیادەم لەسەر ئایین و کێشی دۆست و برادەری خۆیەتی . کەواتە با هەرکام لە ئێوە باش ورد ببێتەوە بزانێ کێ ئەگرێ بە دۆست بۆ خۆی . هەروەها فەرمویەتی : « المَرءُ مَعَ مَنْ احبَّ » واتە : ئینسان لەگەڵ ئەوکەسەدایە کە خۆشی ئەوێ و ئولفەتی لەگەڵیا هەیە . بەمەعنا مادەم کەسێ مەحەببەتی کەسێکی بێ و بیکا بە هاودەمی خۆی ، ئەوە خووڕەوشتی ئەو وەرئەگرێ . جا هەروەك چۆن لەژیاندا بەیەکەوەن ، لە پاشەڕۆژیشدا هەروا بەیەکەوەن . پوختەی ئەم باسە ئەمەیە کە هاوڕێیەتی و هاودەمی دەوری زۆر گەورەی هەیە لە گۆڕینی ئینسان و لە سود و زیان گەیاندندا . بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ فەرمویەتی : « الجارَ قبلَ الدّارِ والرَّفیقَ قبلَ الطَّریقِ والزّادَ قبلَ الرَّحیلِ » واتە : بەرلەوەی خانوو بگری بزانە دراوسێکانت کێن و ، بەرلەوەی بڕۆی بۆ سەفەر بزانە لەگەڵ کێ ئەڕۆی و ، بەرلەوەی بکەویتە ڕێ بۆ سەفەرەکەت توێشوی بۆ ئامادە بکە . لێرەدا ئەگونجێ مەبەست لە کەوتنەڕێ بۆ سەفەر ، بۆ سەفەری قیامەت بێ یا بۆ سەفەری دنیا .

کەواتە زۆر پێویستە ئینسان هەوڵێکی زۆر بدا بۆ دەستخستنی هاودەمی باش و بەنرخ و تابتوانێ هاوڕێی موناسب و بەقابیلیەت و لێهاتوو و کارامە پەیدا بکا بۆخۆی ، ئەگینا تێکەڵی کەس نەکا وەکو مەشهورە ئەڵێن : « الوحدة خیر من جلیس السوء » واتە : بە تاقی تەنیا ژیان چاکترە لەوە کە ئینسان هاودەمی بنیادەمی نابار و بەدکردار بێ ، چونکە هاودەمی خراپ خوی بنیادەم خراپ ئەکا . ئەگەر خوی ئینسانیش نەگۆڕێ زیانی ئەوەیە کە خەڵکی چاوی لێ ئەکەن بۆ هاوڕێیەتی ئینسانی بەدخو و بەدڕەوشت . بێجگە لەوەیش گومانی خراپ ڕوئەکاتە ئینسان و ، دوری لە شوێنی توهمەت و بەدگومانی بۆ ئینسان پێویستە وەکو حەزرەت سەلامی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « اتقوا مَواضعَ التُهَمِ » واتە : خۆتان بپارێزن لەو شتانە کە ئەبن بەهۆی ئەوە گومانی خراپتان پێ ببرێ . هەروا فەرمویەتی : « مَنْ سَلَكَ مَسالِكَ التُهَمِ اتُّهِمَ » . واتە : کەسێ بە ڕێگەی‌وادا بڕوا گومانی لێوە پێ ببرێ ، گومانی پێ‌ئەبرێ . لە واقیعدا ئینسان کە هاودەمی دز و درۆزن بوو گومانی دزی و درۆزنی پێ ئەبرێ وەك چۆن ئینسان تێکەڵی پیاوی باش ببێ گومانی باشی

پێ ئەبرێ . پێغــەمبەر درودی خــوای لێ بێ بەجــۆرێ عاجزێ دەربــڕیوە لە تێکەڵبون لەگەڵ ئینسانی بەدخۆ کەپێویست بێ بۆئینسـان، خۆیشی و فامیلیشی بپارێزێ وەکو فەرموێەتی : « ایـّاکُمْ وخَضْراءَ الدِّمَـنِ المَـرأة الحَسْنـاءُ فِي مَنْبَتِ السُّوءِ » . واتە : ئەی موسولمانینە خۆتان بپارێزن لە گیای سەوزی سەر سەلوێنك کە بریتییە لە ژنی جوان کە لە بنەماڵەیەکی ناپیاو و نامەرد بــێ چونکە لەوانەیە بەهۆی خۆی خراپی ئەو ژنەوە خۆی مێردەکەیشی خراپ ببێ و بەلکو ئەو منداڵانەیش کە لێی‌ئەبن بەهۆی بەدخۆیی دایکیان و ماڵی خاڵوانیانەوە خۆیان خراپ ببێ .

جا پێویستە هەرچەند لە ئیمکاندا بێ ئینسـان تێبکۆشێ بۆ پەیـداکردنی ڕەفیقی باش بۆ تەمــێ کردن و پەروەردەکردنی منـاڵ و بــۆ ئامۆژگـارێ‌کردن بەتایبەتی بۆ پەروەردەکردنـی مەعنــەوێ ، یـا بۆ هـاتوچۆ و ڕابـواردن و بۆ دراوسێیەتی و هاوماڵی و ، بۆ مامەڵە و کاسبی لەگەڵ کردن و ، بۆ عەهـد و پەیمان لەگەڵ بەستن و ، بۆ ژن لێ‌خواستن و لێ‌مـارەبڕین وەکـو پێغەمبــەر درودی لێ بێ فەرموێەتی : « الدُّنْیا مَتاعٌ و خَیْرُ مَتاعِها المراة الصّالِحَةُ » واتە : ژیانی جیهان لەذەت وەرگرتنە و چاترین شتێ کە لەذەتی دینێ و دنیایی لێ وەربگیرێ و خانەدانی لەسەر دامەزرێنرێ ژنی باشە .

**ڕۆڵەم بۆ تۆمە ، بگــەی بــە پایــە　　عومری عــەزیزت نــەڕوا بــە زایــە**

**هــەر منداڵ نابن لەســەر چەرپایە　　خەوتــان لێ‌کــەوێ بــە لایــە لایــە**

**ئــەو لایــەلایەش بــۆ ئێــوە ئەکرێ　　بەو هیوا ئــەکرێ جێگــەیێ بگــرێ**

**ئەو شیر و شەکرەی ئەدرێ بە ئێــوە　　ئەو حەلوای گەزۆو ئەو شەکرە سێوە**

**هەمــوی هیــوایە و ئومێــدەوارێ　　ڕۆڵــە پــێ بــگا بــۆ بەختیــارێ**

★ ★ ★

**چین چــین دێنــەدەر گوڵاڵانی کێــو　　چینێ لە بەرزێ و چینێ لــە نشێو**

**کامەیان جــوان بێ لەبــەر چــاوانا　　ئــەکرێ بــە ســنگی گــەلی لاوانــا**

**هەر بەهار نابێ جیهــان بــۆ ئێــوە　　هاوین سەبۆن دێ تۆزیشــی پێــوە**

**هەر هاوین نابێ کــاتی خەرمــانان　　پــایز لــە پێشــە بــۆ گــەلاڕێزان**

**هــەر پایز نــابێ میــوە لــە داران　　زستان لە پێشە و دەمەی کۆساران**

★ ★ ★

**منداڵ هــەڵنەچێ وێنــەی سپێ‌دار　　ئەبێ بــە لاوی بــەرزی هــەرزەکار**

**ئەمجا ژن دێنێ و ئەساس دائــەنێ　　گەرای گەلێکی حەق‌نــاس دائــەنێ**

**هەرگیز قابیلــە ئــەوەند نەفــام بێ　　دوارۆژی ئــەوەی لا بێ‌ئــەنجام بێ**

**حەولی وانەدا کــە منداڵ دەرکــەوت　　ڕێگەیێ بگرێ هۆ بێ بــۆ سەرکەوت**

هۆی ئەم سەرکەوتە ئەوەیە کە خۆی     بینا و زانا بێ تا ڕێکەوێ بۆی
تۆوێ زانایی دایکا لە زەوێ     چ لە مادیات چ لە مەعنەوێ
منداڵ لەوکاتا چاو ئەکاتەوە     بە ڕەویەی بابی خێر ئەداتەوە
بابی تاجر بێ ئەڕوا بۆ دوکان     ئەگەر جانباز بێ ئەڕوا بۆ مەیدان
خۆ ئەگەر سوارەی جەنگ و نەبەردە     ئەمیش وەکو ئەو دڕندەی هەردە
مەخلەس هەر گەلێ جادە ئەکێشێ     منالی بێ ڕێ دەماخی دێشێ

★ ★ ★

جا ئەتانەوێ خۆتان پێبگەن     نەتەوەی خۆشتان لە ڕێ لانەدەن
تەوانا و زانا و بە هۆش و دڵ بن     لەگەڵ هوشیاران هاوەڵ مەنزڵ بن
ژیان بینایە هاودەم ئەساسە     ئەساس کە ڕاس بێ بیناکەی ڕاسە
هاودەمێ بگرن سەرچاوەی ئاو بێ     دڵپاك و زانا و بەنرخ و ناو بێ
چ بۆ دانشگا و چ بۆ هاتوچۆ     چ بۆ هاوماڵێ و چ بۆ ژن و شۆ
زینهار خۆ لادەن لە هاوڕێی بەدخۆ     لە بێدەماخی بەدپێستی بەدڕۆ
ڕەوشتی ئینسان وێنەی ئەخۆشێ     دڵ بە دڵ ئەڕوا خۆش و ناخۆشی
گای سپی لای ڕەش ڕەنگی ڕەش نابێ     بەلام لە خۆی ئەو قەت بێبەش نابێ
هاوڕێی ستەمکار با ستەم نەکا     هەر بە بلێسەی نەنگی ئەو ئەگا
بە تەنیا بڕۆی بە خارستانا     نەك لەگەڵ نابار بە گولستانا
نەك هەر تەنیایێ ، بشچیتە ئەلحەد     چاترە لە صوحبەت لەگەڵ یاری بەد
ئینسان لە گۆڕا ئەحەسێتەوە     شوومێ یاری بەد نابڕێتەوە
ئەوەی یاری بەد کردی بە یاران     کەوەمار ئەیکرد لەسەر کۆساران
بە بیری چەپەڵ ، بە کردەوەی شەڕ     بە گومانی بەد بەئاشوب و گەڕ
هەمۆی لە شوومێ هاوڕێی بەدکارە     هەمۆی بەبۆنەی خۆی نابەکارە
یەعنێ ئەم تۆڵە تۆڵەی صوحبەتە     هاوڕێ بۆ هاوڕێ بە مەحەبەتە
چەند مەردی بەرزی بەهاناو هیممەت     بە هاودەمێ بەد کەوتنە بەر تۆهمەت
چەند دڵی پاکی مینا لەطافەت     پیس بۆ بە هاوڕێی خاوەن کەثافەت

★ ★ ★

بەدخۆیەکتان دێ ، گوێبگرن لە من     هەڵێن لە دەستی هەروەك لە دوژمن
نانی بەدخووان نەخۆشی دێنی     شانی بەدخووان شانت دێشێنی
بێ دەرمان بمرە بە بێ یەك و دۆ     وەرمەگرە دەوای دوکتۆری بەدخۆ
پادشا بەدخۆ بێ حاشا لە چارەی     باخی میوە بێ حاشا لە بەرەی
دوژمنی خۆشخۆ بۆت ئەبێ بە یار     برای بەد سروشت لێت ئەبێ بە مار
دوژمنی بەدخۆ بە باوەڕی من     خۆی بۆ قەتلی خۆی بوە بە ضامن
ئیمڕۆ یا سبەی خۆی خۆی ئەکوژێ     پێی ناوێ دوژمن خوێنی بڕێژێ

★ ★ ★

لەناو مەردانا زۆ نەبێ بە مەرد — لەلای نامەردان بە دڕندەی هەرد
لە ڕیزی بەرزا خۆت بەڕێز ئەکەی — خۆت بەخاوەنی کورسێ و مێز ئەکەی
هەرچێ کەرامەت بۆ هەرکەسێ بۆ — هەر بە هاودەمێ خۆش نەفەسێ بۆ
حەزرەت بە یارێ فریشتەی مەعبۆد — بۆ بە خاوەنی مەقامی مەحمۆد
بە یومنی یارێ حەزرەتی ڕەهبەر — یاران گەیشتن بە ڕەضای داوەر
تابیعین لەبەر هاودەمێ یاران — بارانی ڕەضا بارێ لەسەریان
چەند دڵ بە فەیضی یارانی ( نامێ ) — بۆن بە هاوڕێزی مەولانای جامێ
گڵ بە بۆنی گوڵ موعەططەر ئەبێ — دڵ بە فەیضی دڵ مونەووەر ئەبێ
( حجر الاسود ) لە کەعبەی نازدار — بۆ بە جێ بۆسەی لێوانی ئاودار
چەند مۆرۆی شۆشەی بێ‌نرخی بازاڕ — فرۆشران لەناو ڕشتەی جەوهەربار



بەدخۆ بە شێوە بەرەوشێتەوە — خێر لە پەنایا ناوەشێتەوە
خۆ بپارێزن لە یاری خۆش‌ڕۆ — هەڵکەوتوی هۆزی بەدئەخلاق و خۆ
گوڵی سەلوێنك زۆر زۆ ئەفەوتێ — بە بۆقی پەین ڕیشەی ئەسوتێ
ژن هەڵبژێرن بۆ ماڵی خۆتان — پێوەندی خێرە بۆ حاڵی خۆتان
ژن‌هێنان وێنەی پێوەندی دارە — هۆشیار چاوەڕێی نەی‌شەکەر بارە
هاتوچۆی منال لای خاڵی بەدحاڵ — خاڵی ڕەش ئەدا لە چارەی منداڵ
دڵبەندی مەردە ئینسانی هوشیار — ئازار و دەردە پەیوەندی نابار
پەیوەندی ( نامێ ) لە شەکرە سێوە — مەردێ بە دڵە و بە فیکر و لێوە

## گوڵی بیست‌و نۆهەم ـ گوڵی گونجان و سازان

ئینسان گەدا بێ یا وێنەی دارا
ناژێ بێ گونجان ، بە بێ مودارا

زەمانە سازێ پێویستە بۆ پیاو
ئەگەر نەیەوێ بێ شوێن بێ و بێ ناو

پێغەمبەری نازدار ، درۆدی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی :

**بُعِثتُ بِمُدَارَاةِ النَّاسِ**

واتە : ڕەوانە کراوم بۆ بەجێ‌هێنانی شێوەی سازش لەگەڵ خەڵکدا .

مودارا و زەمانەسازێ و گونجان لەگەڵ خەڵك قازانجێکی زۆری هەیە لە ژیانی ئینساندا و هیچ‌کەسێ ، بەتایبەتێ ئەوانەی کە کاری گرنگ و بەبایەخیان بەدەستە ، ناتوانن بێ ئەم ڕەوشتە بەئاسایش ڕابوێرن و نەسوديان بێ ئەم

ڕەوشتە لە خەڵك بێ وەرئەگیرێ و نە سـوودیان پێ ئەگەیـەنرێ بە خەڵـك . ئەمخووە هەرچەند لە سروشتی ئادەمیزاددا هەیە ، بەڵام بۆ گوشادکردنەوە و ڕاگەیاندنی بە ئەفرادی کۆمەڵ توانا و قابیلەتێکی زۆر پێویستە . بەجێهێنانـی پێویستییەکانی ئەم خووە گەلێ ئوسوڵی هەیە کە لە هونەری حیکمەتی عەمەلیدا لەژێر عینوانی (سیاسة المدن)دا بەدرێژی باسی لێ کراوە .

ـــ گرنگترینی پێویستییەکانی ئەم ڕەوشتە بریتییە لە سێ ڕەوشت . یەکەم: ڕاگرتنی پایە و شانی هەرکەسێ ئەوەندەی خۆی . دووەم : قسەکردن لەگەڵیان بە وتاری موناسب بەپێی پایەی عەقڵ و تێگەیشتنیان . سێهەم : بەخشـش و ماڵ سەرف‌کردن لەکاتی پێویستدا .

بەشی یەکەم ، ڕاگرتنی پایە و شان . پێغەمبەری نازدار سەلامی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « اُمِرْنا انْ نُنَزِّلَ النّـاسَ مَنازِلَهُمْ » . واتـە : لەلاینی خواوە فەرمانمان پێدراوە کەوا هەرکەسێ لە شوێنی خۆیا دابنێین . لە واقیعدا ئەم ئادەمیزادە هەرچەنـد یەك جۆرە ، بـەڵام ئەصنـافی زۆرە و ڕەگ ڕەگ و کان‌کانە وەکو کانی ئاڵتون و زیو و مس و ئاسن و غەیری ئەمانە . لەمصینفانەدا بێ‌نرخ و بەنرخ و دڵپاك و دڵپیس و مەشرەب‌بوڵەند و مەشرەب نەوێ هەیـە . هەریەکێ لەم بەشانە بەش بەحاڵی خۆی پایەیەکی بۆ بڕیار دراوە ، کە ئەو پایەیە ڕانەگیرا حاڵی ناڕەحەت ئەبێ . جا ئەگەر دەسـتی هـەبێ شـۆڕش و غەوغـا ئەنێتەوە . ئەگەر دەستیشی نەبێ ئەڕوا لەپەناوە دەست‌ئەکا بە شات و شوت و هات و هاوار و پڕوپاگـاندە و بوختـان‌کردن و عەیب و عـار بڵاو کردنـەوە و نرخ‌شکاندنی ئەوکەسەی پایەی ئـەوی ڕانەگرتوە و لەپێش چـاوی خـەڵکدا سوکی ئەکا ، بەڵکو خەڵکیشی لێ ئەوروژێنێ و ئەیانکا بە دوژمن و نـاحەزی و ئەوەندەی دەستی بڕوا مەیدانی ئەوە نادا کە هیچ مەرام و مەبەستێکی جێبەجێ ببێ . کەچی ئەگەر شانی ڕابگرێ ، لەپێش چاویا خۆشەویست ئەبێ و هیوای ئەوە پەیدا ئەکا کە سوودی لێ وەربگرێ و ئەبێ بە یارمـەتی‌دەری . خـۆ ئەگەر یارمەتییشی نەدا هیچ نەبێ زیانی پێ ناگەیەنێ و ئەمەیش سوودێکی کەم نیە وەك مەشهورە ئەڵێن : هەزار دۆستت ببێ کەمە ، بەڵام تاقە دوژمنێکت ببێ زۆرە . بۆ ڕاگرتنی پایە و شان وتاری جوان و ڕووی خۆش و حیلم و حەوسەڵە لەکاتی ڕق‌هەستانا پێویستە . حیلم لەمکاتەدا زۆر پێویستە . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : «ما جُمِعَ شَیءٌ الی شَیءٍ احْسَنَ مِنْ حِلْمٍ الی عِلْمٍ» . واتە : قەت شتێ نەخراوەتە پاڵ شتێ جوانتر بێ لە حیلم و حەوسەڵە لەپـاڵ زانست و زانیاریدا .

بەشی دووەم ، قسەکردن لـەگەڵ خـەڵك لـەگەڵ سـەرنجدانی پایەی بیروباوەڕ و تێگەیشتنیاندا . ئەم بەشە ماوەیەکی گوشادی هەیـە و پێویسـتی بەوە هەیە کە ئینسـان سروشت و خو و بیروباوەڕ و ئوسوڵی ئەو خەڵکە بزانێ .

گەلێ کەس بەوە ڕام ئەکرێن کە تەعریفی باوك و باپیر و نەژاد یا مامۆستا و مورشیدیان یا تەعریفی سروشت و خۆی خۆیان بکەی یا لە بابەتێکی‌واوە قسەیان لەگەڵدا بکەی کە ئەوانیش‌شتێکی لێ بزانن . پێویستە ئینسان خۆی دووربگرێ لە هەرا و دەمەقاڵە و چەقەچەق لەگەڵ خەڵك، بەتایبەتێ پێویستە خۆ دوورگرتن لە زەم‌کردنی بیروباوەڕ و کێش و ئایینی خەڵك چونکە خۆشەویستێ ئەم شتانە وەکو خوێن چوە بە دەمارەکانی لەشیاندا و هەتا ئەوانە گیان لە لەشیاندا مابێ ئەو بیروباوەڕانەیان لە دڵ دەرناچێ .

ئەگێڕنەوە کاتێ ئەسکەندەر کوردستان و ئێرانی گرت ، لە بیروباوەڕی خەڵکەکە زۆر زویر بو . ئەیویست هەرکەسێك و هەر تیرەیەك کە ببن بەهۆی بڵاوبونەوەی ئەو بیروباوەڕانە بەتێکڕایێ بیانکوژێ . لەم‌بارەیەوە ڕاوێژی لەگەڵ وەزیرەکانی کرد . یەکێکی زانایان تیابو ، وتی : بیری کوشتن و دوورخستنەوە سودی نیە . چاکتر ئەوەیە خوێندنگای زۆر دروست‌بکەی بۆ منداڵەکانیان هەتا بخوێنن و تەمێ وەربگرن بەجۆرێ کە ئەو بیرو باوەڕەیان کز ببێ . لە لایەکی‌کەشەوە وڵاتەکەیان پارچە پارچە بکە و هەر پارچەیەکیان فەرمانداریکی لە خۆیان لەسەر دانێ و فەرمانیان بدەرێ کە هەرکامیان سنوری وڵاتەکەی خۆی بپارێزێ . ئەمە ئەبێ بەهۆی هەرا و ئاشوب لەناویانا و ئەدەن لە یەك و وەزعی ئێمە فەرامۆش ئەکەن و بیروباوەڕیشیان لە بیر ئەچێتەوە . لەم‌لایشەوە بەهۆی پارچە پارچەییەوە هەمو بێ‌هێز و لاواز و بێ‌کارە ئەبن و بەتایبەتێ مادەم ببن بە دوژمنی یەکتر سەری کەسیان ناپەرژێ . هەر لەسەر بناغەی دەست‌نەبردن بۆ کێش و ئایینی خەڵکە ئەمە کە ئایینی ئیسلام بڕیاری داوە کەوا موسوڵمانان حەقیان بەسەر ئایینی جولەکە و گاورەوە نەبێ و کەس زیانیان پێ نەگەیەنێ مادەم ئەوان بە ئارامێ و بێ‌خەیانەت لە وڵاتی ئیسلامدا دابنیشن و خەرج‌وباجی دەوڵەتێ تەسلیمی خەزینەی دەوڵەتی ئیسلام بکەن .

هەروا پێویستە هەر قسەیێ لەگەڵ ئەو خەڵکەدا ئەکرێ لەپایەی تێگەیشتنی ئەواندا بێ . ئەگینا لەجیاتێ سود زیان لەو قسانە پەیدا ئەبێ . بۆیە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ فەرمویەتی : «اُمِرنا انْ نکلّمَ النّاسَ علی قَدَرِ عقولِهم». واتە : فەرمانمان پێ‌دراوە قسە لەگەڵ خەڵکدا بە ئەندازەی عەقڵ و تێگەیشتنیان بکەین .

بەشی سێهەم ، ماڵ خەرج‌کردن . ماڵ خەرج‌کردن یەکەم پلەیە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاسایش . گەلێ ئیش هەیە بە صەرف‌کردنی ماڵ پێك‌دێ . ئەوەندە هەیە ماڵ صەرف‌کردن پیاوی ژیری ئەوێ بۆئەوە کە ئەندازە ڕابگرێ و لە شوێنی موناسب و ڕێك‌وپێکدا صەرفی بکا . ماڵ خەرج‌کردن هەرچەند بەدیمەن زیانە لە بنیادەم ئەکەوێ ، بەڵام قازانجی گەلێ زۆرە ، چونکە گیروگرفت

ئەگەر بەهۆی صەرف‌کردنی ماڵەوە چارنەکرێ ، بە هەر ڕێگایەکی‌ترا چاربکرێ زیانی گەلێ لە صەرفی ماڵەکە زۆرتر ئەبێ . بێجگە لەوەیش کە زیانی ماڵێ ئەبژێررێتەوە ، بەڵام زیانی گیانێ چ لە تاقەکەس بکەوێ و چ لە میللەتێك بکەوێ بژاردنەوەی نیە .

شێخی سەعدێ خوای لێ ڕازێ بێ کە زۆر تەعریفی ئەتابوکەکانی شیرازی کردوە ، لەبەرئەوە تەعریفی کردوێن کەوا بە صەرفی ماڵ و بە مودارا و گونجان و سازان لەگەڵ مەغوڵەکاندا ڕێك‌کەوتوون و خوێن و حورمەتی میللەتەکەیان و وڵاتی شیرازیان لە وێران بوون پاراستوە . مودارا ئەگەر ئینسانی بچوك بیکا پایەی بەرز ئەبێ . ئەگەر خاوەن پایەش بیکا پایەکەی بەردەوام ئەبێ . مودارا بۆ پیاوی خاوەن‌پایە و شان گەلێ پێویستە . تا کار بە مودارا مەیسەر بێ ، بەکارهێنانی توندێ و تیژێ هیچ سوودێکی نیە بەڵکو زیانیشی لێ ئەوەشێتەوە ، مەگەر بەرابەر بەوکەسانە کە زۆر بێ‌دەماخ و بێ‌عەقڵ و هۆشن و هیچ شتێ کاریان لێ ناکا . لەم‌کاتەدا پێویستە پیاوی گەورە ئەوەندەی پێویست توندێ و تیژێ بەکاربێنێ بەمەرجێ ئەو مەبەستە کە ئەو گەورەیە لەسەری ئەڕوا مەبەستێکی شەرعێ بێ و ڕەواجدانی پێویست بێ وەکو سیاسەت لە سەردەمی خەلیفەکانی پێغەمبەردا درودی خوای لێ بێ . مەبەست لەوەیە کەوا مودارا لای هوشیاران بریتییە لە ڕاگرتنی ڕشتەی کۆمەڵایەتێ و پاراستنی نان و شان و کەرامەت لەگەڵ پاراستنی یاسای کێش و ئایینــدا . مودارا بەم مەعنایە کارێکی بەرز و پڕ مەینەتە و پیاوی بەتوانای خاوەن ئیستیقامەت و کێشمانی ئەوێ و بە هەمۆکەس ناکرێت . خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەو مەرجانە نەبێ کە باسمان‌کردن ، ئەوە ناچارێ و چارەسەریە و مودارا نیە .

**ڕۆڵە ! جێی هیوای ڕۆژ و شەوانم !**
**مایەی ڕەحەتی ڕۆحی ڕەوانم !**
**کەس لەم جیهانا بە بێ مودارا**
**بە خۆشی نـاژێ گەدا یا دارا**
**مودارا بەردی بناغەی مەردە**
**مایەی ڕزگاری ڕۆژی نەبەردە**
**بچوك و گەورە و بەرزی بەتەمکین**
**بە دڵ‌ڕاگرتن لەم چەرخا ئەژین**
**بۆ دڵ‌ڕاگرتن پێت بڵێم دەستور**
**بەجێ‌بهێنی ئەژیت بە سرور**



**لەگەڵ گەورەدا بە شەرم و شکۆ**
**گوێ بگرە کاتێ قسەی کرد بۆ تۆ**
**دورکەوەرەوە لە غەوغا و جەدەل**
**لە دەمەدەم و لە شەڕە مەتەڵ**
**لەناو قسەیا تێ‌هەڵکێش مەکە**
**بە بێ ئوسوڵێ دڵی ڕێش مەکە**
**ئیشێکی پیادای بەگوێرەی ئیمکان**
**بە ساغێ بیکە بە شادێ و تەکان**
**کاتێ زویر بۆ لێت تۆ هەر بە نەرمێ**
**ساردی کەرەوە دەروونی گەرمی**

خزمەتی بکە زۆر بە سەرخۆشی — کاتی زەعیفی و ماتی و نەخۆشی
ئامۆشۆی بکە بە وەخت و وادە — لە حەد لامەدە وەك پیاوی سادە



قیمەت و نرخی هاوشان ڕاگرە — باری مەینەتی لە شان داگرە
لەسەر برایی پەیمانت ساغ بێ — ڕۆت بەرەو ڕۆیان وەکو گوڵباغ بێ
ئەگەر بە هەڵکەوت دڵی ئێشانی — چاوپۆشی لێ بکە هەتا ئەتوانی
لەگەڵ بچوکا بە میهرەبانی — هەستە و دانیشە ئەی برای گیانی
تەمی و تەربییەی دادە بەئەخلاق — تێیبگەیەنە لە یاسای ئافاق
ئەگەر چاکەی کرد مەشهوری بکە — بە ئافەرینی مەسرووری بکە
کە خراپەی کرد بە شێوەی نەرمی — لای‌بدە لە شەڕ نەك بە دڵگەرمی
بە ڕۆ شکاندن ڕۆسەختی مەکە — بێ شەرم و شکۆ و بەدبەختی مەکە
بۆ دڵ ڕاگرتن ئەمەیە میزان — بۆ گەورەو بچوك بۆشەخسی هاوشان
من ئەمەم‌زانی بەیانم کرد بۆت — تۆش هەوڵی‌بدە لەسەرچەرخی خۆت
چەند باسی هەیە لەسەر بەراورد — بۆم دەرکەوتوون لەسەر فکری ورد
هەمو بەیاسای مودارای ڕاسان — ئەبن بە مایەی ڕزگاری ئینسان
یەکەمین تەرکی جەدەل و غەوغا — بەتایبەت لەگەڵ تاقمی ئاغا
یەعنی حوکمدار فەرمانڕەوای کات — کاربەدەستانی میللەت و وڵات
ئەوکەسە قسەی دەستوری عامە — جەدەل لەگەڵیا کاری نەفامە
چی بەدەمیا هات ئەیڵێت و ئەڕوا — نە ترسی خەڵکە و نە ترسی خوا
دۆهەم ئینسانی نەزانی نەفام — قسە لەگەڵیا ئەڕوا بێ‌ئەنجام
ئەو کە تێناگا لە کەلامی تۆ — چۆن ملکەچ ئەبێ بۆ مەرامی تۆ
گەر بە هەڵکەوتیش کەوتە بەدگۆیی — تۆ خۆت لادە لێی گەر ئەو ئەڕۆیی
( قالوا سلاماً ) حەرفی قورئانە — وەڵامی واتەی پیاوی نەزانە
نەرمی بۆ نەفام بێ‌شوبهە و گومان — چاترە لە شیر لە تیر و کەوان



سێهەم ئەوکەسەی کە ئیشت پێ بێ — کەم بێ یا زۆر بێ یا لە هەرکوێ بێ
چوارەم پەروەردەی خانەوادەکەت — بەلای بێ‌باری وەخت و وادەکەت
مودارا نەکەی ئەبێ هەر ساتێ — ببیە سینەما لەبۆ وڵاتێ
بەتایبەت لەبۆ ئینسانی بێ‌لان — زەمانە سازی فەرزە بێ‌گومان
میوان شەڕ بکا لەگەڵ خانەخوێ — پاشان ناتوانێ لەو ماڵا بنوێ
ئەو ئینسانانەی چاودێری گەلن — خاوەن مودارا و بێ پەلەپەلن
چەندکەس وا لەژێر ئیدارەی ئەوان — ئەوەند مودارا مەطلوبە لەوان

به دۆ دەقیقـە صەبـر و مـــودارا    خـۆ ئەپـــارێزن لـــە ڕۆژگـــارا
ئەنـا لافـــاوێ ڕایـــان ئەمـــاڵێ    خۆ و تەخت و بەختیان ئەخاتە چاڵێ

★ ★ ★

بەڵێ ئـادەمێ ئەبـێ سەنگـین بـێ    کار و کردەوەی زێبـا و ڕەنگـین بێ
بەتایبەت لەگەڵ ناکەس و نەفـــام    ئەگەر ئـارام بێ نـامێنێ نیظـــام
شـــەقێ نەترسـێ لـە فەرمانداران    ئەبـێ بە دزك بـۆ پێـی هـەژاران
مەبەستمـــان وایـە هەتـا بۆیبکرێ    هـەر بە مـودارا عالـەم دابگـرێ
کە مەیدان نەما بۆ ئەخلاق و فـام    حوکم بۆ شـیرە و بۆ یاسا و نیظـام
ئەگینـا ئـاگر بەرئـەبێ لـە عـام    تەڕ و وشك هەمۆ ئەسـوتێ تەمـام
( اتـــا ﷲ ) لەمکاتـــا ویـــردە    چونکە عـالەم گشت گیرۆدەی دەردە

★ ★ ★

سـێ چـارە هەیە ئەگـەر ڕێکەوتێ    ئەبێ بە مایەی بەرزێ و سـەرکەوتێ
یەکەم ئەوەیـە بەگوێـرەی پـــایە    پـایەی هیچکەسـێ نەدەی بە زایـە
هەرکەسێ پایەی خەڵکێ ڕابگـرێ    مەملەکـەتی دڵ گشـتی دائەگـرێ
خۆی ئەسازێنـێ بـە وێنەی بـرا    لە دڵـی خەڵکـا ئەبـێ بـە چـرا

★ ★ ★

دۆهەمین بەخشـش بەڵام بە جێگـە    نەوەك مەسرەفی بـێ جێگـە و ڕێگە
هـەر خـــانەدانە پـایەی بڵنـدە    عالەم بۆ ئەوان بەسـتەی کەمەنـدە
ڕێ و شوێنی دینە ئیطعـامی طەعام    بەڵام بە بێفەرق لەگەڵ خـاص و عام
هەرکەس بە نانی نەفسـێ بکوژێ    لە ئاوی ( کەوثەر ) شەربەت ئەمـژێ
نانی خاوەن نان بۆی ئەبێ بە شـان    چ لەلای خودا یـا خەڵقی جیهـان

★ ★ ★

سێهەمین وتـــار ، وتـاری ئـارام    ئەبـێ بـە مەڵهـەم بۆ ئـارامێ زام
ئەو پێغەمبەرەی گەورە و نـازار بـو    بۆ هەمۆ عالەم شـاه و سەردار بو
بەگوێرەی لەهجەی زمـانی عەرەب    ئەماتە وتـار بە شـەرم و ئـەدەب
قورئـانی پـیرۆز ( مُعجِز الکَـلام )    خوا بە حەوت لەهجە ناردی بۆ ئەنام
لەهجەی حەوتتیرەی عەرەبی حیجاز    هەرکام لەویتر سەربەخۆ و جیاواز

★ ★ ★

وائەڵێ ( حافظ ) شـــاعیری شـیراز    مامۆستای مەعنا و زانای نوکتەساز
ڕزگـاریێ حەصرە لـەم دۆ وتـــارا    بۆ دۆست پیاوەتێ و دوژمن مودارا

جـا منیش ئەڵێم بـۆ شەرحی ئەمە تەفسیرێکی وا بـاش موسـەللەمە
مـایەی پیـاوەتی و پـایەی مودارا حەصرە لە صەبـر و خەرج و وتـارا
بە دەهەندەیی و بە گوفتاری خـۆش خۆت دوور ڕابگرە لە دەردی نـاخۆش
جا ئەگەر مەردی و شاگردی (نامی) دەرزم وەربگرە بۆ خۆش ئەنجـامی

## گوڵی سیهەمین ـ گوڵی چاری ڕق و قین

ئەوکەسـەی دەرچی لـە کورەی غـەزەب
ئەگاتـە ئـەوجی ئەفـلاکی ئـەدەب
غەضـەب کەمـەندی شـومی شـەیتانە
ئەیخـاتە مـلی پیـاوی بێئـەدەب

خوای گەورە لە قورئانا فەرمویەتی :

**والكاظِمينَ الغَيْظَ والعافينَ عَنِ النّـاسِ ..**

واتە : ئەوکەسـانەی ڕقی خۆیـان ئەخۆنەوە و چاوپۆشی ئەکـەن لە ئادەمیزاد ، لای خودا خاوەن پایەن .

هەروەها فەرمویەتی :

**وَاِذا ما غَضِبوا هُمْ يَغْفِرونَ**

واتە : ئەوکەسـانەی لەکاتێـکا ڕقیـان هەسـتی عەفـو و چـاوپۆشی بەکارئەهێنن و سەرفی نەظەر ئەکەن .

ئەشگێڕنەوە شەخصێ هات بۆ خزمەتی ڕەهبەری نازدار سەلامی خودای لێ بێ عەرضی‌کرد : ئامۆژگارییەکم بکە ، ئەویش فەرموی : لا تَغْضَبْ . واتە : ڕق مەگرە . شەخسـەکە تا سێ جار داوای ئامۆژگاریی کردەوە لە پێغەمبەر ، ئەویش لـە وەڵامـدا هەروەکو یەکەم‌جـار هـەر فەرمـوی : لا تَغْضَبْ . وادەرئەکەوێ پێغەمبەر درودی خـوای لێ بێ ئاگادار بوە لەوە کە ئەو کابرایە گیرۆدەی ئەو سیفەتە نابارەیە ، بۆیە هەر بەوجۆرە وەڵامی داوەتەوە ، بەڵکو کابرا چاری خۆی بکا .

ڕقهەستان و عەسەبی‌بون خویەکی نابار و ناڕەوایە و دوژمنی پایە و مایەی ئینسانە . کەسێ گیرۆدەی ئەم دەردە بێ لە ژیانی خۆیدا ئاسایش نابینێ و خانەوادە و مناڵ و خزم و هۆزیشی لێی وەڕز ئەبـن . لە سەردەمی منداڵیدا ناتوانێ سـود لە مامۆسـتای خوێندن و پـەروەردەکردن و وەسـتای پیشە

فێر کردن وەربگرێ و لەو بەهرانە نائومێد ئەبێ . لە گەورەیشدا ئەگەر ئیشێکی پێ سپێررا چ ژێردەستەکانی و چ ئەو کەسانەی ئیشیان ئەکەوێتە لای لێی وەڕز ئەبن و حەز لە چارەی ناکەن . تەنانەت ئەگەر عیلم و زانست و پایەی بەرزیشی هەبێ کەم‌کەس سوودی لێ دەست‌ئەکەوێ . بەکورتی ئەگەر بچوك بێ گەورە لێی زویر ئەبێ و ئەگەر گەورە بێ بچوك لێی دڵگیر ئەبێ .

بێجگە لەمانە خۆی ڕق‌هەستان و تووڕەیی ئەبێ بەهۆی گەلێ هەرا و ئاشوب و فیتنە لە دنیادا و ئەو شوێنەی ئەم جۆرە بنیادەمانەی تیابێ بەزۆری پڕە لە ئازار و دەردەدڵ و هەرا . بۆیە ڕەهبەرانی ڕۆحی و زانایاران شاگرد و قوتابی و بەردەستانی خۆیانیان ڕاسپاردوە کە خۆیان لەم دەردە ڕزگار بکەن و بە هەرجۆرێك بێ دەرمانێکی بۆ بدۆزنەوە و چارێکی ئەم نەخۆشییە بکەن لەخۆیانا . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ ، اِنَّما الشَّدِيدُ الَّذي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ » . واتە : ئادەمیزادی توانا و بەهێــز ئەوکەسە نیە خەڵــك زۆر بکوتێ بەزەویدا و لــە زۆران‌گرتندا بیان‌بەزێنێ . توانا و بەهێز ئەوکەسەیە دەستی بەسەر نەفسی خۆیدا بشکێ و مەنعی خۆی بکا لەکاتی ڕق‌هەستانا ، بەوچەشنە کە نەهێڵێ نیشانەی ڕقەکەی لە شێوەی قسەی ناشیرین و کرداری ناپەسەندیدا دیاری بدا .

هەندێ لە زانایــان وتویانە هەر شەڕێ توشی ئینســـان ببێ ، یا بەهۆی شوێن‌کەوتنی ئارەزوی نەفسەوەیە یاخود لەئەنجامی هێرشی ڕق و کینەوەیە . مەسەلا کوشتن و بریندارکردن و جنێودان و ناشوکری‌کردن و سوێند و تەڵاق خواردن و ئــازارردانی دڵی خەڵك و عاجز کردنی دۆست و برا و وێنــەی ئەم شتانە هەمو لە ڕق هەستانەوە دێن . گەلێ‌کــەس بون لەبەر هێرش هێنانی ڕق‌هەستان دڵیان‌وەستاوە و مردون یا شێت بون . ( بناءً عليه ) زۆر پێویستە ئینسان هەمیشە ئاگای لەخۆی بێ چونکە ئەم صیفەتانە هەرچەند لە سروشتی ئینساندا هەبن ، بەڵام بەگوێرەی توانا و بەپێی ڕێکەوت چاریان ئەکرێ و ئەگەر هەر بن‌بڕ نەکران ئەتوانرێ سوك بکرێن . مەسەلا ئەوکەسەی گیرۆدەی دەردی تووڕەیی بێ پێویستە بــیر لەوە بکاتەوە کە تووڕەیی ئەبێ بەهۆی ماڵ‌وێــرانی و پەرێشان حاڵی و دنیا و دین لەدەس دەرچون و برا و دۆست لەبیرکردن . بەم بیرکردنەوەیە نزیکە ئینسان سوودێ وەربگرێ و ئەو ڕقەی خۆی کەم‌کاتەوە . هەروا ئەتوانێ کاتێ کە بە خۆی زانی وا نزیکە ڕقی هەستێ لەو شوێنی خۆیەدا نەمێنێ و بڕوا بۆ شوێنێکی‌تر ، یاخود ( اعوذُ بالله ) بکا ، یا بڕوا دەست نوێــژ بگرێ ، یا بیربکاتەوە لەوە کە ڕقەکەی خۆی بخواتەوە ، بەوجۆرە هەروەکو لە ئازاری دنیــا و قیامەت ئەپارێزرێ بە پایــەی بەرزی دوارۆژیش ئــەگا . یا بیربکاتەوە لەوە کەوا خوای تەعالا دەستی ئەڕوا بەسەریا و ئەتوانێ وەك ئەم ڕق‌ئەگرێ لە خەڵك خوایش ڕق لەو هەڵبگرێ و گیرۆدەی بکا .

( بێداری ) ڕقهەستان وەختێ ناشیرینە کە بە ناحەق بێ و لەسەر بەرزکردنەوەی پایەی ڕاستی نەبێ . ئەگینا هەر ڕقێ بەهۆی تێهەڵچوونەوە لەسەر ڕاستی پەیدا ببێ ، مایەی پاداشی چاکە لە ڕۆژی قیامەتدا . حەزرەت درودی خوای لێ بێ لەگەڵ ئەوەش کە بە حیلم و حەوسەڵەترین کەس بوە زۆرجار لەسەر هەندێ شتی حەق ڕقی هەستاوە، هەر بۆیەش ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتویەتی : « نِهايَةُ الكَمالِ الغَضَبُ في مَوْضِعِهِ والحِلْمُ في مَوْضِعِهِ » . واتە : پایەی ئەوپەڕی پێگەیشتن بۆ ئینسان ڕقگرتنە لەکاتێکا کە ڕقگرتن باش بێ و حەوسەڵەیە لەکاتێکا کە حەوسەڵە جێی خۆی بێ .
خوای تەعالا بۆ ئیرشادی پێغەمبەری نازدار بۆ ڕەوشتی بەرز فەرمویەتی : « خُذِ العَفْوَ وَأمُرْ بِالعُرْفِ وَأعْرِضْ عَنِ الجاهِلِينَ » . واتە : ئەی پێغەمبەری من لایەنی عەفو و چاوپۆشی وەربگرە بۆ خۆت و فەرمانبدە بە هەر وتار و کردەوەیێ کە لە ئاینی ئیسلامدا موافیقی عورف بێ و ناسراو و دامەزراو بێ چ لەوانەی ئەکرێن وەکو واجب و سوننەت و چ لەوانەی ناکرێن وەك حەرام و مەکروە و ، پشتیش هەڵکە لە موناقەشە و دەمەتەقێ لەگەڵ نەزانان .

گێڕراوەتەوە لە ئیمام جەعفەری صادق خوای لێ ڕازێ بێ کەوا فەرمویەتی: لە قورئانی پیرۆزدا ئایەت نیە لەم ئایەتە ڕەساتر بێ و هەمو ڕەوشت و کردەوەیەکی باش بگرێتەوە . ئەم فەرمودەیەی ئیمام جەعفەری صادق وا ڕون کراوەتەوە کەوا خوورەوشت بەپێی توانای نەفسی ئینسان یا لە حەز و ئارەزووەوەیە یا لە عەقڵ و ئیدراك و تێگەیشتنەوە یا لە ڕقهەستان و توڕەییەوە . خولقی میانە و موعتەدیل و باش لە بەشی حەز و ئارەزو و عیففەتە و ، یەکێك لەوانەی لە عیففەتەوە پەیدائەبن عەفوە . ئینسان کە عەفیف بۆ شتی باش بەجێدێنێ و شتی خراپ ناکا . ئەو خولقە باشەش کە لە عەقڵ و ئیدراکەوە پەیدا ببێ حیکمەتە . یەکێ لەوانەش کە لە حیکمەتەوە پەیدا ئەبن فەرماندانە بە چاکە و نەهیکردنە لە خراپە کە یەکەم واجب و سوننەت و دوهەم حەرام و مەکروە ئەگرێتەوە . عورفی ئیسلام لەسەر ئەوە دامەزراوە کە ئەمر بکرێ بە چاکە و نەهی بکرێ لە خراپە . ڕستەی ( وامُر بالعرفِ ) هەمو ئەمانە ئەگرێتەوە .

مەشهورە حەزرەت درودی خوای لێ بێ بە جوبرەئیلی فەرمو : مەعنای ( خُذِ العَفْوَ وامُرْ بالعُرْفِ ) چیە؟ ئەویش عەرزیکرد : نازانم ، با پرسبکەم. پاشان هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر و عەرزیکرد خوا ئەفەرموێت و ئەمرت پێئەکا : انْ تَصِلَ مَنْ قَطَعَكَ وتُعْطِي منْ حَرَمَكَ وتَعْفوَ عَمَّنْ ظَلمَكَ . واتە : خزم دۆستی بکەی لەگەڵ ئەو خزمەت کە پەیوەندی لەگەڵ بڕیوی و ماڵی دنیا بدەی بەوکەسەی کە بەشت نادا و چاوپۆشی بکەی لەوکەسەی ستەمت لێ

ئەكا . ئەو خوڵقە باشەیش كە لە ڕق‌هەستانەوە پەیدا ئەبێ ئازایەتییە . لەو خوڵقە باشانەشە كە لەم بناغەیەوە پەیدا ئەبن چاوپۆشی كردن لە ئینسانی نەفام و بێ‌ئەدەب . ( قاضی ابوبكری ابن العربی ) لە كتێبی ( احكام القرآن )دا ئەڵێ بە فەرموودەی زانایان ئەم ئایەتە هەموو ئەحكامی شەرع ئەگرێتەوە ، چونكە ( خُذِ العَفْوَ ) هەرچی نەرمی و چاوپۆشییە ئەگرێتەوە لە وەرگرتن و شت‌پێدان و تەكلیفاتدا . ( وامُرْ بالعرف )یش هەموو ئەو شتانە ئەگرێتەوە كە ئەمریان پێ‌كراوە یا نەهییان لێ كراوە.ئەمانە حوكمیان لە عورفی شەرعدا هەیە. ( وَأعْرِضْ عَنِ الجاهِلِينَ )یش چاوپۆشی و حیلم و حەوسەڵە ئەگرێتەوە كە پێویستن بۆ بەندە لە هەموو مراد و مەقسوودێكدا .

ڕۆڵەی دڵ‌بەندی شیرین ڕەوشتم — خاوەن تەمكینی مەلەك سروشتم
هەر لە سروشتا ئادەمی بەدبەخت — بەشێكی تیایە لە عەصەبییەت
بە كەمترین هۆ كەللەی فوئەدا — هەوای تێ‌ئەكا و ئەیخاتە سەودا
جا ڕۆڵەی هوشیار چاری خۆی ئەكا — نەوەك لەم ڕێوە بە زیان بگا
ئینسانی لاریش مێشكی نابارێ — ئەیخاتە سەر ڕێی چەتونێ و خوارێ

★ ★ ★

چەند دۆست و برا و چەند خزمی والا — تۆرەیی لێكی كردن تەوەلا
چەندێ دەركرا ژنی بەكەماڵ — چەند زایەكرا خێزان و منداڵ
چەند پیاوی گەورەی بە پایە و مایە — لەبەر تۆرەیی ڕۆیین بە زایە
چەندێ مەئیوس بوون لەعیلمی ئوستاد — چەندێ مەحرووم بوون لەشێخی ئیرشاد
چەندێ خۆی‌خستە ناوگێژی نەگبەت — لەبەر هێرشی بای عەصەبییەت

★ ★ ★

چەند جار ئاگری فیتنە هەڵكرا — بەهۆی ڕقەوە ، چەند ڕۆی‌دا هەرا
چەند بێ‌ئەنجامێ وەك ڕەنجی فەرهاد — كە عەصەبییەت گەنجی دا بە باد
غەزەب ئاگرە و حەواڵە ئەكرێ — هەتا سەر و ماڵ هەمووی گڕ بگرێ
بۆیە سەروەری عەجەم و عەرەب — بە یەكێ سێ جار فەرمۆی(لاتَغْضَب)

★ ★ ★

ئەوكەسەی عەقڵ و شوعووری هەبێ — دڵێكی ساف و پڕ نووری هەبێ
تا گیانی تیابێ لەم ڕۆی دنیایە — بە عەصەبییەت خۆی نەكا زایە
ساتێ خۆی ئەگرێ و نایەڵێ غەضەب — ببێ بە ئاگر بۆ خانۆی ئەدەب
ئەگەر تۆ بڵێی ئەمن ناچارم — ڕق‌هات بەسەرما بێ‌ئیختیارم
ئەڵێم ئەو كابرایش ڕقی هەڵئەستێ — سەرت ئەشكێنێ بە كوڵەمستێ
ئەڵبەتە ئەویش بە ناچارییە — جا وەرە سەیری ئەم نابارییە

★ ★ ★

کاکە بە شوعوور بیربکەرەوە ئەنجامی غەزەب لێکبدەرەوە
خۆت مەهاوە ناو تەنووری مەینەت پێ مەنێرە سەر سنووری نەگبەت
بە ئیستیعاذە و بە دەس‌نوێژ گرتن یاخود دەرچوون و جێ بەجێ‌هێشتن
یا بە تەفەککور لە پەریشانێ یا ترسی عەزاب لە نەشئەی ثانێ
یاخود بەهیوای جەزای قیامەت بۆ تۆش‌نەبوونی دەردی نەدامەت
ئەتوانێ وێنەی ئادەمێ ( نامێ ) خۆت ڕزگار بکەی لە بێ‌ئارامێ

## گوڵی سێ‌ویەکەم ـ گوڵی ڕاوێژکردن

هوشیار کەسێکە بۆ کاری موشکوڵ
زۆ ڕاوێژ ئەکا بە پیاوی عاقڵ
بەڵکو هەر ئیشێ عاقیبەت دارە
ڕاوێژ لەو ئیشا بەئیعتیبارە

خوای تەعالا فەرموویەتی :

**وَشاوِرْهُمْ فِي الأمْرِ ، فَاذا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلى اللهِ**

واتە : ئەی پێغەمبەر ڕاوێژبکە بە هاوڕێکانت لە کاروبارەکانتدا ، جا کە لەئەنجامی ڕاوێژەکەتدا عەزمت هاتەسەر کردنی ئەو کارەی ڕاوێژت لەبارەیەوە کردوە ، پشت ئەستوور ببە بە خودا و کارەکە بکە .

ڕاوێژ بەوە ئەڵێن کاتێ ئیشێکی سەخت هاتە پێش یاخود ئەتویست ئیشێکی بە مایە و نرخ بکەی و ئیشەکە دوادار بێ و هەڵی‌ئەگرت سوود یا زیانی تیابێ ، ڕاوێژ بکەی بە پیاوانی عاقڵ و هوشیار و خاوەن بەراورد و کارامە ، ئینجا پاش تێفکرین و کۆڵینەوە و لێکدانەوەی ئەنجامی ئەو ئیشە بڕیار لەسەر چێ درا ئینسان وەها دەست بۆ ئەو ئیشە ببا و پشت بە خوای عالەم قایم بکا .

( بزانن ) هەروەکو ڕەنگ و دەنگ و قیافەی ئادەمیزاد یەکیان لە یەکیان جیاوازە ، عەقڵ و هۆش و بیریشیان هەروا جیاوازە ، وەکو چۆن یەکێ چاوی تیژە و یەکێ چاوی مژمۆرە و بێجگە لەمە گەلێ‌کەس لەبەرئەوە کە بەسەرهاتی زۆریان دیوە ، بەراوردیان زۆرە و ئەنجامی گەلێ کاریان لا مەعلومە. کەواتە زۆر پێویستە ئینسان لە عەقڵ و بەراوردی ئەوکەسانە سوود وەربگرێ . بەگوێرەی دین واجبە لەسەر ئەوکەسەی ڕاوێژی پێ‌ئەکرێ بە بێ‌دوڕوویی و خەیانەت چێ‌ئەزانێ دەری‌ببڕێ . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموویەتی : « المُسْتَشارُ موءتَمَنٌ » . واتە : ئەوکەسەی کە ڕاوێژی پێ‌ئەکرێ بە ئەمین دانراوە و حەقی‌وایە لەگەڵ خاوەن مەبەستەکەدا خەیانەت نەکا .

هەروەکو ڕاوێژکردن بە هوشیاران سوننەتە لە دیندا ، نوێژی ئیستیخارەیش هەروا سوننەتە . ئەم نوێژە بریتییە لە دوو ڕکات بە نییەتی نوێژی ئیستیخارە یا داوای خێرکردن لە خوای تەعالا ، لە ڕکاتی یەکەمدا لەپاش فاتیحە سوورەتی ( قُلْ يااَيُّها الكافرونَ ) و لە ڕکاتی دووهەمدا سوورەتی ( قُل هو اللهُ احَدْ ) بخوێنێ و لەپاش سەلامدانەوە لە خودا بپاڕێتەوە بۆئەوەی لەبارەی ئەو ئیشەوە دڵی ڕووناك بکاتەوە . هیوا زۆرە خوای تەعالا بە هەر وەسیلەیەك بوە ، بە خەو بینین یا شتێکیتر ، دڵی بخاتە سەر لایەك لەبارەی ئەو ئیشەوە کە ئەیەوێ بیکا . پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « ما خابَ مَنِ استَخارَ ولا نَدِمَ مَنِ استَشارَ » . واتە : ئەوکەسەی ئیستیخارە بکا نائومێد نابێ لە میهرەبانێ خوا و ئەوکەسەی ڕاوێژ بکا لە ئیشی خۆیدا پەشیمان نابێتەوە . هەندێ لە زانایان فەرمویانە ئەوکەسەی سوپاسی نیعمەت بەجێبێنێ لەسەر نیعمەت زیادە نیعمەتی ئەدرێتێ و ئەوکەسەی تەوبە ئەکا لە تاوان عەفو و چاوپۆشی لە تاوانەکانی وەرئەگرێ و ئەوکەسەی ئیستیخارە ئەکا ئەنجامی باشی بێ پیشان ئەدرێ و ئەوکەسەی ڕاوێژ ئەکا بە هوشیاران ڕێگای ڕاستی حاڵی ئەکرێ .

هەندێ لە زانایان وتویانە ئادەمیزاد سێ بەشە . شت و نیوەشت و هیچ. شت ئەوەیە خۆی زانا بێ و زانستیش لە خەڵك وەربگرێ . نیوەشت ئەوەیە خۆی زانا نەبێ بەڵام ئامادە بێ بۆ پرسیار . هیچیش ئەوەیە نە خۆی زانا بێ و نە ئامادەیش بێ بۆ پرسیار لە زانایان و لێفێربونیان .

ڕاوێژکردن بە کەسانی ژیر هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە خوی ئادەمیزاد بوە . ئەم کارەگەلێ گۆڕان و زیاد و کەمی بەسەردا هاتوە تا گەیشتوە بە ئایینی ئیسلام . لە ئایینی ئیسلامیشدا بە نەصصی ئایەتی قورئان فەرماندراوە بە حەزرەت دروودی خوای لێ بێ کە ڕاوێژ بە یارانی بکا و بڕیاردراوە کەوا بۆ هەر ئیشێکی گرنگ ڕاوێژ بەکاربێت . لە واقیعدا ئەگەر ئەم یاسا بەجێبهاتایە بەڕاستی موسوڵمانان لەگەلێ ڕۆژی ڕەش ئەپارێزران .

ڕۆڵەی خۆشەویست خاوەن فامەکەم
ئینسانی ژیری بەنرخ و تەقدیر
یاسای شوعووری ئادەمیزادە
سوننەتی دینە ڕاوێژ و تەگبیر
بەڵام بە شەخصی ژیری دەروون پاك
ئیستیخارەیش هەر وەك ڕاوێژ وایە
لەپاش نوێژەکەت ئەپاڕێیتەوە
خودا بەڕەحمەتی ئەگەیەنێ

بەمنای نەهاتی ڕۆی ئەییامەکەم
ئەژێ بە خۆشی بە نووری تەدبیر
ڕاوێژ بە عەقڵی پیاوی ئامادە
نەصصی قورئانە و حەدیثی بەشیر
خاوەن بەراورد لە چەرخی ئەفلاك
دوو ڕکات نوێژە ، کاری ڕەوایە
ئەنجامی نەبوو هەم ئەیکەیتەوە
ڕێگای ڕزگاریت لەبوو ئەنوێنێ

نائومێد نابێ لە ئیستیخارە
کاری بێ ڕاوێژ هەروەك شیری خاو
ئیشی بەڕاوێژ ماستی ژەنراوە
هەرکەس بایێ بێ بە ئەفکاری خۆی
بەلام چەند فکرێ پال بدەنە یەك
هەر گەلێ کاری لەسەر ڕاوێژە
هەر گەلێ بیری بۆ یەك لا نەبێ
بە بەراوردە بەیانی ( نامێ )

پەشیمان نابێ لە ئیستیشارە
مەغزەکەی ئەڕوا و ئەبێ بە سڕگاو
کەرە و دۆ و کەشکی وێنەی لێشاوە
دە لە صەدی خەیر هەلناکەوێ بۆی
بە وێنەی شاباز ئەگەن بە فەلەك
ڕۆژگاری عومری دوور و درێژە
چارەڕەش ئەبێ و ژین کوتا ئەبێ
هەم بەپێی واتەی شەرعی ئیسلامێ

## گولی سێ‌ودوهەم ــ گولی یارمەتی‌دانی یەکتر

بڕام ئەگەر تۆ خاوەن قیمەتی
دائیم حازر بە لەبۆ یارمەتی
نیوەی عیبادەت خزمەتی عامە
خزمەت ڕوکنێکی دینی ئیسلامە

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرموێەتی :

**وتعاونوا على البرّ والتّقوى ولاتعاونوا على الإثم والعدوان**

واتە : یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر کردەوەی چاکە و یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر گوناە و دەست درێژکردن بۆسەر بێتاوانان .

یارمەتی‌دانی یەکتر پێویستی ژیانی بێ‌زیانی ئادەمیزادە . بەڕاستی دەرکەوتوە کەوا ئادەمیزاد لە جیهانا ناژێ بێ‌ئەوەی کە خەلك یارمەتی بدەن . تەنانەت بەندەیێ خوای گەورەیش بە بێ‌یارمەتی جێ‌بەجێ نابێ بۆ ئینسان . ئەوکەسەی نوێژ بکا پێویستی هەیە بە پۆشاکێ عەورەتی پێ داپۆشێ ، بە مەسینەیێ ئاوی تێ‌بکا ، بە بەردێ یا بەرمالێ نوێژی لەسەر بکا ، بە یەکێ نوێژ و ئادابی نوێژی پێ بلێ ، بە کەسێ سوچی ڕوە و قیبلەی نیشان بدا ، بە سەعاتێ کاتی نوێژی تێ بگەیەنێ . ئەم پێویستییانەشی بە یارمەتی خەلکی‌تر بۆ جێ‌بەجێ ئەبێ .

ئینسانێکی خاوەن کشتوکال پێویستی بە هێش و گاسن و توبەرە و تۆو هەیە . پێویستی بە نان و کاسەیەك دۆ هەیە . پێویستی بە نانەوا هەیە نانی بۆ بکا . نانەوا پێویستی بە دار و ساج هەیە . دارهێنانیش پێویستی بە دارکێش و تەور و تەوراس و بە گوریسێ هەیە کولە دارەکەی پێ ببەسترێ .

لەسەر ئەم ئەساسە زانایان وتویانە بە وردکردنەوە دەرکەوتوە کەوا نانێکی برژاو پێویستی بە نزیکەی صەد کرێکار هەیە ئیشی تیا بکەن . کەواتە وا دەرکەوت ئادەمیزاد بە تەبیعەت شارییە ، واتە کۆمەڵە خوازە و بێ کۆمەڵە ناژێ ، چونکە مادەم بۆ نانێکی برژاو ئەوەندە کرێکار پێویست بێ ، ئەبێ ئیشێکی گرنگی جیهان وەکو بڵاوکردنەوەی مەعاریف و زانست و پیشە و پیشەوەرێ و ئاوەدان کردنەوەی نیشتمان و بەرگرێ لە هێرشی دوژمن و رێکخستنی سوپا و بەرێوەبردنی وڵات و باقی ئیشە پێویستەکانیتر قەرەباڵغێکی چەند زۆرتریان بوێ ! .

ئێمە کە سەرنجی مێژوی جیهان ئەدەین بۆمان دەرئەکەوێ کەوا هیچ شتێکی بەقیمەت بێ یارمەتی نەکراوە و تا یارمەتیدانی یەکتر لە کۆمەڵدا بەهێزتر بوبێ ئیش بەئاسانتر تەواو بوە و کۆمەڵە زیاتر زۆ لە بەرزەوەبون بوە و پارێزراوتر بوە ، وەکو مەشهورە « برا لە پشتی برا بێ قەزا مەگەر لای خودا بێ » . بۆیە حەزرەتی پێغەمبەری نازدار سەلامی خوای لێبێ فەرمویەتی : « المُؤمِنُ للمؤمِنِ كالبُنْيانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً » . واتە : موسوڵمان بۆ موسوڵمان وەك دار و بەرد و دیرەکی خانو وایە هەندێکی هەندێکیتری پتەو ئەکا . یارمەتی دارێکی ئەستورە بنەکەی لەناو زەویدایە و سەری لە ئاسمانە و پەلی گەورە و بچوکی بێژمارەی هەیە . بە دەم و دەست و خامە و نامە و بە نان و شان و تێکوشان دێتەجێ و هەرچی یارمەتییەك کە بە عەقڵ و وژدانی پاك رەوا بێ ئەوە لە ئایینی بەرزی ئیسلامدا یا فەرزە یا سونەتە .

لە یارمەتییە ئامۆژگاری کردنی ئینسانی نەزان و رێگا پێ نیشاندانی لە هەر ئیشێکی موشکولدا کە بێتە رێگەی . هەروا لە یارمەتییە ئەمە ئەگەر خۆت دەستت نەرۆیشت بۆ چاکەکردن هانی یەکێکیتر بدەی کەوا چاکە بکا ، وەکو حەزرەت فەرمویەتی : « الدّالُّ علی الخَیْرِ کفاعِلِهِ » . واتە : ئەوکەسەی یەکێ شارەزا بکا بۆ کردنی ئیشێکی چاك وەکو ئەوە وایە کە خۆی کردبێتی، واتە ئەوەندە خەیری پێئەگا . لە یارمەتیدانە چارکردنی موشکیلەی ئینسانێکی گیرۆدەبوی داماو . حەزرەت درودی خوای لێ بێ لە تەعریفی ئەوکەسانەدا فەرمویەتی : « مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤمِنٍ كُرْبَةً نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الآخِرَةِ » واتە : هەرکەسێ ئازارێ یا گیروگرفتێك لە موسوڵمانێ لابدا خوا لە پاداشی ئەوەدا مەینەتێ لە مەینەتەکانی رۆژی قیامەتی بۆ چارئەکا و رزگاری ئەکا لێی .

دیسان لە یارمەتیدانە تکاکردن بۆ گیرخواردویەك کە لە کوشتن یا لە زاگرتن یا لە زیندان رزگار ببێ ، یا تکاکردنی کەسێکی گەورە بۆ بەخشینی تاوانبارێك یا بۆ دامەزراندنی کەسێك لەسەر ئیشێك کە خۆی و خێزانی پێیبژین یا بۆ گێرانەوەی دەرکراوێك بۆ سەر ئیشی یا بۆ رێگە و جێگەی خۆی

وەکو خوا فەرمویەتی : « مَنْ يَشْفَعْ شَفاعَةً حَسَنَةً يَكُنْ لَهُ نَصِيبٌ منها » . واتە : یەکێ تکا بکا بۆ کەسێك بە تکایەکی جوانی ڕەوا ، ئەوکەسە لە خێری ئەو ئیشەدا کە تکاکەی تیا ئەکا بەشێکی بۆ دائەنرێ . هەروا لە یارمەتیدانە قەرزدان بە کەسێ کە پێویستی پێ بێ لە ڕێگەی خوادا وەکو خوا فەرمویەتی : « مَنْ ذا الذي يُقرِضُ اللهَ قَرْضاً حَسَناً » . واتە : کێیە ئەو بەختەوەرەی دڵی هاتوەتەسەر ئەوە قەرزێکی باش بدا بە خوا ، واتە قەرزەکە لەبەر ڕەزای خوا بدا بەو داماوە نەك لەبەر هیچ مەبەستێکی دنیایی .

هەر لە یارمەتییە وەقفکردنی زەویوزار و باخ و بێستان یا خانوبەرەی زیادە بۆ مزگەوت و قوتابخانە و نەخۆشخانە و بۆ داماوان و هەژاران و بۆ هەر مەبەستێکی چاك . هەروا لە یارمەتییە ئەمە کەوا ئینسان داوای کەسێکی بێدەسەڵات بگەیەنێ بە گەورەیەك و ئیشەکەی بۆ جێبەجێ بکا ، وەکو حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « ابلِغوا حاجَةَ من لا يستطيعُ ابلاغَ حاجتهِ ، فمَنْ ابلغَ سلطاناً حاجَةَ من لا يستطيعُ ابلاغَها ثبَّتَ اللهُ قدَميهِ على الصِّراطِ » . واتە : داماوی ئەوکەسانە بگەیەنن بە گەورە گەوران کە خۆیان داماوی خۆیانیان پێ ناگەیەنرێ ، چونکە هەرکەسێ داماوی کەسێکیوا بگەیەنێ کە خۆی پێی نەگەیەنرێ ، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا پێی بەسەر پردی صیراطەوە ڕاگیر ئەکا و ناهێڵێ بکەوێتە خوارەوە بۆناو دۆزەخ .

خوا لەسەر ئوسوڵی یارمەتیدانی موسوڵمانان بۆ موسوڵمانان زەکاتی فەرز کردوە لەسەر خاوەن پارە و دەغڵ و دان و حەیوانداەکان بە پێنجیەك و دەیەك و چل یەك و وێنەی ئەمانە .

هەر لە یارمەتییە هەرەوەز کردن بۆ چارکردنی ئیشوکاری هەندێ موسوڵمانی ئیش لێنەهاتو ، یا کۆکردنەوەی ڕزق بۆ موسوڵمانێکیوا لێی قەوماببێ و خۆی بۆی نەکرێ چارەسەری خۆی بکا . لە یارمەتییە لەکاتێکدا یەکێ تێکۆشێ بۆ ئەمر بە چاکە یا مەنعی خراپە،کەسێك پەیدا ببێ بۆ بەربەرەکانێ کردنی ، ئینسان کۆمەکی ئەم موسوڵمانە بکا کە ئەمری بە چاکە کردوە و مەنعی خراپەی کردوە و، دەنگی خۆی بخاتە پاڵ دەنگی ئەو تا ئیشەکەی بۆ بچێتەسەر.

لە یارمەتیێ زۆر گرنگ و بەنرخە ئەمە کە کۆمەڵێ لە ناسراوان شانبدەنە بەر بۆ پەیداکردنی خواردەمەنیێ و بەرگ و پۆشاك بۆ داماوان . هەروا لە یارمەتیدانە دانانی سندوقی خێرات بە ناوی هەر ئیشێکی پێویستەوە کە سودی ببێ بۆ موسوڵمانان . بیستومە لە هەندێ وڵاتدا کراوە بە عادەت کە هەژارێ منداڵێکی ئەبێ خەڵکی ئەو شوێنە هەریەکێ ئەندازەیەك پارە کۆئەکەنەوە بە ناوی ئەو منداڵەوە و ئەیخەنە کار و ئاڵوو یڵی پێئەکەن و بە قازانجی پارەکە منداڵەکە بەخێو ئەکەن . ئەگەر وارێکەوت باوکی ئەو منداڵە مرد ، منداڵەکە بە سودی ئەو

پارەیە بەڕێوەئەبرێ تا گەورە ئەبێ و پێ ئەگا . ئەوسا چێ لە پارەکە مابێتەوە ئەیدەنەوە بە خۆی . ئەگەر منالەکە خۆیشی مرد پارەکە ئەخەنە کار بۆ مەسرەفی داماوانی‌تر .

یارمەتی کارێکی بەسوودە و زۆریش ئاسانە . ئەگەر کۆمەڵێ خەڵکی هەر شوێنێ بیریان لەسەر بڵاوکردنەوەی گیانی یارمەتی‌دانی یەکتر و هەرەوەزێ کردن بێ لەناو خۆیانا ، ئەتوانن گەلێ ڕێگای وا بدۆزنەوە ئەم مەبەستەی لێوە بهێننەدێ و خزمەتی باشی پێویستییەکانی کۆمەڵەکەی خۆیانی پێ بکەن .

ڕۆڵەم ، براکەم دۆستی پایەبەرز　　ئەم دەرسی منە فێربە وەك فەرز
ژینی ئەم دنیا بە بێ یارمەتی　　ناگا بە پایەی بەرزێ قیمەتی
پێویستە هەمو وێنەی گوڵاڵان　　دەس لە مل بکەن بە تولی ساڵان
بە دەمو دەستو ماڵو حاڵو شان　　یارمەتی یەکتر بکەن بە نیشان
ئەو سەرەی نەبێ لەناو سەرانا　　با سەرگەردان بێ لەناو دەرانا
سەرێ بێ‌سوود بێ لە سەودای هۆزا　　با هەر ون بێ لە تەپ‌وتۆزا
نەکەن لە گەلا جێتان خالی بێ　　دوژمن بە بێ‌هێز لێتان حاڵی بێ



بۆیە پێم‌خۆشە فەسڵی بەهاران　　دەست‌ئەکەنەمل گوڵان چون یاران
گوڵی ڕەنگاوڕەنگ بە شێوە شیرین　　وەنەوشەی شین‌و نەرگس و نەسرین
چەند خۆشە ژیان لە ڕیزی یاران　　وەکو ڕیزی گوڵ کاتی بەهاران
بۆ دین و دنیا بە شادێ و خۆشی　　لەگەڵ یارانا ئەبێ تێکۆشی
برادەر دەستە بۆ پیاوی بێ‌دەس　　داڵدە و پەنایە و هیوا و فریادڕەس
پیاوی بێ‌برا بێ دەست و چاوە　　پیاوی برادار هەمووی تەواوە
بە ڕۆژی ڕەش و بە شەوانی تار　　برا چرایە لە بۆ گرفتار



صەد کە تۆ کورد و خاوەن هیممەتی　　ئاگەی بە ئامانج بە بێ‌یارمەتی
بۆیە بە حوکمی خودا و پێغەمبەر　　یارمەتی بوە بە فەرز بۆ بەشەر
ئەو تیکە نانەی ئەیهاوێتە دەم　　ئیشی تیا ئەکا صەدکەس خاترخەم
ئەم یارمەتییەیش وەکو بۆ ژینە　　پایەی ئەساسی میللەت و دینە
دین ئەوە نیە بڕۆیتە ناو چۆڵ　　باری خزمەتی خەڵك لادەی لە کۆڵ
دین هەر خزمەتە بە خودا و بەندە　　هەر خزمەتکاری‌وا ئەرجومەندە
کاسەیێ ئاوی سەرچاوە و کانێ　　ئەبێ بە بەها بۆ جاویدانێ
دەمێ تەڕ بکەی بە تنۆکێ ئاو　　پڕتەوی ڕەحمەت لێت ئەدا بە تاو
گەلێ کە فێری یارمەتێ بکرێ　　شوێنی خۆی لەجێی بەرزیدا ئەگرێ

| | |
|---|---|
| نـامرێ گەلی دەسـت لە مل کردوو | نــازێ کۆمەڵـی تەمەڵـی مـردوو |
| یارمەتی هەرکەس سـوودی بۆ خۆیە | ئیمڕۆ بۆ منـە و سـبەی بۆ تۆیـە |
| کە ڕێی یـارمەتی هەڵبگرێ ئینسان | ئەگاتە مەنزڵ بە سـووك و ئاسـان |
| ( نـامی )یە گەلی خـاوەن یارمەتی | هەر ئەخوا بەری بەرزی هیممەتـی |

## گوڵی سیوسێهەم ـ گوڵی یەکێتی و یەكدڵی

هـەرچی ئـازادی و بـەرزی ئافاقە
سەرچاوەی هەمووی هـەر ئیتتیفاقە
هەرچی داماوی و پەستییە هەمووی
بـن و ڕیشـــەکەی دەردی نیفـاقە

خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی :

**وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا**

واتە : هەمووتان توند دەست بە پەیمانی ئیمـان و خوداناسینەوە بگرن و لەیەك جوێ مەبنەوە .

هەروەها فەرمویەتی :

**وَلا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ**

واتە : بەگژی یەکدا مەچن تا ژێربکەون و ناوتان بزڕێ .

لەوڕۆژەوە کە ئادەمیزاد لەسەر زەوی بڵاوبوەتەوە و پـەرەی سەندوە و چاوی کراوەتەوە ، هەرچی پێشکەوتنێ بۆ هەر تاقمێ بوبێ هەر لـە یەکێتی و یەكدڵی و یەكەبەستییەوە بوە و ، هەرچی سەرگزی و پاشکەوتنێ بوبێ هەر لە جیاوازی و دوودڵی و خودخواهییەوە بوە . یەکێتی ئەوەیە هەر کۆمەڵەیێ لە هەر خاك و سامانێکدا بن یەكدڵ و یەك ئامانج بن ، سـوود و زیانیان لە سوود و زیانی گشتیدا بزانن . جا کە خۆیان هاتنەسەر ئەم بارە هەموو وەك یەك ئینسانیان لێ دێ ، ئەگەر یەکێکیان تووشی زیانێ بوو ، باقی خەڵکەکە بۆی بێئاسایش ئەبن ، وەك چۆن ئەگەر ئینسانێ سەری یا چاوی یا سـکی ئێش بکا ، ئاسایشـی لێ هەڵئەگیرێ تا ئەو ناساغییە چارئەکا .

بۆ بەجێهێنانی یەکێتی چەند شتێ پێویستە . یەکەم : ئەوەیە ئەو گەلە یا زوربەی ، خوێندەواری باش و پێگەیشتوو بێ و لە قازانج و زیـانی خـۆی و وڵاتەکەی تێبگا و پاشەڕۆژی خـۆی بهێنێتـە پێش چـاو . دووهەم : ئەوەیە

ڕۆڵەکانی ئەو گەلە بۆ پێگەیشتنی گەلەکەیان قازانجی تایبەتی خۆیان فەرامۆش بکەن ، واتە قازانجی خۆیان لە قازانجی گەلەکەیاندا بزانن . سێیەم : ئەوەیە گەلەکە نیظامێکی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ هەموو حورمەتی بگرن ، چونکە گەلی بێ‌نیظام بە هیچ جۆرێ جێگەی باوەڕ و متمانە نیە . چوارەم : ئەوەیە ڕەهبەرانی ئەوگەلە سەربەرزی خۆیان لە ڕزگاری گەلەکەیاندا بزانن و چاویان لە مەسلەحەتی تایبەتی خۆیان نەبێ ، بەمەعنا کەوا ئەو مەبەستی خۆیانە لەناو مەبەستی گشتی ئوممەتەکەیاندا بتوێننەوە و ببن بە خزمەتکاری . پێنجەم : ئەوەیە زانست و پیشە و هێزی خۆ ژیاندن لەو گەلەدا پەرەبسێنێ ، ئەگینا گەلی برسی بە فیکەیەك هەڵئەخەڵەتێ ، چجایە بە تیکەیەك .

جا مادەم زانست و تێگەیشتن و پێگەیشتن یەکیان‌گرت و ڕاوێژ و واتەیان کەوتەیەك ، ڕۆڵەکانی ئەو گەلە ئەتوانن تێبکۆشن و هەوڵ‌بدەن بۆ مایەی ڕزگاری و سەربەرزی خۆیان و نەتەوەکەیان و هەموو ئامانجێکی خۆیان بەئاسانی دەست‌ئەکەوێ . ئێمە کە تەماشای مێژووی ئیسلام ئەکەین ئەبینین پیاوە بەرز و بەناوبانگەکانی ئیسلام وەك عومەری کوڕی خەططاب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و صەلاحەددینی ئەیوبی خوایان لێ ڕازی بێ هەموو لەبەرئەوە بوون بە هۆی ڕێکخستنی ئیش‌وکاری حوکومەتی گەورەی ئیسلام و توانییان دوژمن لە وڵات دووربخەنەوە چونکە خۆیان لە هەوا و ئارەزووی نەفس و مەبەستی تایبەتی دوورخستەوە .

هەر گەورەیێ کە دڵسۆزی و ساغی لەگەڵ گەلەکەی دەربکەوێ ئەوە ئەو گەورەیە گەلەکەی بۆی‌ئەبن بە فیدائی و قوربانی لەبەر پێیدا . بەڵام ئەگەر خودخواه و خودپەرست بێ و دوای ئارەزووی تایبەتی خۆی بکەوێ ، ڕۆژبەڕۆژ لە نەفسی میللەتەکەی خۆی دوژمنی بۆ پەیدائەبێ و ئەوەندەی پێ‌ناچێ لەسەر تەختی سەربەرزییەوە فڕێی‌ئەدەنە خوارەوە بۆسەر خاکی داماوی و کزی و پەستی ، بەڵکو لەوانەیە بیشیکوژن و لەناوی بەرن .

گەلێ کە بیەوێ بەرز ببێتەوە ، هەروەك زانست و پیشە و صەنعەت و یەکیتی پێویستە ، خووڕەوشتی بەرزیشی پێویستە ، وەکو شاعیر وتویەتی :

**وَإِنَّمَا الأُمَمُ الأَخْلاقُ ، مَابَقِيَتْ**
**بَقَوا ، وَإِنْ ذَهَبَتْ أَخْلاقُهُمْ ذَهَبُوا**

واتە : مانەوەی میللەت بە ئەخلاقەوەیە ، ئەگەر ئەخلاقی میللەت مایەوە میللەتەکە خۆیشی ئەمێنێتەوە و ئەگەر ئەخلاقی نەما خۆیشی نامێنێ . سیڕی ئەمەیش ئەوەیە کەوا هەرکاتێ ئەخلاقی پەسەند لەناو کۆمەڵدا نەما ، ئەوە لەجیاتی ئەو ئەخلاقە پەسەندانە ئەخلاقی ناپەسەندی وەك ستەم و زوڵم و

زۆر و فیسق و فوجور و داوێن‌پیسی و بێ‌شەرمی و بێ‌کەرامەتی و تەماعکاری و بێ‌ئینسافی و بێ‌ڕەحمی و شتی‌وا پەیدا ئەبێ و ئەبێ بە باو . ئاشکرایشە کۆمەڵی‌وا ڕۆژبەڕۆژ ئاشوب و فیتنە و غەوغا لەناویا بڵاو ئەبێتەوە. لەولایشەوە خوای تەعالا غەزەبی دێتەجۆش و لەناکاو لە شەوێکدا یاخود لە ڕۆژێکدا ئەو پایە و مایەیە تێك‌ئەدا و ئەیکا بە سەرگوزەشتەی پێشینان .

( بزانن ) پێویستە بۆ ئەوکەسانەی کە ئەیانەوێ میللەت یەك‌بخەن ، چەند خۆیەکیان هەبێ . یەکەم : ئەبێ موجامیل و ڕوخۆش و دڵ گوشاد و هۆگر بن . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : لا خَيْرَ فِي مَنْ لا يَألِفْ وَلا يُؤلَفْ . واتە : ئەوکەسانەی نەئولفەت لەگەڵ کەس ئەگرن و نە ئولفەتیان لەگەڵ ئەگیرێ ، کەڵکی هیچیان پێوە نیە . دوهەم : پێویستە تێکۆشەر و بەکێشمان بن و زو نەگەڕێنە دواوە . سێهەم : ئەبێ دەست گوشاد و خاوەن بەخشش بن چونکە ئینسانی ژڕدی پارە دۆست کەس خۆشی ناوێ . چوارەم : ئەبێ هەل لە کیس نەدەن و بە هەر واسیطەیەك مەیدانی ئەوەیان بۆ هەڵکەوت بە ڕێگای یەکخستنی میللەتدا هەنگاو بنێن ، ئەو هەنگاوە بنێن . پێنجەم : ئەبێ چاوپۆشییان هەبێ لە ڕەوشتی بەدی هەندێ‌کەس ، چونکە ئینسانی توڕە و تۆش ناتوانێ خەڵك بخاتەیەك .

ڕۆڵەی ئارامی بێ پەلەپەلم  هەوێنی شیری یەکێتی گەلم
پێویستە یەك بن بە دڵ و زوبان  بەڵکو ڕزگاربن لە بەڵای زەمان
سەربەرزی کۆمەڵ بە یەکێتییە  نیفاق سەرچاوەی گشت نەگبەتییە
هەر بە یەکێتی مەردانی وڵات  گەیین بە تەخت و تاج و دەسەڵات
هەر بە یەکێتی بوون بە پاشا  بۆن بە خاوەنی تەعمیر و ئینشا
گەلێکمان بینی جۆگەلەی کەم‌کەم  کە بۆن بە یەکێ بۆن بە گەورە چەم
تاتای دەزوی خاو منال ئەیبڕێ  کە هۆنرایەوە دەستی شێر ئەگرێ
چەند هەودا دەزو بەیەکا پێچران  ئەبن بە کەمەند لەبۆ دلێران

★ ★ ★

مایەی وێرانی لە هەرلای جیهان  دەردی نیفاقە ئاشکرا و پەنهان
نیفاق دەردێکە ئەوەندە شومە  لە هەر شوێنێ بۆ بە چەشنی بومە
کاتێ ئەڕوانین بۆ مێژوی ئوممەت  باش دەرئەکەوێ بۆ خاوەن حیکمەت
ئەساسی نیفاق خودپەرستییە  ئەمەیش لە دەردی مەستی‌و پەستییە
کابرا نازانێ کە چەرخی گەردون  نابێ بە برا لەبۆ پیاوی دون
چەند ڕۆژ بە مەستی دەرونی شادە  باش ئەوە مەیدان چۆڵە لەبادە
مەرد ئەوکەسەیە بۆ نیشتمانی  خۆی ئەکا بە قۆچ قۆچی قوربانی

نه ماڵ و نه گیان نه پایه و نه شان    نابێ به سائی بەرزی نیشتمان
چونکه نیشتمان پێشکەیه بۆ گەل    مایەی ژیانه بۆ گەل تا ئەجەل

★ ★ ★

یەکێتی ئەبێ بەپێی یاسا بێ    یاسایێ بۆ داد بە حەق ڕەسا بێ
وەطەن بێ یاسا و یاسا بە بێداد    وێرانه وێران ، بەربادە بەرباد
هەرکەسێ بۆ خۆی بێتە فەرماندار    ژین نەبێ بە ژان ، ژانی ژاری مار
یاسای وا ڕەساش یاسای خودایه    قورئانە ژین و دینی تیایە
( اَمْرُهُمْ شُورىٰ بَيْنَهُمْ ) بە حەق    بۆ شەوی تاریك نەبێ بە شەبەق
شورا بمەعنا ڕاوێژ و تەگبیر    بە پیاوی زانای بە هۆش و ضەمیر
بە هەڵبژاردن لە هەمو سامان    ژیران بێنە سەر تەقریری فرمان
مەجلیسێکیوا گرد ئەبێتەوە    عالەم لەبەریا ئەحەسێتەوە
لاتێ و نەخۆشی و نەزانی یەکجار    ڕیشەکێش ئەبێ لە لادێ و لە شار
بەم یاسا فەرمان نابێ بە میرات    لەسەر کەلەپور وێران بێ وڵات
زەند و ئەردەڵان بابان و بۆتان    بۆ میرێ میرات وڵاتیان سوتان
مەجلیسی گشتی بەهەشتی عامە    چونکە ئەساسی بە ئیعتیصامە
ڕێگە بەڕاستی بۆ ( واعتصموا )    ئەبێ بە مایەی یەکێتی هەمو
بۆ ئەمە ( عومەر ) بە دڵ ئاگاهێ    فەرمۆی ( حَسْبُنا كِتابُ اللهِ )
بە هیوای حوکمی کیتابی خودا    لەویا بێدەنگ بۆ ڕەسوڵی هودا
بێن بۆ بەراورد دەورێ وا بڕۆن    بەڕاستی نانتان ئەکەوێتە ڕۆن

★ ★ ★

لەم ڕێگە لاتدا خودپەرستییە    ئەوەڵ و ئاخر مایەی پەستییە
من لەو باوەڕام جەنگی خێر و شەڕ    بە خودپەرستی کەوتوەتە گەڕ
گومانموایە کە بتپەرستی    هاتە ڕۆی جیهان بۆ خۆپەرستی
بتی ئەو ( لات ) و هی ئەم ( مەنات )ە    بۆن بەهۆی هەمو ئەم کارەساتە
نازانن ئەگەر لە حەق بپرسن    نه بت ئەپرسن نه قەت ئەترسن
من بم بە فیدای ڕەسوڵی خاتەم    کە حەقپەرستی هێنا بۆ عالەم
ئیستەش بەم هەمو بێمەرامییە    هەر حەقپەرستی بەرزە و (نامی)یە

★ ★ ★

جا لەم مەقاما بە نیازی ئیسلام    بۆت بەیانئەکەم سیرەتی ئیسلام
تا باش تێبگەی کە دین ڕەسایه    بۆ سودی عالەم پایەی بالایه
بیناغەی ئیمان تەصدیقه و باوەڕ    بەوەی هێناویە بۆمان پێغەمبەر
کە بە ئەخلاق و موعجیزەی ئیسپات    ڕیسالەی دەرکەوت بۆ گشت کائینات

بـە کیتابێـکی جامیـــع و نافیـع    لەبۆ خـەیر و شـەڕ جالیب و دافیع
بە سوننەتی خـۆی وتـار و کردار    بە تەقریری کـار لەسـەر ئیعتیبار
جا بە کیتـاب و سـوننەتی ڕەهبەر    گەلێ یاسای بـەرز دێتە بەر نەظەر
موهیمماتەکان بـۆت تـەقریر ئەکەم    بەو موهیمماتە تـۆ تـەنویر ئـەکەم



یەکەم موهیممات بـۆ زانای هوشیار    بـاوەڕ کردنـە بـە پـەروەردگار
پەروەردگـاری حـەکیمی خـەللاق    خالیقی هـەمۆ ئەنفوس و ئـافـاق
پـەروەردگاری زانـا و تـەوانا    کە لەسەر حیکمـەت جیهـانی دانا
دۆهەم موهیممات باوەڕ بـە ڕەهبەر    بۆ ڕێ‌نیشان‌دان بـە پەرێ و بەشەر
ڕەهبەر پێت‌ئەڵێ پێویستە شـوعوور    بـە مەسئولیەت لـە نزیـك و دوور
پرسیـار نەکرێ لە خێر و لە شـەڕ    نامێنێ فـەرقی حەیوان و بەشـەر
سـێهەم باوەڕە بە فریشتەی حەق    چوارەم بە کتێب سەماوێ موطلەق
پێنجـەم بـاوەڕە بـەوە کـە قـەزا    بـە مـەیلی ئەوە هـەرچێ ڕۆئـەدا
شەشەم بـاوەڕە بـە ڕۆژی جـەزا    لـەبۆ کـردەوەی سـزا و ناسـزا
پێنج بەندی فورۆع ئـەرکانی ئیسلام    خێر و حیکمەتن لـەبۆ خاص و عـام
دوازدەهەم یاسـای ڕەوشتی بـەرزە    هەر ڕەوشتی بەرز خۆشی سەرئەرزە
ئەمر بـە مەعرۆف ، نەهی لە مونکەر    بەرزتر ڕەوشـتی بـەرزی پێغەمبەر
سیازدەهەم‌زانست بۆمەردی هوشیار    لە ئیش‌وکـاری بە سـوود و بەکـار
چواردە مل‌کەچێ بۆ خودا و ڕەهبەر    بۆ فەرمانداری گـەورە و موعتەبەر
بـۆ ڕاگرتنـی ئیـدارەی ئیسـلام    لە فەرزی عـەین و کیفایەی ئەحکام
پازدەهەم هێزە بـەگوێرەی زەمـان    بـۆ پاراسـتنی خـاکی نیشـتمان
تـا زیـان نەگـا بە سنۆری خـاك    لە شەڕ و گـەڕی دوژمنی نـاپـاك
شازدە ئیدارەی ثەقافـەی ئـوممەت    بە عیلم‌و هونەر بە کەسب‌و صەنعەت
حەڤدە ئیـدارەی تەندروستێ عـام    تا خـەڵکێ نەمرن نـاوادە و نـاکام
هـەژدە ئیـدارەی ژیـانی میللـەت    ژیانی ڕەسا و بێ‌قـەهر و ذیللـەت
نۆزدە ئیدارەی ئەحـکامی ئیسـلام    بە عولەمای دین بـۆ نەشری ئەحکام
ئەوەی وا لەناو کیتاب و سـوننەت    خەڵکێ تێی‌بگەن بـە ڕۆی حەقیقەت
ئـەوەی پـەنهانە وا دەری‌بێـنن    تـا موسوڵمـانان هیـچ دانەمێنـن
( اكملت لكم ) فەرمـوودەی ڕۆن بـێ    چۆن ئەبێ زانا حـوکمی لێ ون بـێ
یاسایەکی‌وا و مەجلیسـێکی بـەرز    بەشـێوێ سـا چۆن ڕۆنەکاتە ئەرز
مەگەر کۆمەڵێ خائینی دین سـست    لـەباتێ خودا بینـە خودپەرسـت



توخوا بڕوانن بۆ ئەم بەندانە          کامەیان دژی هێزی ژیانە !
کامەیان بەشەر ئەباتەوە پاش          کامەیان دژە بۆ سەعی و تەلاش
کە ئەمەت زانی بزانە تانە          یا هی دوژمنە یا هی نەزانە
نە واتەی دوژمن نە واتەی نەزان          لای مەردی هوشیار ناخرێنە میزان

★ ★ ★

دوژمن تەفسیری وا ئەکاتەوە          کە دین پیاو لە ژین دوورئەخاتەوە
ئەگینا بەڕاست ئەم دینە ڕاسە          لە دواکەوتنی بەشەر هەراسە
دین قەت نایەوێ ئینسان نەزان بێ          دەرۆزەکەری بەر دەروازان بێ
نایەوێ سستی تەمەڵ و بێکار          بێپایە و مایەی چەرخی ڕۆژگار
دوورە لە گەلی گۆلی سەرسەرێ          گیرۆدەی هەوا و لە بەرزێ بەرێ
دین خاوەندەستی سەربەستی ئەوێ          خاوەنی هیوا و مەبەستی ئەوێ
یەکێکی ئەوێ وەك هەوری بەهار          گەوهەر هەڵڕێژێ لەسەر زەوی‌وزار
صیددیقی خۆ بێ و عومەرێ هەیبەت          عوثمانێ حەیا و حەیدەرێ هیممەت
ئەیێوبێ مەشرەب صەلاحەددین بێ          بەرەو ڕۆی دوژمن هێرش و قین بێ
خاوەن غیرەت بێ و کەرامەت کۆ کۆ          دڵی یەك تۆ بێ لەگەڵ من و تۆ

★ ★ ★

بەڵام فەرمانی خودا و پێغەمبەر          بێ فەرمانڕەوا چۆن ئەچێتە سەر
قورئان چی بکا لە تاقی مزگەوت          کابرا نایبینێ مەگەر بە هەڵکەوت
سوڵطەی تەشریعە قورئانی کەریم          تەنفیذی ئەوێ بە خودای عەظیم
چەند ساڵ لەمەکە فەخری ڕیسالەت          ئازاریان ئەدا ئەهلی جەهالەت
کە خودا بۆی‌کرد چو بۆ مەدینە          هێزی پەیداکرد لەوێ ئەم دینە
نەزانێ چۆن بۆ شەپۆلی ئایین          لە حیجازەوە گەیشتە لای چین
مەغریب و مەشریق پڕ بوو لە هەڵلا          بە ناوی خودا و بە ( الله الله )
دین بە بێ دەوڵەت ناگا بە ئەنجام          کەس بە بێ توانا ناگا بە مەرام
هەڵەیە جیایی بەدەوڵەت لەگەڵ دین          دەوڵەت بەشێکە لە مەعنای ئایین
ئایین کە یاسای پیرۆزی عامە          بە هێزی دڵسۆز مایەی مەرامە
لە خودامان ئەوێ هێزی یەکێتی          بێ بە دەوای سستی و نوشوستی
ئەوسا تێ‌ئەگەی بە فەیضی سامی          ئایین ئەبێتە شەجەرەی ( نامی )
بێخی لە ئەرزا و پۆپەی لەسەما          سێبەریش ئەکا بەسەر عالەما

# گوڵی سێ‌وچوارەم
# گوڵی سەبەب‌سازێ و پشت بە خوا بەستن

بـە بێ دوو شـاباڵ شـاباز نـافڕێ
بە بێ دوو پێی سـاغ ئینسان ناگەڕێ
بێ سـەبەب‌سازێ و بە بێ هێزی دڵ
ئینسـان بـە مەردێ ناگا بـە مەنزڵ

خوای تەعالا لە قورئانا فەرموویەتی :

**وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ .**

واتە : با ئەوانەی ئەیانەوێ پشت بە کەسـێ ببەستن ، پشـت بـە خوا ببەسـتن .

هەروەها پێغەمبەریش ، درودی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی :

**إذا أرادَ اللهُ شَيْئاً هَيَّأَ أسْبابَهُ .**

واتە : خوا کە شتێکی ویست هۆیەکانی جێ‌بەجێ ئەکا .

ئادەمیزاد کە لـە ڕوداوەکانی جیهـان ورد ئەبێتەوە بـاش تێ‌ئەگا کەوا هەرشتێ بەتایبەتێ هۆیەکی هەیە و پێویستە لەسەر ئینسان کە ویستی شتێ بکا هەوڵبدا بۆ بەجێ‌هێنانی هۆیەکانی . خوێندن دەرسی مامۆسـتای ئەوێ . پایەی بەرز لە دنیادا هەوڵ و تەقـالای پێویسـتە . باخدارێ و بێستان‌کارێ درەخت ناشتن و ئاودێرێ و پاسەوانێ ئەوێ . گەیشتن بە ماوا و مەنزڵ ڕێگە ڕۆیشتنی لازمە . زاڵبون بەسەر دوژمنا ئامادەیی بۆ گیان بەخت‌کردن ئەوێ . ئادەمیزاد بەپێی دەسـتوبرد و چـالاکی لە سەبەب‌سـازیدا هەندێکیان لـە هەندێکی‌تریان پێش‌ئەکەون . لە لایەکی‌کەشەوە تەماشا ئەکەین گەلێ‌کەس هەن لە سەبەب‌سازیدا زۆر چالاك و بێ‌باکن و گەلێ حەولی‌وا ئەدەن تـا زۆر نزیك ئەبنەوە لە مەبەستەکەیان . کەچێ لەولاوە بێ‌ئاگادارێ خۆیان شتێ پەیدا ئەبێ ئەو ئەسبابانە هەمـوویان تێك‌ئەدا و لەئەنجاما ڕزگارێ و بـە مـەرام گەیشتن بۆ کەسێکی‌تر ئەبێ . ئەمەیش ئەوە نیشان ئەدا کـەوا هەرچەند حـەولی ئینسان پەیوەندی بە مەبەستەوە هەیە ، بەڵام بەڕاستێ ئیش لای خوایە و خودا بەپێی ئەو یاسا کە لە عیلمی خۆیایەتی مەبەستەکەی یا خواسـتەکەی جێ‌بەجێ ئەکا وەکو فـەرموویەتی : « وَاللهُ غـالِبٌ عَلى أمْرِهِ ، ولكِنَّ أكْثَرَ النـاسِ لا يَعْلَمونَ » . واتە : خوا زاڵە بەسەر هەرشتێکا کە خواستی خۆی لەسەری بێ ، بەڵام گەلێ‌کەس بەمە نازانن .

کەواتە پێویستە ئینسان هەمیشە هەوڵبدا و سەبەبسازی بکا چونکە یاسای خوا لە جیهاندا وایە ، بەڵام پێویستیشە ئینسان بایێ نەبێ لە خۆی و هەر زۆری دڵی لە خودا بێ ، چونکە ئێمە نازانین ئاخۆ خوای تەعالا خواستی لەسەر خواستی ئێمەیە یا نە و ، بە بەراورد تێکەیشتوین کەوا هاتنەدێ ئاواتی دڵ بە بێ سەبەبسازی مەگەر بەدەگمەن ڕێبکەوێ .

پشت بە خوا بەستنیش مەعنای ئەوەیە لەگەڵ ئەوەشدا کەوا ئادەمیزاد ئەبێ بەپێی توانای خۆی تێبکۆشێ ، پێویستە باوەڕیشی وابێ کەوا بێجگە لەم ئەسبابانە کە ئێمە دەستیان پێوەئەگرین ، ئەسبابی‌تریش هەن کە وان لە عیلمی خوادا و ئەگەر خوا خواستی لەسەر ئیشەکەی ئێمە نەبێ چەند کۆسپ و گرێ ئەخاتەڕێی ئیشەکە . ئەگەر خواستیشی لەسەر ئیشەکەی ئێمە بێ گەلێ ئەسبابی‌وای بۆ ڕێکئەخا کە بە خەیاڵی ئێمەدا نەهاتوە .

لەسەر ئەساسی تێنەگەیشتن لە مەعنای قورئان و ئەخلاق و کردەوەی حەزرەت درودی خوای لێ بێ و ڕوداوی دنیا ، هەندێ‌کەس مەعنای پشت بە خوا بەستنیان وا لێکداوەتەوە کە ئینسان موبالاتێکی زۆر نەکا و هەرچۆنی بۆ هاتە پێشەوە ، بەئەندازەیەکی کەم نەبێ مەبەستی نەبێ و تەنها بەخوای خۆی پشت ببەستێ و هەر بەو پشت ئەستور بێ کەوا ئەو ئیشەکەی بۆ ئەکا . ئەم بیرە هەڵەیە . ڕاستە خوا تەوانایە و ئەتوانێ هەمو شتێ بکا و هێزی بەسەر هەمو مومکینێك و بەسەر هەمو کائیناتا زاڵە ، بەڵام خوا خۆی یاسای هەوڵ و تەقەلای داناوە و ئەمری کردوە بە سەعی‌کردن و هەوڵدان و تێکۆشان و ڕاوێژکردن و خۆڕاگرتن . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ کە گەورەترینی بەندەگانی خوا و گەورەترینی ئەوانەیە کە پشتیان بە خوا ئەستورە ، لە هەموکەس زیاتر حازر و ئامادە بوە بۆ ئیش‌کردن و هەوڵدان و فەرمویەتی : « اِلتَمِسُوا الرِّزقَ فِي خَبَايَا الاَرْضِ » واتە : بگەڕێن بۆ ڕۆزی لە بنی زەویدا . مەبەست لە گەڕان بۆ ڕۆزی لە بنی زەویدا کشت‌وکاڵ کردن و کان دۆزینەوە و دەرهێنانی ئاوە لە بنی ئەرزدا . فەرمویشیەتی : « طَلَبُ الكَسْبِ الحَلالِ فَرِيضَةٌ » واتە : گەڕان بەدوای کاسبی حەڵاڵدا فەرزە لەسەر هەمو موسوڵمانێك . هەروا فەرمویشیەتی : « بُورِكَ لاُمَّتِي فِي بُكُورِهَا » واتە : پیرۆزی و خێر دەس‌کەوتن و دەسکەوتی باش دانراوە بۆ ئوممەتی من لە حەولی بنەڕۆژانا ، یەعنی هەر لە سبەینێوە ئینسان ڕاست ببێتەوە و ئیشی خۆی ببینێ . هەروا فەرمویەتی : « اِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُؤمِنَ المُحتَرِفَ » واتە : خوا موسوڵمانی پیشەوەر و کاسبکاری خۆش‌ئەوێ . هەروا فەرمویەتی : « اِنَّ اللهَ يَكرَهُ الرَّجُلَ البَطَّالَ » واتە : خوا خۆشی لە پیاوی بێ‌کار و ئیش نەکەر نایەت . دیسانەوە فەرمویەتی : « الجالبُ مَرزوقٌ والمُحتَكِرُ مَلعُونٌ » . واتە : ئەوکەسانەی ڕۆزی ڕائەکێشن بۆ خۆیان و بۆ خەڵکی وڵات، خوا ڕۆزییان

ئەداتێ و ، ئەوانەش کە ئەیشارنەوە و نایفرۆشن بە خەڵك بۆئەوەی پاشان بـە گران بیفرۆشن بەر لەعنەتی خوا کەوتۆن . هەروەها فەرمۆیەتی : « اَلخَیلُ مَعقُودٌ بِنَواصیها الخَیرُ » واتە : خێر و ڕۆزێ بەسراوە بە ناوچاوی وڵاخـی بەرزەوە . فەرمۆیشیەتی : « سافِروا تَصِحّوا » واتە :سەفەر بکەن و بە وڵاتدا بگەڕێن لەشتان ساغ ئەبێ . مەبەستی لەوەیە هەواگۆڕین هۆی تەندروستییە و گەڕان بە وڵاتاندا و تێکەیشتن لە ئەوزاعی عالەم عەقڵ و هۆشتان لە نەخۆشێ و بێهۆشێ و لە کەم و کورتێ و ناڕەسایێ ڕزگار ئەکا . هەروەها فەرمۆیشیەتی : « اَلکَیِّسُ مَـنْ دانَ نَفسَـهُ ، وَعَمِلَ لِما بَعـدَ اَلمَوتِ ، والعاجِزُ مَنْ اَتبَعَ نَفسَـهُ هَواها وتَمَنّی عَلیَ اللهِ اَلاَمـانی » . واتە : ئینسـانی زیرەك ئەوکەسەیە کە زاڵ ببێ بەسەر نەفسی خۆیدا و ڕامی بکـا بۆ ڕێگەی پیرۆزێ و کردەوەی باش بکا بۆ کاتی پاش مردنی ، یـەعنی عیبادەتی خـوا بکا و خزمەتی داماوان و بێکەسان و بێدەستان بکا و بەگوێرەی توانای خێری نەبڕاوە بکا کە ئەمانە هەمۆ بۆ پاش مردن خێریان لێ ئـەبینێ . ئینسانی بێکـەڵك و هیچ لێ نەهاتۆیش ئەوەیە نەفسی خۆی بەرەڵڵا بکا بەشوێن ئارەزوەکانیا و بـە بێ هۆ داوای بەجێهێنانی دڵخواز بکا لە خوای تەعالا ، چونکە هەرچەند خوا ئەتوانێ بە بێکردەوە هەمۆ پایەیەك بدا بە ئینسـان ، بەڵام واناکا ، بەپێی کردەوە بەرهەم بە هەرکەس ئەدا . ئەمەش دادپەروەری ڕاستەقینەیە .

ئەم حـەدیث و فەرمۆدە بەرزانەی باسـمان کردن ، هەمۆ واتـەگەیەنن کەوا پێویستە ئینسـان بۆ ژین و دینی خۆی هەمیشە لە هەوڵ و تەقەلادا بێ و هەوڵەکەی ڕاساڵانە بێ و بە خۆپەرستێ نەبێ و سۆدی خۆی لە زیانی خەڵکدا داوا نەکا و قەت کاری ژین و دینی خۆی بەرەڵڵا نەکا تا ئەمرێ . هـەر لەسەر بناغەی سەبەبسازییە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی : « فِرَّ مِنَ اَلمَجذومِ فِرارَكَ مِنَ اَلاَسَدِ » واتە : هەڵبێ لە ئینسـانی گول وەك چۆن لە شێر هەڵدێی، چونکە هەرچەند نەخۆشێ بەدەستی خوا خۆیەتی و هەر خۆیشی شیفای دەرد ئەنێرێ ، بەڵام خوا خۆی هەندێ شتی کردوە بە هـۆ بۆ هەندێ شت و ، ئەبێ ئادەمیزاد ئەوەندی بۆیبکرێ خۆی بپارێزێ و پـارێز شـتێکی بەسۆدە وەکو مەشهۆرە کە ئەڵێن خۆپاراستن لە نەخۆشکەوتن بۆئەوەی ئینسان نەخۆشنەکەوێ گەلێ باشترە لەوە کە لەپاش نەخۆشکەوتن و تۆشبۆن تیمار و دەرمانی خۆی بکا و بەوجۆرە خۆی چاكبکاتەوە . هـەروەها مەشـهۆرە کەوا سەرەتای دوکتۆرێ خۆپاراستنە لە نەخۆشکەوتن ، یاخـود خۆپاراستن لـە نەخۆشکەوتـن باشـترین دوکتۆرێکـە . هەندێکـەس خوا لاشـەکەیوا دروستکردۆن لە نەخۆشیترەوە تۆشـێ نەخۆشـێ ئەبـن . بەڵام هەنـدێ ئادەمیزادیش هەن (مەناعە)یان هەیە واتە خۆیان ئەگرن و بە هاوڕێیەتێ نەخۆش نەخۆش نـاکەون . هەرچـۆن بێ لە هەمـۆ حـاڵێکدا بنیـادەم پـارێز بکا لە نزیككەوتنەوە لە نەخۆش و خۆی بپارێزێ ئەوە چاکترە .

ئەگەر ئەڵێیت پێغەمبەر درودی خـوای لێ بی فەرموێەتی : « لا عدوی فی الاسلام » واتە : دینی ئیسلام باوەڕی بەوە نیە کە کەسێك لە کەسێکی‌ترەوە توشی نەخۆشیێ ئەبێ ، ئەی ئەمە چۆنە ؟ لە وەڵامدا ئەڵێین : زانـایانی حەدیث فەرموێانە ئەم حەدیثە بۆ وەڵام دانەوەی ئەوکەسانە وتراوە کـە باوەڕیان وابوە بێ‌گومان بنیادەم لە نەخۆشەوە نەخۆشێ وەرئەگرێ و توش‌ئەبێ و ئەمە هەمیشە وایە . جا پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموێەتی وا نیە ، ساغێ و ناساغێ بە ئیرادەی خوایە ، ئەگەر ویستی هەندێ‌کەس لە هەندێ کەسـی‌ترەوە توشی نەخۆشێ ئەبن و ئەگەر نەشیویست ئەوە هیچ ، چونکە بە بـەراورد دەرکەوتوە وەك چۆن هەندێ‌کەس لە هەندێ‌کەسی‌ترەوە توشی نەخۆشێ بوون ، هەندێ کەسی‌تریش بووە ماوەیەکی دوّر و درێـژ لەگەڵ نەخۆشـدا ژیاون و لەگـەڵ ئەوەشدا توشی نەخۆشێ نەبوون لێیانەوە . کەواتە پارێزکردن چاکە و پێویستە بەڵام باوەڕ بەوە کە بێ‌گومان هەمیشە نەخۆشێ لە یەکێکەوە ئەچێ بۆ یەکێکی‌تر ئەوەیش هەڵەیە .

ئەگێڕنەوە کەوا خەلیفەی دوهەم عومەری کوڕی خەططاب خوای لێ ڕازێ بێ لەو سەفەرەیدا کە بۆ شام ئەچوّ بیستی نەخۆشێ تاعون لە شام داکەوتوە . ئەویش ڕاوێژی‌کرد بە هاوڕێکانی کەوا چێ‌بکەن باشە و لەم‌بارەوە پێغەمبەر چێ فەرموە ؟ یەکێ لە هاوڕێکانی وتی لە پێغەمبەرم بیستوە فەرموێەتی کە بیستتان تاعون لە وڵاتێکا داکەوتوە و ئێوە لەوکاتەدا لـەو وڵاتەدا بـوّن لێی دەرمەچن و ئەگەر لە وڵاتێکی‌تر بوّن مەچن بۆ ئەو وڵاتە . حەزرەتی عومەر بـەم فەرموّدەی پێغەمبەرە زۆر شادمان بۆ و بڕیـاری‌دا بگەڕێتەوە بـۆ مەدینەی مونەووەرە . ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕراح پرسی : عومەر ! ئەوە لە قەزا و قەدەری خـوا ڕائەکەی ؟ حەزرەتی عومەریش وەڵامی دایەوە وتی : خۆزگـە ، ئەبوعوبەیدە ، یەکێکی‌تر ئەم قسەیەی توی بکردایە . سەیرە،بۆچی ئەگەر لەم قەزایە دەربچین، لە قەزا و قەدەری‌تری خوا ڕزگار ئەبین ؟ ئێمە هەمیشـە لەژێر قەزای خوادایـن و ڕاکردن لە قەزاوقەدەر مومکین نیە ، بەڵام ئەمە ڕێ و شـوێنێکە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ بۆی داناوین بۆ پارێزکردن بەپێی دەسەڵات و دەست ڕۆیشتن .

لەم فەرموّدەی حەزرەتی عومەرەوە گەلێ ڕاسـتێ دەرئەکەوێ ، یەعنی هەرچەند ئەوەی لە زانستی خوادا ڕابوردبێ پێویستە وابێ ، بەڵام ئێمـە بەو عیلمی خودایە نازانین و مادەم کە عەقڵ و هۆشمان هەیە و سوّد و زیان لەیەك جوێ ئەکەینەوە و فەرقی ژار ئەخەین لە خواردەمەنێ باش ، پێویسـتی عەقڵە کە لە ژارەکە لادەین و خواردەمەنییە باشەکە بخۆین ، ئەگەرچێ بە خواردنی ئەم خواردەمەنییە باشەیش بمرین .

بۆ ڕوّن‌کردنەوەی ئەم باسە بە پێویستی ئەزانـین بڵێین خـوای تەعالا ئەم عالەمەی دروست‌کردوە و هەر ئیشێکی بەستوە بە هۆیەکی تایبەتییەوە و ئەمەی

کردوه بە قانونی جیهان . هەندێ شت هۆیە بۆ هوشیاریێ ، یا تەندروستیێ ، یا دارایێ ، یا شان و پایە ، یا دڵ ڕوناکیێ و هەندێ شتیش بەپێچەوانەی ئەمەوە .

ئەم قانونە لای هوشیاران شتێکی ئاشکرا و دیارییە و لادان لێی نەفامیێ و گومڕاهییە . ( بناء علیه ) ئەوکەسەی ئەیەوێ تەندروستیێ هەبێ ئەبێ خواردن و هاتوچۆ و بیرکردنــەوە و حەســانەوەی لــەگەڵ مەبەستەکەیدا بگونجێ . لای هەمومان ئاشکرا و دیارییە کەوا نابێ لەم سنورە لابدەین . ئیتر ئاگامان لەوە نیە کە عیلمی خوا چۆن ڕابوردوە و لەوکاتەدا کە ئێمە تەندروستیێ خۆمان ڕائەگرین ئەو مارێ ئەنێرێ بدا پێمانەوە یا کابرایەکی زۆردار ئەنێرێبمانکوژێ ، یــاخود ئێمە خۆمان بەدەسەنقەست یا بە هەڵە زەهرێك ئەخۆینەوە و ئــەو دوکتۆرێك ئەگەیەنێتە فریا و لە مردن ڕزگارمان ئەکا . .

بڕۆینەوە بۆ بابەتی قەزا و قەدەر . مەشهورە قەزا و قەدەری موعەللەق هەیە کە بەسراوە بە هەندێ ئەسبابەوە و ، قەزا و قەدەری موبرەمیش هەیە کــە قەطعییە و گۆڕانی نیە . لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی عیلمی شاملی خوا ، ئەوەی لــە عیلمیا ڕابوردوە ببێ ، ئەبێ ببێ و ئەوەی ڕابوردوە نەبێ ، ئەبێ نــەبێ . کەواتە مەعنای موعەللەق چیە ؟

ڕاستیێ ئەم مەسئەلەیە ئەوەیە کەوا لە عیلمی خوادا تەردید و دوودڵیێ و ئەبێ و نابێ نیە . بەڵکو مەسئەلە بڕاوەتەوە وەك ئەڵێن ( جَفَّ الْقَلَمُ ) . بەڵام ئەوەی لە عیلمی خوادا ڕابوردوە کەوا ئەبێ ، لــە عیلمیشــیدا ڕابوردوە کەوا سەبەبەکەی بەهۆی کەسێکەوە دێتەجێ . ئەوەش کە لە عیلمی خوادا ڕابوردوە نابێ ، هەروا لە عیلمیشیا ڕابوردوە کە سەبەبەکەی نایەتەجێ . نیظامی بون و نەبونیش بۆ ئێمەی دەرخستوە . کەواتە ئەنجام کە بون یا نەبونی موسەببەکەیە ، بە خەریكبون یا خەریكنەبونی ئێمە بە سەبەبەوە دەرئەکەوێ . قەزا و قەدەری موعەللەق لە بابەتی شتی عادەتییە و مەحوکردنەوە یا هێشتنەوەشی لە بابەتی هۆ ڕێکخستن یا هۆ ڕێكنەخستنە ، نەك لە بابەتی گۆڕانی عیلمی خودا ، چونکە عیلم بە قەطعیێ ناگۆڕێ و گۆڕانی مەحاڵە .

هەندێ لە زانایان وتویانە ئــەوەی قەزاوقەدەری موعەللەق بێ لــە ( لوح المحفوظ )دا نوسراوە و هەر ئەمجۆرەیە کە بە دوعا و پاڕانەوە یا بە صەدەقە و خێرات یا بە دوکتور و دەرمان یا بە پەنابردنە بەر پیاوی خاوەن شان جێبەجێ ئەبێ . جا خواناسەکان خوا ئاگاداریان ئەکــا کەوا ئــەم قەزایــە بەسراوە بــە دوعایەکەوە یا بە دوکتۆرێکەوە و لەسەر ئەو ئەساسە هەوڵئەدرێ و هۆیەکەی جێبەجێ ئەکرێ و لە عەینی حاڵدا لای خوا مەعلومە کە هۆیەکــەی دێتەجێ ، بۆیە ئەو شتە ئەبێ .

بەکورتی پێویستە ئەم مەتلەبانە بزانرێن : یەکەم : خودای تەعالا نیظامێکی داناوە پێویستە کەوا ئینسان لەسەر بناغەی ئەو نیظامە بجوڵێتەوە . دوهەم : ئێمە ئاگامان لە عیلمی خوا نیە ، بەس بەسراوین بە نیظامەوە و لەسەر نیظام ئەڕۆین . سێهەم : هەرچی لە عیلمی خوادا ڕابوردوە هەروا ئەبێ . بەلام ئەمانە ئەغلەب وایە بەسراون بەو ئەسبابانەوە کە ئێمە ئەیانکەین و ئەنجام ئەوەیە بەپێی عیلمی خوا هەمو شتێ بڕاوەتەوە .

وتمان سەبەب سازی و پشت بەخوا بەستن پێویستی ژین و دینی ئینسانە . سەبەب سازی و پشت بە میهرەبانی خوا بەستن ، واتە هو ڕێکخستن بۆ ئەو ئیشەی کە مەبەستمانە و لە هەمان کاتیشدا دڵ ئەستوری بە یارمەتی خوای تەعالا ، هەم واجبی ئایینی و هەم پێویستی ژیانیشە . ئەگەر بە جارێ یا دو جاریش ئەو مەبەستەمان بۆ جێبەجێ نەبو ، مادەم مەبەستەکە مەبەستێکی وا بێ ڕێی عەقلی تێبچێ ، پێویستە لێی سارد نەبینەوە و تێبکۆشین بەلکو ئەمڕۆ بێ یا سبەینێ بێ جێبەجێ ببێ بۆمان . ئێمە تەماشا ئەکەین مێروله بەو زەعیفی و بێدەسەلاتییەوە کە هەیە شتێ وا هەڵئەگرێ لە خۆی گەورەترە . چەند جار ئەو شتەی لێ ئەکەوێ و تلئەبێتەوە و خۆیشی لەگەڵیدا تلئەبێتەوە ، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو هەر دەست بەردار نابێ تا بە هەر جۆرێ بێ ئەیگەیەنێتە شارەکەی خۆی .

ئەوەندە پێویستە ئەو ئیشە لەوانە نەبێ بەپێی یاسای عادەت مەحاڵ بێ یا نزیك لە مەحاڵ بێ ، چونکە خۆماندوکردن بە شتێکی‌واوە کە بە عەقل دیار بێ مەحالە ، کاری ئینسانی فامیدە نیە . ئەبێ کە دەستیشمان کرد بە هەوڵدان بۆ شتێ لەو ڕێگاوە بڕۆین کە بەئاسانی بمانگەیەنێتە مەبەستەکەمان . خوای گەورە فەرمویەتی : « واتوا البیوت من ابوابها » واتە : لە دەرگاوە بچنە ماڵەوە . مەبەستی لەوەیە هەرشتێ ئوسوڵ و نیظامێکی هەیە و ئینسان کە ویستی شتێ بکا ئەبێ بەپێی یاسای تایبەتی ئەو شتە خۆی بیکا . نە لە زەوی شۆردا تۆو ئەوەشێنرێ و نە لە دێمە خاکا مەرەزە ئەکرێ .

لە جوملەی بە ڕێی ئیشەوە چونە بە ئوسوڵی عادەتی ئەمە کە ئەگەر ئینسان کەوتە ڕۆژێکەوە حەق لەو ڕۆژەدا گوم بوبو و یارمەتیدەری حەق کەم بو ، ئینسان بێواسیطە بۆ لای گەورەی وەخت ڕونەکاتە بارەگای ئەو گەورەیە ، چونکە ئەو جۆرە پیاوە گەورانە وەك شێر وان و خزمەتکارەکانیان وەك شێرەوان و دیارە شێرەوانیش ئەزانێ چۆن خواردەمەنی ئەدا بە شێر . هەروا ئینسانی غەریب و ناشارەزا لە شار و بازاڕدا مامەڵە نەکا مەگەر کابرایەکی چاوکراوە بێ یا چاوکراوەیەکی لەگەڵدا بێ . هەروا کەسێك مەسەلا بیەوێ ژنێ بێنێ ، تا چەند هاودەمێك لەگەڵ خۆی نەبا نەچێ بۆ داوا کردنی . ئەگەر ئەشتزانێ

هەندێ کەس بەهۆی دیاری بۆ بردنەوە نەبێ تەفاهومیان لەگەڵ ناکرێ ، بێ دیاری نەچێ بۆلایان . بەڵام ئەمە بۆ کاتێکە کەوا مەبەستەکەت حەڵاڵ بێ و بە شەرع ڕەوا بێ بۆئەوەی دیارییەکەت نەبێ بە بەرتیل و نەبێ بە تاوان بۆ تۆیش و بۆ ئەوانیش .

بەمبۆنەیەوە لە جێی خۆیایەتی بڵێین کەوا دیاریبردن یەکێکە لە هۆیەکانی زیادبوونی دۆستێ لەنێوان برادەرانا . بۆیەش پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموویەتی : « تَهادَوا تَحابُّوا » واتە : دیاری بۆ یەکتری بەرن بۆئەوە خۆشەویستی لەنێوانتاندا زیاد بکات . بۆیە سوننەتیشە کە ئینسان لە سەفەرێک گەڕایەوە ئەوەندەی پێیبکرێ دیاری لەگەڵ خۆی بێنێ بۆ ماڵ و منالەکانی تا دڵیان خۆش بێ .

ڕۆڵەی عەزیزی دڵ هوشیارەکەم ! گوڵی بۆنخۆشی ناو گوڵزارەکەم !
دوو باڵی ئەوێ ئینسانی بزان یەکێ ئاشکرا و یەکێکی پەنهان
یەکەم ئەسبابە و وەسیلەی عادێ پێویستە بۆ تۆ بە ئیعتیادێ
دووەم باڵێکە شێوە مەعنەوێ پشتبەستن بە خوای عەزیز و قەوێ
هەردوو مەطلوبن بە نەصصی کیتاب بۆ پەیوەندانی ئەشیا بە ئەسباب
یەکەم لەپێشا حازر بەدەستە ئەمەیش بەگوێرەی هێزی مەبەستە
خُذوا الاشیاءَ باسبابِها واتوا البُیوتَ مِنْ ابوابِها

★ ★ ★

کاتێ ئیشێکت کەوتە لای گەورە مەعلومە گەورەیش بەگوێرەی دەورە
کەسێ نزیکە بەو بارەگایە پێویستە بۆ تۆ بێتە سەرکایە
ئەوەی بە ساڵێ بۆ تۆ ناکرێ بەو بە سەعاتێ جێبەجێ ئەکرێ
یا بە لەحظەیێ وەک بەرقی بەصەر جێبەجێ ئەبێ بە بێ دەردی سەر
نەکەی بە بێکەس بچیتە دەربار تەوقیفت ئەکەن سەرەڕای ئازار
هەروا دەست و پێ لەبۆ خانەدان وەکو کلیلن بۆ قوفڵی یەغدان
ئەوەی ئەیەوێ گەورە بیەوێ لەگەڵ ئاشنای ئەبێ ڕێکەوێ

★ ★ ★

بۆ ئەم ئیشانە بردنی دیاری وەک دەرمان وایە بۆ دەردی کاری
بەڵام وریا بە نەبێ بە بەرتیل حەڵاڵ حەرامکا و حەرامیش تەحلیل
هەروەها دیاری هۆیە بۆ ئولفەت بۆ جەلبی ڕەضا و بۆ دەفعی کولفەت
ئەتەوێ ببێ بە ئەمۆستیلە بۆ پەنجەی برا و دۆست و قەبیلە
هەرکەس بەقەد خۆی نرخی بزانە خامە ، ئاوریشمە ، چیتە ، کەتانە
ئەمانە هەمو دیاری دەمن وەها ڕەفیقان زۆر خاتر جەمن

که چۆی بۆ دیدەن بێجگـە لەمـانە ... بـا دیاریت پـێ بێ خۆشـی دڵیـانە
دیـاریَ ئولفەتە بـۆ مـاڵ و منداڵ ... لە خواردەمەنـیَ بەپێی وادەی سـاڵ
لە زۆر و لە کـەم لە تـۆخ و لە کاڵ ... یا توزیَ نوقـوڵ بـۆ دەستی منـاڵ
بـە مشـتیَ مێوژ مـاڵی ساڵی نـۆ ... منـاڵان ئەبـن بـە پەروانـەی تـۆ
کە لە سـەفەریَ چوێتەوە بۆ مـاڵ ... دیاریَ هەڵبگرە بـۆ مـاڵ و منـاڵ
وەهایـە دەرسە بەرزەکەی حەزرەت ... بـۆ دامەزرانی بینـای مەحـەبـەت
حەلوایێـکی دەم یـا ماڵێکـی کـەم ... چاترە لە صەد هاشە و هۆشەی دەم

★ ★ ★

زیـاتر لەمـانە پێویسـتە ئینسـان ... پشتی ببەسـتیَ بـە ذاتی یـەزدان
تەوەککول هێـزی دڵ و ئـەژنۆیـە ... وەك پشـتیوانی ئەسـتوری تۆیـە
بەلام حالیَ بـە ئەی نـوری چـاوم ... ڕۆنـاکیَ دڵ و هێـزی هـەناوم
تەوککول نـەکەی بـە هۆ بۆ زیـان ... بیکـەی بـە باری ناباری سـەرشان
بـەتاڵ داکەویَ بـە خەیاڵی خـاو ... بیَ بـە تانـەی تاریـکیَ سـەرچاو
بە مەحضی هـەوا و داوای تەوەککول ... ببـیَ بـە داری بێبـەر و تۆکـڵ
تەوەککول وایـە بـە ئەمری ئایـین ... پاش تێکۆشـین بێ لەبۆ ژین و دیـن
ئـەوەی کـە خـودا داوای کـردوە ... لـە بیروبـاوەڕ یـا لـە کـردەوە
بە ئەندازەی خـۆی بۆی تێبکۆشـیَ ... بە صەبر و ئارام بە شەوق و خۆشیَ
تـەوەککولیشت بـە خـودا وابـێ ... کە بێ خواستی ئەو هیچ شتیَ نابیَ
هەرگیز دەرمەچن لە ڕێی عەقلی ورد ... دین لـەگەڵ عەقلە لەسـەر بەراورد
وەهای فەرمووە مـەولەویَ سەربەرز ... خاوەنی شیعر و ئەدەبی صەد تـەرز
حەرەکـەت کـە بۆ بەرەکـەت دێنیَ ... بەرکـەت دیسـان حەرەکەت دێنیَ
بەلام بە هێزی خـۆت مەغرور نەبیَ ... لـە ئیعتیمـادی خـودا دوور نـەبیَ
خودا موشـکیلەت بـۆ ئاسان ئـەکا ... بـۆ ڕێگەی ڕاسـتت پاڵەوان ئـەکا
هێزی وەسیلەی وات ئـەخاتە پـاڵ ... هەرگیز نەتدیـوە بـە خەو یا خەیاڵ
ئەو بۆتئەنێریَ شوعور و ئیـدراك ... بارمەتیت ئەدا بـۆ کردەوەی چـاك
ئەمەیە دەرسی ( نـامیَ ) لەم باسـە ... بۆ پیر و بۆ جوان باسـێکی خاسـە

## گوڵی سیَوپێنجەم ـ گوڵی ئیقتیصاد (میانەکاریَ)

ئەگـەر طالیبی بـۆ بەختیـاریَ
بـژیَ بـە شـێوەی میانـەکاریَ
نە دەسبەگـەردن ، نە بلاویَوا
کیسەکەت بدڕیَ بە هێزی هەوا

خوای تەعالا فەرموویەتی :

وَلا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلى عُنُقِكَ وَلاتَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ ، فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَحْسُوراً

واتە : نە دەستت بگرەوە لـە پارە خەرجکردن وەك دەسـتی شـکاو کە کرابێتە مل و ، نە بەتەواویش بیکەرەوە ، تا بە لۆمەکراوێ و داخ بۆ خوراوێ دانیشی .

میانەکاری یاخـود دەست پێوە گرتـن شتێکی زۆر بەسوودە بـۆ ژیانی ئادەمیزاد چ تـاك و چ کۆمـەڵ . ئیقتیصـادی ڕێكوپێك ئینسـانی وریـا و تێگەیشتوی ئەوێ و تا ڕۆەکانی مەسرەف کردن گوشادتر بن ئەرکەکە گرانتر و قورستر ئەبێ و بۆیەشـە دەوڵەتانی جیهـان بـۆ کاروباری مەسـرەف کردن وەزارەتی ئیقتیصـاد دائەنێن . بەر لە هەرچێ لە مەسـرەف کردندا دوو شت پێویستە . یەکـەم ئەوە کە خەرج بەگوێـرەی داهات بێ . دوهـەم ئینسانی مەسرەفکەر دەست وا بکاتەوە تەماشـای هاوشانی خۆی بکا و بۆ بەرزتر لە خۆی نەڕوانێ . هەرکەس خاوەن ئیقتیصـاد و دەست پێوەگرتو بێ شان و حورمەتی ئەپارێزرێ و لەناو خێزانی خۆیشیا بە ئوسوڵێکیوا ئەڕوا بەڕێوە کە بتوانن بە خۆشێ بژین . لەسەر ئەم ئەساسەیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « الاقتِصادُ نِصفُ المَعيشَةِ » . واتە : میانەکاری نیوەی گوزەرانە . مەبەستی ئەوەیە ئەوەی میانەکار و دەست پێوەگرتو بێ بەشێ لە خەرجی بۆ ئەگەڕێتەوە و ڕێناکـەوێ . هەروەها فەرمویەتی : « لا عالَ مَنِ اقتَصَدَ » واتە : ئەوەی دەست پێوە بگرێ لات ناکەوێ .

دەست پێـوەگرتن لە هەمو شـتێکا پێویستە . بەتایبەتی یەکـەم : لە خۆماندوکردنا بـۆ ئیشوکار ، چونـکە ئەگەر ئینسان زیاد بـڕوا بـڕوا دەوامناکا و نەخۆشئەکەوێ . مەسەلەیەکی مەشهورە : مۆم لە هەردو سەرەوە داناگیرسێ . دوهەم : لە طاعەت و عیبادەتدا . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « سَدِّدوا وَقارِبوا » واتە : عیبـادەت بـە باشێ جێبەجێ بکەن و خۆتـان نزیكبکەنەوە لـە تەواو کردنی ، بەومەعنا کە ئێوە ناتوانن هەمـو صیفاتەکانی عیبادەت بەجێبێنن ، بەڵام ئەتوانن نزیكبینەوە لە پایەی ڕەسـایێ . هەروەها فەرمویەتی «اِنَّ الدّينَ يُسْرٌ وَلَنْ يُشادَّ اَحَدٌ هذا الدّينَ اِلاّ غَلَبَهُ » واتە : ئایین پەرستێ لەسەر ئاسانێ دامەزراوە و خودا داوای پایەیگرانی تیادا نەکردوە . کەواتە ئێوەیش لەسەر میانەکاری بڕۆن چونکە قەت ڕێناکەوێ یەکێ بەرابەرکێ لەگەڵ دیندا بکا و بیەوێ هەمو نەوعێکی جێبەجێ بکا و هەرکەس بیەوێ شتیوا بکا لەئەنجامدا پەکیئەکەوێ و دەرەقەت نایەت و دین بەسەریا زاڵ ئەبێ .

هەروەها زیـادەڕەوێ لـە مەدح و تەعریفکردنی پێشەوایانی دینیشدا ئەکێشێتەوە بۆ بیروباوەڕی ناڕەوا و ناپەسەند وەکو حەزرەت سەلامی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « لاتُطْرُونِي كَما اَطْـرَتِ النَّصارى في نَبِيِّهِمْ » واتە :

زیادەڕەوی مەکەن لە باسکردنی پایە و شانی منا وەکو گاورەکان زیادەڕەویان کرد لە شانی پێغەمبەرەکەیاندا کە حەزرەتی عیسایە و بڕیاریاندا کەوا ـ پەنا بەخودا ـ حەزرەتی عیسا کوڕی خوایە . کەواتە زۆر پێویستە ئینسان لە شانی هەر پیاوێکی ڕۆحانی و پایەبلنددا میانەکار بێ و زیادەڕەوی نەکا تا نەکێشێتەوە بۆ بیروباوەڕی خراپ و ناڕەوا بەتایبەتی کە عەوام و ڕەشەخەڵک بەمهۆیەوە زۆریان سەریان لێشێواوە .

هەرچی کە ئینسان زیادەڕەوی تیا بکا وەك دوین و نوستن و خواردن و ئامۆژگاری کردنی خەڵك ، ئەنجامەکەی خراپ ئەبێ ، بەتایبەتی پێویستە ئامۆژگاری لە هەلا بێ و ئینسان ئەوەندە بدوێ کە گوێگرەکان ماندوو نەکا ، ئەگینا ئەبێ بە گوناە بەئەستۆیەوە . هەروا لە صەدەقەیشدا میانەکاری پێویستە . ئەگێڕنەوە سەعدی کوڕی مەعاذ خوای لێ ڕازی بێ ویستی وەصیەت بکا بە ماڵێکی زۆر بۆ خێر و خێرات ، بەڵام حەزرەت ڕێگای نەدا و فەرمۆی ئەگەر دارایی بەجێبێڵی بۆ منالەکانت بەڕەسایی و خۆشی بژین چاکرە لەوە کە داوای شت لە خەڵك بکەن ، واتە با خێراتەکەت ئەوەندە بێ بەشی منالەکانیشت بە ڕەسایی بمێنێتەوە .

بچینەوە سەر مەسەلەی دەست پێوەگرتن و میانەکاری لە ماڵ و دارایی ئینسان خۆیدا .

وەك وتمان دەست پێوەگرتن بۆ ئینسان زۆر پێویست و بەسوودە ، چونکە ئینسان بە ئارەزووبازی تێر نابێ و کاتێ عادەتی گرت بە مەصرەفی زۆرەوە ئیتر دەستبەردار نابێ و تا بڕوا بە دەمی نەفسیەوە نەفسی سەرکێشتر ئەبێ . کەواتە پێویستە ئینسان دڵخوازی خۆی بکا بە دوو بەشەوە ، بەشێکی بداتێ و بەشەکەی تری ڕابگرێ بۆ ڕۆژی تەنگانە . ئەم شێوە وەك سوودی هەیە لە مانەوەی ماڵەکەیدا ، سوودێکی تریشی هەیە کە خۆی و ئەفرادی عائیلەکەی خۆ بە ئیقتیصادکردن و دەست پێوەگرتنەوە ئەگرن و هەڵپەیان کەم ئەبێتەوە و لە ڕۆژی ڕەشدا بەئاسانی ئەژین . سوودی دووەمی دەستپێوەگرتن ئەوەیە ئەوکەسەی دەست پێوەبگرێ قەدری نان و نیعمەتی لائەمێنێ و قابیلە لەسەر نیعمەت سوپاسی خوا بکا ، بەڵام ئەوانەی بە ئارەزووبازی ڕائەبوێرن نەفسیان ڕۆژئەکاتە سەرکێشی و سوپاسی نیعمەت فەرامۆش‌ئەکەن .

دەست پێوەگرتن وەك بۆ گەدا پێویستە ، بۆ دارا و خوا پێداویش هەروایە بە چەند دەلیل . یەکەم : بەراورد کراوە کەوا قەت ئارەزووی نەفس تەواو نابێ و گومانی تێرکردنی نەفس بە شت پێدانی زۆر وەکو گومانی ڕاوەستانی خوێنی دەماری زامارە بەوە کە زامەکەی گەورەتر بکرێ ، هەروەك ئەوە مومکین نیە ، هەروا بەعادەت مومکین نیە نەفسی ئینسان بەهۆی

ئارەزۆبازییەوە تێر ببێ . دۆهەم : کاتێ نەفس ڕاهات بە ڕابواردنەوە حاڵیوای لێدێ ژیانی لێ تاڵ ئەبێ و بەهۆی ئەوەوە کە شتێك لە دڵخوازەکانی نەهاتە بەردەست ، نەفسی ئەتۆرێ و ئەبێ بەهۆی زویرکردنی خێزان و هاوڕێ و ماڵ و منالی خۆی . سێهەم : هەرکاتێ شتێ لەوانەی کە داوای کردۆن حازر نەبۆ دەستئەکا بە ناسوپاسێ و بەپێی بەراورد هەرکەسێ یا هەر کۆمەڵێ دەستیان کرد بە ناسوپاسێ نانیان ئەبڕێ و ئەو نیعمەتەیان نامێنێ . چوارەم : ئەو خێزانەی فێری ئارەزۆبازێ بوبێ لەکاتی لێقەومانا ناژێ و دنیای لێ تاریك دادێ تا مەحو ئەبێتەوە . لەسەر ئەم ئەساسەیە پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی : « إِخْشَوْشِنُوا فَإِنَّ التَّرَفَ يُزِيلُ النِّعَمَ » واتە : فێری ژیانی زبر ببن ، چونکە ڕابواردنی بێئەندازە خۆشێ لە نیعمەت هەڵئەگرێ ، چونکە نرخی خواردەمەنێ خۆشتان لا ناهێڵێ و نیعمەتەکەتان لا بێقەدر ئەکا و خوایش لەبەر ناسوپاسێ و کوفری نیعمەت نانەکەتان ئەبڕێ .

ڕۆڵەی هوشیارم دنیا دەریایە     هەزاران ماری مەینەتی تیایە
ماوەی ژینی تۆ گەلێ ئەگۆڕێ     بە خۆش و ناخۆش زۆر هەڵئەسۆڕێ
نیوەی ڕۆناکە و نیوەی تاریکە     ڕێی شەو پانیش بێ هێشتا باریکە
گەردۆن لە چەرخا گەلێ چالاکە     تاوێ تاریکە و تاوێ ڕۆناکە
لە ڕۆناکیدا فەرزە هەوڵ و دەو     لەبۆ فانۆزێ هەڵیکەی بە شەو
چۆن ئەبێ پایز وێنەی سەرمەستان     فەرامۆش بکەی ئاڵۆزێ زستان
ئەوەی غەمنەخوا بۆ ژینی سبەی     بە دانی حەسرەت ئەگەزێ پەنجەی

★ ★ ★

ژیان وەکو ڕێی سەفەری دۆرە     خەرجێ لەبۆ ڕێ حەتمێ و زەرۆرە
خۆت بایێمەکە بەهۆی خزم‌و خوێش     تا لە داخی خوێش نەبێ بە دەرویش
ئەو نانەی ئەمڕۆ کەوا لەناو تەشت     پێویستتە سبەی کەئەڕۆی بۆ دەشت
ئەو پارەی ئیمڕۆ لە کیسەدایە     هەندێکی لادە ، ڕۆژیکەش دایە
پارەی سپێ تۆ لەبۆ ڕۆژی ڕەش     وەك خوێن وەهایە بۆ دەماری لەش
بە چێشتێ ئەمڕۆ سکت نەیەشێ     سبەی لەبرسا سکت نایەشێ
ڕۆژی قاتەساڵ نەفسی نەفسییە     هەرکەس ئەڕوانێ وەك تۆ برسییە
ئاگات لە خۆت بێ لەکاتی خۆشێ     دەرمان هەڵبگرە لەبۆ نەخۆشێ

★ ★ ★

پانایێ دنیا هەر تەپ و تۆزە     بۆ هەرکوێ ئەڕۆی هەر شەڕە هۆزە
لەکاتی غەوغا ببێ بە میوان     کێ بێ تۆ ببا بۆ ژۆری دیوان
بەکوردێ ژیان وێنەی ڕەزمگا     پڕە لە هەڵلا و ئاشوب و هەرا

ئادەم بە بێ چەك دوورە لە ویژدان هەستێ دەربەڕێ و بڕواتە مەیدان
چەك بۆ ئەم ڕەزمە لەسەر سێ بەشە عیلم و ئەخلاق و پارەی بێغەشە
هەر بە ئیقتیصاد پارە جەم ئەبێ بۆ ئەو ڕۆژانەی توانات کەم ئەبێ

★ ★ ★

فەت مەڵێ گەدا پارەی لەکوێیە دەعوای ئیقتیصاد لەلات بێجێیە
ڕۆژی وا هەیە ئەوەندە تاڵە گەدایێ پێشوی لە لا ئیقبالە
دەی با لەو ڕۆژا پوڵێ هەڵبگرێ تا لەم زەمانا کەلکێکی بگرێ
گرام لە دەنکە و کیلۆ لە گرام لە کیلۆیشەوە تۆن دێتە ئەنجام
پەندم بۆ تۆیە ئەی برای سامێ باشە گوێ بگری لە دەرزی ( نامێ )

## گوڵی سێوشەشەم ـ گوڵی قەناعەت

هەرکەس بەکەمی خۆی ئەساچێنێ
سەری بۆ پاشا دانانەوێنێ
گەدا پاشایە کاتی ئازادێ
چونکە لەبۆ شا خۆی ناشکێنێ

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرمویەتی :

**لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ ، وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللهُ .**

واتە : ئەوانەی ڕزق و ڕۆزیان گوشادە با بەپێی ئەو ڕزق و ڕۆزیە گوشادەیان مەسرەف بکەن بۆ خێزانیان . ئەوانەش ڕۆزیان کەم و کورت کراوە با لەوە خەرج بکەن کە خوای تەعالا پێیداون .

پێغەمبەریش ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی :

**القَنَاعَةُ كَنْزٌ لايَفْنَى .**

واتە : ساچاندن بەو ئەندازە ڕۆزییەی خوا داویە ، گەنجینەیەکە هەرگیز نابڕێتەوە . مەبەستی لەوەیە وەك چۆن کەسێ گەنجێکی ببێ ئەوەندە زۆر بێ هەرچەند لێی بخوا هەر نەبڕێتەوە ، ئەوەش کە قەناعەت ئەکا بەو کەمەی خوا داویەتێ و ئەساچێنێ پێی ، ئەو ساچاندنەی بۆ ئەبێ بە گەنجی نەبڕاوە و هەتا هەتایە دەست لە کەس پان ناکاتەوە .

بەڕاستێ قەناعەت ڕەوشتێکی بەنرخە و ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئەوکەسە بە ئاسایشی دڵ و بە قەدر و حورمەتەوە ڕابوێرێ . بۆ ڕونکردنەوەی پایەی

بەرزی قەناعەت چەند قسەیەك پێویستە بکەین . یەکەم : ئەوەیە ئادەمیزاد ئاسایشی نابێ تا دڵی دانەمەزرێ و نەحەسێتەوە . دڵی ئینسانیش لەکاتێکا دائەمەزرێ کە بە بەشی خۆی بساچێنێ و هەڵپە و تەماعی زۆری نەبێ. دۆهەم : خاوەن قەناعەت لە هەمو چەرخێکا ئەژێ ، چونکە خۆی گرتوە بەوەوە کە بە کەم بساچێنێ و بەو ڕۆزییەی کە هەیەتی قەناعەت بکا . سێهەم : ئینسانی قانیع لەبەرئەوە کە چاوی لە دارایی زۆرەوە نیە مەجبوری ماستاوکردن و درۆ و دەلەسەکردن نابێ بۆ کەس و خۆی ناهاوێتە ناو کاری ناپەسەندەوە و حورمەتی وەکو خۆی بۆ ئەپارێزرێ . چوارەم : ئینسانی قەناعەتکار لەبەرئەوەی نەفسی ساچاوە بە فەقیرێ خۆیەوە ، باسی فەقیرێ خۆی لای کەس ناکا و کەس بە حاڵی نازانێ ، بەڵکو خەڵکی بە دەوڵەمەندی ئەزانن و شانبەشانی ئینسانی خاوەن دارایی ئەڕوا بەڕێوە .

( بزانن ) ئەمر بە قەناعەت مەعنای‌وا نیە کابرا کاسبی نەکا و هەوڵنەدا بۆ ڕۆزێ باش و چاوی بۆ بەرز نەڕوانێ . بەڵکو مەعنای وایە لەپاش تێکۆشان و کەسابەتێکی پەسەند ئەگەر دەسکەوتێکی زۆری نەبۆ ، بەو ئەندازە کەمەی کە دەستی کەوتوە دڵی خۆی ڕابگرێ و بە هیوای ڕۆژێ بێ باشتر تیا بژێ و بەتەمای ئەو پاداشە چاکە بێ کە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەیداتەوە .

یەکێ لەو شتانەی قەناعەت بۆ ئینسان ئاسان ئەکەن ئەوەیە ئینسان سەیری ئەوکەسانە بکا کە ژیانیان لە ژیانی ئەو ناخۆشترە ، نەك بۆ بەرەو ژۆرتر بڕوانێ . یەکێکیتریش لەو شتانە ئەوەیە ئادەمیزاد بە ویژدان بیر بکاتەوە لەوە کەوا ئازاری کەم و کورتی ڕزق و ڕۆزێ شتێکە لەبەینی ئەو خۆی و خوادا و کەس پێی‌نازانێ . بەڵام دەردی‌کاری داواکردن لە خەڵك و دەس بەڕووەوەنانی ئەوەندە گرانە هەرگیز نابڕێتەوە و لەولایشەوە خەڵك پێی‌ئەزانن و لەبەرچاویان سوك ئەبێ و ئەمەش دەردێکی سەرەڕا و سەربارییە .

| | |
|---|---|
| ڕۆڵەی عەزیز و گەورە و گرانم | بە شەرم و شکۆ و پایە و میزانم |
| قەناعەت بۆ تۆ قەڵای پۆڵایە | هۆی پاراستنی قەدری گەدایە |
| هیچ‌کەس لە کزیت ئاگادار نابێ | دڵ بە تانەی کەس بریندار نابێ |
| مەینەت باشترە لە نانی منەت | بمرە و وەرمەگرە نانی بێ‌هیممەت |
| هەرکەس قانیع بێ بە ئیعتیبارە | قەناعەت قاصەی پڕ لە دینارە |
| قەناعەت کاڵا و پەردەی سڕپۆشە | شیفای ئازاری دەردی نەخۆشە |



| | |
|---|---|
| ئینسانی قانیع شایە بە بێ‌تاج | بۆ تیری تانە نابێ بە ئاماج |
| ئینسانی قانیع دەنگی دڵبێرە | لە هەرلایەك بێ وەك نەڕەشێرە |
| بێ‌باکە لە شا چونکە ئازادە | بەم ئازادییە دەروونی شادە |

ئینسـانی قانیع لـە شـا ناترسێ | چون بێتەماعـە لە کـەس ناپرسێ
قانیـع هەمیشـە دڵـی گوشـادە | بـە میهـرەبانێ خـودا دڵشـادە
بێجگە لە بـەرزێ پـایەی قیـامەت | هەر لـە دنیـادا ئەگا بـە نیعمەت
کە تەمـای نەمـا بە غەیـری خودا | بە صەبر و ئارام بۆ خۆی هەوڵئەدا
پاش تاڵێ صەبریش نۆبەی ظەفەرە | کە شـەو تەواوبێ کاتی سـەحەرە
ئەمەیە پەنـدی خـودا و پێغەمبەر | ئەمەیـە دەرسی مـەردانی ڕەهبەر
بەم دەرسە ئەگەی بە پایەی سامێ | لەناو دۆسـتانا ئـەبێ بە ( نامێ )
کاتـێ دارایش بەرەو پـیرت هات | حەمدی خودا کە بۆ فەیضی خەڵات
کێ بێ شەرابی ڕەحمـەت نەنۆشـێ | کێ بێ لیباسی عیـززەت نەپۆشێ

# گوڵی سێوحەوتەم ـ گوڵی ئەمینێ

ئـادەمێ هێمـن فریشـتە خـووە
خۆ بێتـە بەرچاو بەهەشـتێ ڕووە
بۆ باوەڕکـردن بە شـەخصی هێمن
ئینسانی هوشیار بێ یـەك و دووە

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرمویەتی :

**وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ**

واتە : ئەوکەسانەی چاودێرێ ئەمانەت ئەکەن و گفتی خۆیان ڕائەگرن ، ڕزگارئەبن لە ئاگری دۆزەخ .

ئەمانەت صیفەتێکی پیرۆزی بەمایەیە لە نەفسی ئینساندا و بەهۆیەوە خاوەنەکەی چاودێـرێ حوقوقی خوای تەعالا و حوقوقی ئادەمیـزاد ئەکا . مەبەست لە ئەمانەت ئەوەیە ئەگەر ئینسـان کرا بە ئەمین لەسەر ماڵێ چاودێرێ بکا و بیپارێزێ و خەیانەتی تیا نەکا و ، ئەگەر شتێکی کەسێکی لا دانرا بە ساغێ هەڵیبگرێ و هەرکاتێ خاوەنەکەی داوای کردەوە بیداتەوە و ، ئەگەر کرا بە وەکیلی کەسێك وەکو ئیش بۆ خۆی بکا ئیش بۆ ئـەو کابرایەش بـکا و ، ئەگەر هاوبەشی کەسێك بێ لە کەسابەتدا بە ئاشکرا و بە نهێنێ بە ساغێ ڕەفتاری لەگەڵ بکا و ، ئەگـەر کرا بە ( وەصێ) بەسەر چەند هەتیوێکەوە بـاش تەمێ و تەربییەیان بـکا و موحافەظـەی ماڵەکەیان بـکا . بەتایبەتێ ئەگـەر ئینسان بەڕێوەبردنی کارێکی گشتێ دەوڵەتێ درایە دەست یا خۆی بۆ بە سەرۆکێکی دەوڵەتێ بە ئەمانەت و دادپەروەرێ و پیاوەتێ ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکا . ئەگـەر مامۆستای قوتابخانە یـا دانشگا بێ بە دڵسۆزییـەوە دەرس بە

قوتابییەکانی بڵێ و تەمێی دڵسۆزانەیان بکا . بەکورتی تا ئەڵقەی کار گوشادتر بێ مەسئولیەت و لێپرسینەوە زیاتر ئەبێ و ئەرکی ئەمانەت زۆرتر و گرانتر .

جا ئەگــەر ئینسان لە بەجێگەیانــدنی واجباتی سەرشــانیدا مەردانە بجوڵێتەوە و باش دەرچێ ، ئەوە ئەبێ بە خاوەنی پایەیەکی بەرز لای خوای تەعالا و لای بەنــدەیش هەروا سەربەرز ئەبێ و بە ئەمین و خــاوەن ئەمانەت ئەناسرێ . ئەگەر ئەمانەتیشی نەبۆ زۆر نزیکە خوای تەعالا غەزەبی لێ بگرێ و نور لە دڵیا نەهێڵێتەوە و بە بێئیمان بمــرێ وەکو لەم حەدیثەوە دەرئەکەوێ کە ئەفەرموێت : « لا ایمانَ لِمَنْ لا اَمانَةَ لَهُ » واتە : ئەوەی ئەمانەتی نەبێ ئیمانیشی نیە . هەروەها لەم حەدیثەشەوە کە ئەفەرموێت : « آیَةُ المُنافِقِ ثلاثٌ اِذا حَدَّثَ کَذَبَ ، وَاِذا وعَدَ اَخْلَفَ ، واِذا اؤتُمِنَ خانَ » واتە : نیشانەی ئینسانی دوو زوو سێ شتە یــەکەم کاتێ قسە بکا درۆ بکا ، دووهەم : کە وەعدەی شــتێکی بــە کەســێ دا وەعدەکەی جێبەجێ نــەکا ، ســێهەم : ئەگەر بە ئەمین دانرا لەسەر شتێك دەسپیسێ و نادڵسۆزێ تیا بکا .

ئەمانەت هەروەکو بۆ ماڵ و بۆ ئیدارە و بەڕێوەبردنی هــەتیو و هەژار و بەخێوکردنی حەیوان و ئاژاڵ پێویستە و خەیانەت تیاکردنی تاوانە ، هەروەها بۆ ڕاگرتنی قسەی پەنامەکی و مەحرەمانەش پێویستە ، بەڵکو وائەبێ ئەمانەت لەمدا موهیمتر ئەبێ . حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرموویەتی : « اِذا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِحَدیثٍ ، ثمَّ التَفَتَ فهیَ اَمانَةٌ » واتە : کاتێ کەسێك قســەیەکی لا کردن و بــە مــەحرەمی دانان لەســەر ئــەو قســەیە و خــۆی پشــتی پێ هەڵکرد و ڕۆیشت ، ئەوە ئەو قسەیە ئەمانەتە لای ئێوە و پێویستە ڕای‌بگرن و لای کەسی‌تر نەیڵێن . هەروەها فەرموویەتی : « المَجالِسُ بالاَمانَةِ » . واتە : ئەو قسانەی لە مەجلیس و کۆڕی دانیشتنندا ئەکرێن هەمو شێوەی ئەمانەتیان هەیە و ڕاگرتنیان پێویستە . هەروەها ئەگەر ئینسان گفت و پەیمانێکی لەگەڵ کەسێکدا کرد و گفت و پەیمانەکەی شتێکی دروست و ڕەوا بۆ ، ئەبێ ڕاگیری کا و نەیشــکێنێ . لەم‌ڕووەوە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمــوویەتی : « حُسْنُ العَهْدِ مِنَ الایمانِ » واتە : بە باشی ڕاگرتنی گفت و پەیمان بەشێکە لە باوەڕ و نیشانەی هێزی موسوڵمانەتییە . پێغەمبەر درودی خــوای لێ بێ لەبارەی ڕاگرتنی ئەمانەتەوە گەلێ فەرموودەی هەیە و داوای چاودێری‌کردنی ئەمانەتی کردوە ، تەنانەت بەرابەر بەوکەسانەیش کە خەیانەت لەگەڵ ئینسان خۆی ئەکەن هەر داوای کردوە بنیادەم لەگەڵیان ئەمین بێ و خەیانەتیان لێ‌نەکا . پێغەمبەر فەرموویەتی : « اَدِّ الاَمانَةَ اِلی مَنِ ائتَمَنَكَ وَلاتَخُنْ مَنْ خانَكَ » واتە : ئەمانەت بدەرەوە دەستی ئەوکەسەی بە ئەمینی داناوێ و خەیانەت مەکە تەنانەت لەگەڵ ئەوکەسانەش کە خەیانەتیان لەگەڵ کردوێ .

کاتێ کە حــەزرەت سەلامی خوای لێ بێ بە هەشت هــەزار کەسەوە لە

شاری مەدینەی مونەووەرەوە چۆ بۆ گرتنی شاری مەککەی موکەڕڕەمە و خودا سەری‌خست و گرتی ، ویستی بڕواتە ناو ماڵی کەعبەوە ، دوو ڕکات نوێژی تیا بکا . داوای کلیلی دەرگای کەعبەی کرد لە عوثمانی کوڕی طەلحە کە کلیل‌داری کەعبە بوو . ئەویش نەیدایە . حەزرەت فەرمانی‌دا بە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبوطالیب بە زۆر لە دەستی وەرگـرت و دەرگای کەعبەی کردەوە . حەزرەت چوە ژوورەوە دوو ڕکات نوێژی تیا کرد . لـەو میانەدا حەزرەتی عەبباسی مامی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ داوای کلیلەکەی کرد بۆئەوەی بدرێتە دەستی وەك چۆن ئاوی زەمزەمیشی لە دەسـتدایە . حەزرەت فەرمووی ڕاوەستە تا بزانین فەرمانی خوا بە چیە . لەودەمەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : « اِنَّ اللهَ یأمرُکُمْ اَنْ تؤَدُّوا الاَمانات اِلی اَهلِها » . واتە : خوا فەرمانتان ئەداتێ کەوا ئـەمانەت بدەنـەوە دەسـتی خاوەنـەکەی . مەبەسـت ئـەوەیە وەختـی خۆی ئەم کلیلـە بە دەست خانەدانی عوثـمانی کوڕی طەلحەوە بـوە و ئەو بە شێوەی ئەمانەت لە دەستی عوثمانی وەرگرتوە و ئیستە کە ئیشی پێ نەما ئەبێ بیداتەوە دەستی عوثمان خۆی . جا حەزرەت بە حەزرەتی عەلی فەرموو کلیلەکە بداتەوە بە عوثمـانی کوڕی طەلحە و ئەویش دایەوە پێی . عوثمان پرسی بۆچی کلیلەکەم ئەدەنەوە ، کەچی وەختی خۆی بەزۆر لێتان سەندم ؟ حەزرەتی عەلی بۆی ڕوون‌کردەوە کەوا لەوڕووەوە ئایەت هاتوەتە خوار . ئەوە کاری کردە سەر دڵی عوثمان ، وتی : دیارە ئەم ئاینەی ئێوە ئاینێکی ساغ و ڕاستە و موسوڵمان بوو . حەزرەت فەرمویـەتی : دوو شت هەن تۆڵەی چاکیان زوو دەسـگیر ئەبێ : ئەمانەت و شـوکری نیعمەت . دوو شتیش هەن تۆڵەی خراپیـان زوو دەسگیر ئەبێ : خەیانەت و ناشوکری نیعمەت .

ئەگێڕنەوە کەوا لە سەردەمی فەرمانداریی ( عضد الدولە )ی بوەیهیدا لە بەغدا کابرایەك لە دوورەوە هات بۆ بەغدا بچێ بۆ حەج . لە بەغدا پرسیاری کرد کێ لەم شارەدا بە ئەمینی ناوبانگی دەرکردوە ؟ کابرایەکیان پیشان‌دا ناوبانگی بە ئەمینی دەرکردبوو . حاجی چوە لای کابرا و لەپاش مەرحەبا و خۆپێ‌ناساندن پێی‌وت من گەردن‌بەندێکم پێیە بایی هەزار دینارە ، ئەمەوێ لای تۆ بە ئەمانەت دایبنێم تا لەم سەفەری خێرە ئەگەڕێمەوە بۆ بەغدا . ئەویش وتی باشە فەرموو و گەردن‌بەندەکەی لێ وەرگرت . حاجی چوو بۆ حەج و گەڕایەوە . کە گەیشتەوە بەغدا و دوو سێ ڕۆژێك حەسایەوە ، چوەوە لای کابرای ئەمین . پاش سەلام و مەرحەبا داوای ئەمانەتەکەی لێ کردەوە ، ئەویش ئینکاری کرد و وتی ئەمانەتی تۆم لا نیە . حاجی هەرچەند ناوونیشانی هەڵـدا سوودی نەبوو . پاش نائومێد بوون ڕاوێژی بە چەند دۆست و برادەرێك کرد ، پێیان‌وت پێویستە بەتایبەتی بچیتە لای ( عضد الدولة ) خۆی ئەو ڕێگایەکت بۆ دانێ و چارەیەکت نیشان‌بدا .

حاجی هەرچـۆن بوو خۆی گەیاندە لای ( عضد الدولـة ) و باسەکەی بۆ

گێڕایەوە . ( عضد الدولة ) وتی چارت ئەوەیە سبەینێ لە فلآنە سەعاتدا بچیتە سەر دۆکانی کابرای ئەمین دانیشی . من بەوێدا تێئەپەڕم و سەلامت لێ ئەکەم و گلەییەکی زۆرت لێ ئەکەم کەوا بۆچی هاتویتە بەغدا و سەرت لە من نەداوە ؟ تۆش بێموبالاتانە وەڵامم ئەدەیتەوە جا بزانین ئەنجامی چۆن ئەبێ . بۆ سبەینێ حاجێ چووەوە لای کابرا و لەسەر دۆکانەکەی دانیشت . ئەوەندەی پێ نەچۆ ( عضد الدولة ) بەویادا گوزەری کرد ، کە حاجێ دێ دابەزێ و سەلامی لێ کرد و گلەیێ لێ کرد کەوا بۆچی سەری لێ نەداوە و وتی کەی دۆستێ و برایەتێ وا ئەبێ ! حاجێ وتی ئەمجارە بە سەفەری دین هاتم و نەمویست دنیای تێکەڵ بکەم ، هەڵیگرە بۆ جارێکیتر . دوای ئەم گفتوگۆیە ( عضد الدولة ) چۆ بە ڕێگای خۆیەوە . کابرای بەناو ئەمین کە ئەمەی دێ گیانی تیا نەما . وتی مادەم ئەم حاجییە ئەوەندە دۆستی ( عضد الدولة ) بێ شکاتی منی لائەکا و ئەویش لەناوم‌ئەبا . ڕۆی‌کردە حاجێ و وتی بۆ خاتری خوا تۆ بۆ منت شەرمەزار کرد ، ناوونیشانی خۆتت بۆچی باش هەڵنەدا بۆم تا بتناسمەوە . ئیستا ئەتناسمەوە . فەرمۆ ئەوە ئەمانەتەکەت و گەردنبەندەکەی دایەوە . حاجێ چووەوە بۆ لای ( عضد الدولة ) و پاشماوەی سەرگوزەشتەکەی بۆ گێڕایەوە . ئەویش فەرمانیدا کابرایان گرت و کردیان بە دارا و تەختەیەکیشیان بە ڕاسەریا هەڵواسێ لێیان نۆسیبێ : ئەمە سزای ئەوکەسانەیە کە خەیانەت لە ئەمانەت ئەکەن .

کەواتە پێویستە لەسەر هەرکەس هەر جۆرە ئەمانەتێکی گەورە یا بچۆکی کەسێك یا کۆمەڵێك یا میللەتێکی لە بەردەستدا دانرابێ بزانێ خوا ئاگادارە لە ئاشکرا و پەنهانی ، لە قسەی دەم و ڕازی دڵی . تا لە توانایدا هەیە ئەمین و دڵسۆز بێ بۆ ئەو شتانەی بەدەستیەوەن ، بۆ ئەوکەسانەی کاریان لای ئەوە . دنیا وەکو دەریا وایە . ئەو کاربەدەستانەش کە ئیشی خەڵکیان لەدەستدایە وەکو کەشتێ وان . خەڵکیش وەك ئەو ڕێبوارانەن لەناو کەشتییەکەدان . ئاگادارێ و ئەمینێ ئەو کاربەدەستانەش هۆی پاراستنی کەشتییەکەیە لە نوقم‌بۆن . خەیانەت‌کردنیشیان هۆی نوقم‌بونی کەشتییەکەیە . پێویستە لەسەر هەمۆ ئەوانەی کاروباری ئەم خەڵکانەیان بە ئەمانەت دراوەتە لا ، وادابنێن کەوا ئەم خەڵکەی بەردەستیان برا و برازا و کوڕ و خزمی خۆیانن . لەگەڵ ئەوان چۆن ئەجوڵێنەوە ، ئەبێ لەگەڵ ئەمانیش هەروا بجوڵێنەوە و وایان پەروەردە بکەن و پێ‌بگەیەنن .

**برادەرانی شیرین سروشتم — هاووڵاتانی بلند ڕەوشتم**
**ئێوەن ئەمینداری بۆ گەنجی وڵات — یا نایینداری خاوەن دەسەڵات**
**لە ڕێی خودادا دڵتان ئەمین بێ — لەگەڵ خۆتاندا دەمتان شیرین بێ**
**ئەی سەرۆکاتی خاوەن ئیدارە — ئەی زانایانی خاوەن ئینارە**

ئەی کاسبانی هۆی زیندەگانی — سەرچاوەکانی ژینی ئینسانی
پیشەوەرانی بەرزی هونەرمەند — ئێوەن ڕەهبەری گەلی هۆشمەند
دێبەدەستەکان دێوان ڕەوێن بن — نەوەك وەکۆ دێو گێرەشێوێن بن
ئێوەن دەسمایەی ڕۆڵەی مەملەکەت — بە عەقڵ و بیر و بە هێزی صەنعەت
ئێوەن واسیطەن بۆ نانی مەردێ — دوژمنی لاتێ و پەستێ و نامەردێ
ئێوەن دوژمنن بۆ نانی منەت — مناڵ فێرئەکەن بە شانی حورمەت
بۆ ڕەزای خودا با دلتان پاك بێ — لەگەڵ ئەم گەلە با خۆتان چاك بێ
گەلی خۆتانن خۆ بێگانە نین — یەکن بە خاك و بە زمان و دین
ئیمڕۆ ئێوە باب ئەوان ڕۆڵەی چاك — سبەینێ ئەوان ئەبنە بابی پاك
دنیا چین چین و تەبەق تەبەقە — هەر دەستەوامە و هەر حەق بە حەقە

★ ★ ★

مامۆستای دەرسی عیلم و ئەقافەت — نوختەی مەرکەزی فەضڵوشەرافەت
کە مەرکەز نەبێ دائیرە نابێ — جیهان بێ زانست عامیرە نابێ
ئێوە میعمارن بۆ بینای وڵات — با بناغەتان ساغ بێ و بە ئەبات
ئێوەن باخەوان بۆ باخی میلەت — ئێوەن بەرپرسن لە دەرد و زەحمەت
بە ئاوی صافی دەرس و پەروەردە — ڕیشەکێشی کەن ئەم ئێش و دەردە
بە پەیوەندکردن لە ڕەوشتی بەرز — ڕۆی وڵات بکەن بە بەهەشتی ئەرز
پەروەردەی بکەن دەستەی قوتابێ — لەسەر ڕەوشتی عالێ جەنابێ
تا بە سینەی ساف پیرانی جاف بن — بۆ ڕۆژی مەصاف شێرانی قاف بن
بە بیرو باوەڕ بە کردەوەی چاك — شۆرەتیان بڕوا بۆ ئەوجی ئەفلاك
بە شەرمو شکۆو دەستو داوێن پاك — خۆگر و هۆگر زانا و دڵ ڕۆناك
لە ڕۆژی ڕەشا کە خۆیان بادەن — لە ئاگری سۆر وڵاتیان لادەن
کێوان وەرگێڕن بە جادە و سارا — بۆ تاریکە شەو ببن بە چرا
تا ڕزگار ببن لە لۆمە و تانە — بناسرێن لەناو خۆێ و بێگانە
ئەمەیە واتەی ( نامێ ) لە ژینا — ببارێ ڕەحمەت بەسەر ئەمینا

## گوڵی سیوهەشتەم ـ گوڵی پیاوەتی

بە پیاوەتییە نرخی ئادەمێ
بەلام بە مەعنای بەرزی عالەمێ
غیرەت و پەنا و بەخشش بەقەد حاڵ
سڕپۆشێ لەگەڵ حاڵی خادەمێ

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرمویەتی :

**وَيُطْعِمُونَ الطَّعامَ عَلى حُبِّهِ مِسْكِيناً وَيَتِيماً وَاَسِيراً**

واتە : پیاوە باشەکان نان و چێشت و خواردەمەنی دەرخواردی هەژار و

هەتیو و دیل ئەدەن . مەبەستی لەوەیە کە ئەم نان‌دانەیان هەر لەبەر ڕەزامەندیٚ و خوٚشەویستیٚ خوایە .

پیاوەتیٚ ، کە لە زمانی عەرەبدا پێی‌ئەوتریٚ ( مروءة ) بەوە ئەڵێن کەسێك خاوەنی گەلیٚ ڕەوشتی شایان و بەرز بیٚ . لە گەورەترینی ئەو ڕەوشتانەیە غیرەت و پەناداریٚ و بەخشینی ماڵ بەپێی حاڵ و شاردنەوەی ڕازی خەڵك و خزمەتکردنی ئینسانییەت لەڕێی خوادا .

مەبەست لە غیرەت ئەوەیە ئینسان شتی سوٚك و پەستی بوٚ خوٚی و خانەدان و خزمانی و بوٚ تێکڕای موسوڵمانان و بوٚ ئەو کافرانە نەویٚ کە لە پەنای ئیسلامدا ئەژین . مەبەست لە پەناداریش ئەوەیە ئەگەر کەسێك یا کوٚمەڵێك لەکاتی پەرێشانیٚ و داماویدا پەنایان هێنا بوٚ کەسێك پەنایان بدا و بە هەرجوٚریٚ کە بکونجیٚ چاری گیروگرفتەکەیان بکا و هەوڵبدا بوٚ ڕزگارکردنیان ، تەنانەت ئەگەر پەنا هاوردوەکە کەسێکی ئەمی کوشتبیٚ ، مادەم پەنای هێناوە بوٚلای لێی خوٚش ببیٚ و چاوپوٚشیٚ لیٚ بکات ، چونکە غیرەتی مەرد ڕازیٚ نابیٚ بەوە کە پەنای خوٚی بشکێنیٚ ، بەمەرجیٚ پەنادانەکە لە ڕێگای دین بەدەر نەبیٚ .

لە خوالیٚ‌خوٚش‌بوٚ شێخی بیارەم بیست فەرموٚی پیاویٚ لە عەشایری نزیکی زەهاو کوڕی ڕەئیسی خێلێکی کوشتبوٚ و پەنای بردبوە بەر گەلیٚ کەس و گەلیٚ شوێن کەس داڵدە و پەنای نەدابوٚ . تا سەرەنجام هات بوٚ خزمەتی شێخ عومەری باوکم و پاڕایەوە کە تکای بوٚ بکا بەڵکو کابرا کوڕ کوژراوەکە لێی خوٚش ببیٚ و دەست‌بەرداری ببیٚ . شێخ فەرموٚی باوکم ئەمری پیٚ‌کردم کەوا مەلا موحەممەدی جوانڕوٚییش لەگەڵ خوٚم هەڵگرم و بڕوٚم بوٚ ماڵی کابرا کوڕ کوژراوەکە و لە زمانی باوکمەوە تکای لیٚ بکەم ئەم قاتیلە عەفو بکا و لێی خوٚش ببیٚ . شێخ فەرموٚی ڕوٚیشتین بوٚ ماڵی کابرا. کە گەیشتینە ئەویٚ و بەخێرهاتنیان لیٚ کردین دەوارێکی تازەیان لە نزیکی ماڵەوە هەڵدا ، وامان‌زانیٚ بوٚ ئێمەی هەڵئەدەن . ئێوارە نانیان دانا ویستم نان نەخوٚم تا گفتێکی لیٚ نەسێنم کەوا لەم کوڕە خوٚش ئەبیٚ . کە باسەکەم کردەوە وتی یا شێخ فەرموٚ نان بخوٚ خوا کەریمە . پاش نان خواردن وتی یا شێخ بفەرموٚ باماموٚستا ئەو کچەم مارە ببڕیٚ لەم کوڕە کە هێناوتە بوٚ لام عەفوی بکەم ، چونتە من ئەمەویٚ عەفوی بکەم و ، ئەگەر نەیکەم بە خزمی نزیکی خوٚم ئیسراحەت ناکا ، بەڵام کە بوٚ بە زاوام ئەوە وەکو کوڕی خوٚمی لیٚ دیٚ و ئەو دەوارەیشم بوٚ ئەوان هەڵداوە . شێخ فەرموٚی منیش زوٚر سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەم نیعمەتەی کە دڵی ئەم کابرایەی بوٚ هێنایە سەر ئەم حاڵە و کچەکەمان مارە بڕیٚ لە کوڕەکە . پاش ئەوە کابرا بە کوڕەکەی وت ڕوٚڵە ئەوە دەواری ئێوەیە بڕوٚ تفاقی خوٚتی تیٚ بگوێزەرەوە و وەرە ژنەکەشت بگوێزەرەوە .

مەبەست لە بەخشینی ماڵیش ئەوەتە بەگوێرەی دەسەڵات بە پارە یا بە خۆراك یا بە جل و بەرگ و کەلوپەل یا بە هەر شتێکیتر کە بە ماڵ بژمێررێ دەسگرۆیی خەڵك بکەی ، نەخوازەڵا هی گەدا و هەژار و بەتایبەتی لە ساڵە گرانی و ساڵی قاتی و نەهاتیدا . پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « اتّقوا النّارَ ولَوْ بِشِقِّ تمرَةٍ » واتە : خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن بە لەتی خورمایەکیش بێ . هەروەها فەرمویەتی : « صَنائعَ المَعروفِ تقِی مَصارِعَ السّوءِ ، وَصَدَقَةُ السِّرِّ تطفِیءُ غَضَبَ الرَّبِ ، وصِلَةُ الرَّحِمِ تَزیدُ فِی العُمُرِ » . واتە : پیاوەتی و ئیشی چاك ئینسان لە کەوتنی خراپ و مردنی ناشیرین ئەپارێزێ . بەخششی پەنامەکییش بە داماوان وەك ئاوێك بکەی بە ئاگرا غەزەبی خوای گەورە ئەکوژێنێتەوە و ، چاکەیش لەگەڵ خزمان عومری ئینسان درێژ ئەکا .

مەبەست لە سترپۆشیش ئەوەیە ئەگەر ئینسان عەیبێك یا ئیشێکی نابەری لە کەسێك دی خۆی لێ وێڵ بکا وەك نەیدیبێ . خوا خۆی عەیبپۆش و ( ستّار )ە و حەزی لەوەیە بەندەکانیشی عەیبپۆش بن . حەزرەتی پێغەمبەریش فەرمویەتی : « مَنْ سَتَرَ مُسلِماً سَتَرَهُ اللهُ یَومَ القیامَة » واتە : کەسێ عەیب و عاری موسوڵمانێ داپۆشێ بەجۆرێ کە خەڵك بەو عەیبە نەزانن ، خوا ئەوکەسە بە بەرگی ڕەحمەتی خۆی دائەپۆشێ لە ڕۆژی قیامەتدا . هەروەك پێویستە ئینسان عەیبی خەڵکی داپۆشێ ، پێویستە عەیبی خۆیشی داپۆشێ ، یەعنی عەیبێ کە لە خۆیدا بێ و خەڵك پێی‌نەزانن دەری‌نەخا و ئابڕۆی خۆی نەبا . پێغەمبەر ، درۆدی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی : هەمو کەسێ لە قیامەتدا سەلامەتە و ئابڕۆی پارێزراوە ، مەگەر ئەوکەسانە کە عەیبی خەڵك دەرئەخەن ، ئەوانە لەقیامەتدا ئابڕۆیان نامێنێ و لەناو قەرەباڵغی مەحشەردا ڕسوا ئەبن . لە واقیعدا کەم وا ڕێ‌ئەکەوێ ئادەمی‌زاد بێ‌عەیب بێ و زوربەی خەڵك ، کەم یا زۆر ، عەیبدارن . ئینسانیش تا عەیبی دەرنەکەوێ لە بەرچاوی خەڵکا سوك نابێ . بەڵام کە عەیبی دەرکەوت لەناو عالەمدا سوك ئەبێ و ئیعتیباری ئەشکێ و کەڵکی قازانج گەیاندنی نامێنێ چ بۆ خەڵك و چ بۆ خۆی . بەتایبەتی ئەوکەسانەی کە سەرۆکی کۆمەڵی ئادەمیزادن وەك سەرۆکانی دەوڵەت و پیاوانی ڕۆحانی و زانایانی بەرز و هەر کەسێکیتر کە خەڵکی لە بەردەستا بێ هەتا ناوبانگی باش بێ هێشتا کەمە . بۆیە پێویستە پارە خەرج بکرێ بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی باش بۆئەوەی کۆمەڵ زۆرتر سودی لێ وەربگرێ .

بەشی گەورەی پیاوەتی بریتییە لە خزمەت‌کردن بۆ ئەوانەی کە موحتاجن بە خزمەت . لە واقیعدا هەمو ئادەمیزاد لە گەورە و بچوك و دەوڵەمەند و گەدا پێویستیان هەیە بە خزمەتی خەڵك ، بەڵام فەرق لەوەدایە هەندێ‌کەس خزمەتیان نەکرێ ناژین و هەندێ‌کەسیش خزمەت نەکردنیان کارناکاتە سەریان.

بۆ وێنە ئینسانێکی بەدەسەڵات کە خۆی لەخۆیدا ئەوەندە دەسەڵاتی هەبێ بتوانێ کاروباری خۆی بەرێبەرێوە . ئەم کەسە پێویستی بەوەیە ناوبانگی باشی بڵاو ببێتەوە و خزمەتی بکرێ ، بەڵام ئەگەر کەس چاکەشی نەڵێ و خزمەتی نەکا زۆ پێیەوە دەرناکەوێ . کەچێ گەدایەکی برسێ پێویستێکی زۆری بە یارمەتییە و ئەگەر یارمەتی نەدرێ زۆبەزۆ ئەفەوتێ و لەناوئەچێ .

لە ئایینی ئیسلامدا تەعریفێکی زۆری خزمەتکردن کراوە . بەتایبەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ فەرموویەتی : « في كلّ كبدٍ رطبةٍ اجرٌ » واتە : لە خزمەتکردنی هەموو گیانلەبەرێکا کە جگەری تەڕی بێ ئەجر و حەسەناتێك بۆ ئەوکەسە هەیە کە خزمەتەکە ئەکا . لە بوخاریی شەریفدا ئەگێڕێتەوە کەوا کابرایەك بەڕێگایەکدا ئەڕوا ، زۆر تینوی ئەبێ ، لە ڕێگادا ڕێی ئەکەوێتە بیرێکی ئاو ، خۆی دائەهێڵێ ئاوبخواتەوە . کە دێتەوە سەرەوە تەماشا ئەکا سەگێ لە قەراخی بیرەکەدا لە تینوێتیدا قەپ لە ئەرز ئەگرێ . لە دڵی خۆیدا ئەڵێ واچاکە داپەڕمەوە بۆ ناو ئاوەکە هەندێ ئاوی بۆ هەڵگۆزم ، وادیارە زۆری تینوە . دائەپەڕێتەوە خوارەوە تایەکی کەوشەکەی بۆ پڕئەکا لەئاو و ئەیگرێ بەدەمیەوە و سەرئەکەوێتەوە سەر . ئاوەکە ئەدا بە سەگەکە ئەیخواتەوە. خوای تەعالایش وەحی ئەنێرێ بۆ پێغەمبەری ئەو شوێنە لەو سەردەمەدا ، کەوا ئەو کابرا هەرچەند تاوانبار بو ، لەبەر ئەو خزمەتەی بەو سەگە بێزمانەی کرد وا من چاوپۆشیم لێکرد و لێی خۆش بوم .

بۆیە هەندێ لە زانا بەرزەکانی ئیسلام وتویانە ئیسلامەتی بریتییە لە ساغی لەگەڵ خوادا . ساغییش لەگەڵ خوا بە ڕەفتاری باشدا دەرئەکەوێ لەگەڵ مەخلوقاتی خوا . سەعدیی شیرازی ڕەحمەتی خوای لێ بێ شیعرێکی هەیە مەعناکەی ئەمەیە : خواپەرستی لە خزمەتکردنی خەڵك بەولاوە نییە و بە تەزبیح و بەرماڵی ساختە و فرۆفێڵ نییە .

ڕۆڵەی عەزیزم زۆر بەتایبەتی | بۆت بەیانئەکەم مەعنای پیاوەتی
پیاوەتی بەرزی خولقی بەشەرە | ڕاستییە و پاکی و صەرفی نەظەرە
غیرەتە و پەنا و بەخشین بەقەد حاڵ | سڕپۆشی و خزمەت بە دارایی و ماڵ

★ ★ ★

ڕاستی ئەوەیە پەیمانت نەشکێ | ئارەقەی شەرم لە ڕوی ڕوت نەتکێ
وەعدەیەکت دا زۆ بەجێیبێنی | ئەوەك سبەینێ سەر دانەوێنی
وتارت ڕاست بێ بۆ دۆست و دوژمن | حەق دانەپۆشی نە بۆ خۆت نە من
مەعنای غیرەتیش ئەوەیە کە مەرد | بێ بە قەڵا بۆ ڕۆژی نەبەرد
یەعنی وەها بێ بە بەرزی ڕەفتار | جێگەی هیوا بێ لەبۆ گوروفتار
پەستی و ڕەذیلە و نابودی و زیان | ڕەوا نەبینێ بۆ نەوعی ئینسان

وەك لە كتێبی دینا وتراوە      زۆر بە ڕۆشنێ باسی كراوە
پاكێ ئەوەیە نەبێ بە فەساد      لەبۆ نیشتمان یاخود بۆ عیباد
مالی كەس نەخۆی چ شا و چ فەقیر      دەسی كەس نەبڕێ بە حیلە و تەزویر
صەرفی نەظەریش واتە چاوپۆشی      خەتای خەتابار هەمێ بپۆشی
چاكەیەكی‌تر پەنادارییە      كە قەلای زۆری گروفتارییە
ئەگەر دوژمنێ پەنات بۆ بێنێ      لە دەستی زۆردار ڕاكیا لە شوێنێ
بەقەد حالی خۆت پەنای بدەرێ      مەهێلە دوژمن دەستی بۆ بەرێ
پیاوی بەشەرەف گوێی بكوژدرێ      پەنایە ئەگەر پەنای بۆ ببرێ
توسۆلی مەردان وابو تا مردن      بۆیە پاش‌مردن مان و نەمردن
چاكەیەكی‌تر بێ بە پشتی تۆ      پۆلێكە دەرچێ لەناو مشتی تۆ
بەخششە ناوت ئەخاتە جیهان      لەگشت لا ئەتكا بە ویردی زوبان
بەخششە پایەی پێ ڕاگیر ئەكرێ      ولاتی چۆلی پێ تەعمیر ئەكرێ
بەخششە خۆشێ بە تۆ ئەنۆشێ      هەمێ عەیبێكت بۆ دائەپۆشێ
بەخششە دوژمن ئەكا بە برا      بۆ تاریكە شەو ئەبێ بە چرا
بەخششە گرێت بۆ ئەكاتەوە      دەرگای ڕزگاریت لێ ئەكاتەوە
كاری موشكولت بۆ ئاسان ئەكا      زامی نابارت بۆ دەرمان ئەكا
كاتی لێ‌قەومان ئەگا بە فریات      لەجیاتێ برای هوشیار و وریات
مایەی پیاوەتێ و پایەی مودارا      حەصرە لە صەبر و پارە و تارا
دەس بەبەخشین‌و دەم بەواتەی خۆش      خۆشت ڕابگرە لەكاتی ناخۆش

★ ★ ★

ئینسان لە گڵە و گڵیش مادّەیە      دائیم بۆ مادّە بەخت ئامادەیە
ئەگەرچی مادّە لەبۆ مەعنایە      مەعنا بێ‌مادّە حالی فەنایە
دین لەسەر ژینە و ژین لەسەر ژیوار      ژیوار بە مالە لە ڕۆی ڕۆژگار
ئەو زامەی زانا لێی حەیران ئەبێ      ئینسان بە پارە بۆی ئاسان ئەبێ
قەت باوەڕ مەكەن بە بێ‌دارایی      ئینسان بكاتە هۆی تەوانایی
بەلام بزانن پارە بۆ پایە      پێش‌قەرەوڵە و پیرۆزێ تیایە
پارەیێ نەبێ بە مایەی شەرەف      با لەگەڵ بادا بڕوا بە تەلەف
قەت پارە مەكەن بە قیبلەی وجود      قەت بەرەو پارە مەڕۆنە سوجود
ئەوەی بۆ پارە سەر دائەوێنێ      هەرگیز مەرتەبەی شەرەف نابینێ

★ ★ ★

ئەتەوێ كالای بەرزێ بنۆشێ      بچۆ ژێر ئالای بەرزی سڕپۆشی
وەهایە دەرسی ئایینی ئیسلام      خودا سەتتارە و سڕپۆشە بۆ عام
حەزئەكا لەوە كە تۆیش سەتتار بی      بۆ شەرەفی خەلك چەشنی دیوار بی

هەرکەس داپۆشێ عەیبێ لە بەشەر　　عەیبی ونئەبێ لە ڕۆژی مەحشەر
خزمەت بە دەستەی داماو و دڵڕێش　　چ لە بێگانە و چ لە خزم و خوێش
ئەگەر بە مادە یاخود بە مەعنا　　بە مەرجێ کە دڵ بکا دڵنیا
بە پەند و دەرس و ڕێی ئامۆژگاری　　بە نیشاندانی ڕێی بەختیاری
بە ماڵ و بە نان بە پارە و بە پوڵ　　بە پایە و شان و بە تکای مەقبوڵ
بە دەرمانکردن بۆ زامی زامار　　بە دۆزینەوەی دەرێ بۆ ناچار
بە چارە و ئیسلاح بۆ ناوبەینی خەڵک　　بە هەر شێوەیێ لێی وەرگیرێ کەڵک
بە دەفعی شەڕی ئینسانی شەڕۆر　　کە فەرزە بە دین واجبە و زەرور
بە ئینصاف و داد لەگەڵ خاوەن حەق　　بە تەمێ دادان بۆ هەرزەی ئەحمەق

★ ★ ★

سڕپۆشێ شێوەی پیاوی بەشەرمە　　بە نوری ئیمان دەروونی گەرمە
ئای بۆ ئەو مەردەی لەبەر کەرامەت　　چاوی ئەپۆشێ لە عەیبی ئوممەت
هەر بۆ عەیبی خۆی ئەڕوانێ بە دڵ　　نایپەرژێتە سەر عارف و عاقڵ

★ ★ ★

کاتێ کە یەکێ لەبەر دەردی دڵ　　پەنای پێهێنای بۆ حەللی موشکوڵ
بزانە ئەوە پەنای هێناوە　　کە تۆی بە جێگەی هانا داناوە
دوورە لە ئینصاف جاڕی لێ بدەی　　دەنگی خەڵکی دێ و شاری لێ بدەی
ئەسراری خۆت و خزم و بێگانە　　لە پاراستنا هەموو یەکسانە
چونکە بەگوێرەی ئایینی ئیسلام　　ساغێ پێویستە لەگەڵ خاص و عام

★ ★ ★

خولاصە نرخی شەخصی بەهیممەت　　بە کێشانەی حەق خزمەتە خزمەت
ئەمانەی وتمان بە دەم ئاسانن　　بەڵام ئایابن ئەگەر بزانن
ئینسانی بێ ڕۆح بە شت مەزانە　　پیاوی باش کەمە لە ڕوی زەمانە
پیاو وەکو هەتاو دنیا ڕۆن ئەکا　　پەستێ و بەدخوێ سەرنگون ئەکا
ئەگەر پیاوی باش بێ بە سەرپەرشت　　سەرزەوی ئەبێ بە باغی بەهەشت

★ ★ ★

ئینسان مەجبورە بە دینی ئیسلام　　بە خزمەتکاری لەبۆ خاص و عام
موسوڵمانانێ بەڕاستێ ژیرن　　هەموو وەك ئەلقەی ڕشتەی زنجیرن
پەیوەندی یەکن لەمسەر تا ئەوسەر　　یەك لەش و یەك ڕۆح یەك دڵ و یەك سەر
وایە برایێ نەك بە بەدڕایێ　　بە دەم یەکێتێ ، بە دڵ جیایێ
بەم دەرسێ منە ئەگەر دڵ ئەدەن　　هەرچیتان دەس کەوت بەشی من مەدەن

# گوڵی سێ‌ونۆهەم ــ گوڵی خۆبەکەم‌زانین

ئەو ئینسانانەی خۆ بە کەم ئەگرن
لەنـاو دڵانـا جێی خـۆیان ئـەگرن
ناویان نــامرێ هــەتا هــەتایە
لـە دڵا ئەژین پـاش ئـەوەی ئـەمرن

خوای گەورە لە قورئاندا فەرمۆیەتی :

**وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ**

واتە : باڵی میهربانی پان‌کەرەوە بەســەر زەویدا بـۆ ئەو موسوڵمانانەی پەیڕەویت ئەکەن و شوێنت کەوتون .

خۆبەکەم‌گرتن کە بە عەرەبی پێی‌ئەڵێن (تواضع) ئەوەیە کەوا ئینسان خۆی بەرابەر بە خەڵك بە کەم نیشان‌بدا و فیز و دەمار نەکا بەسەریاندا . ئەم صیفەتە صیفەتێکی زۆر بەرز و بەنرخە و ئەبێ بەهۆی ئەوە کەوا ئینسان لەناو کۆمەڵی ئادەمیزاددا جێگەی خۆی بە پایە و حورمەتەوە بگرێ و ، ئەبێ بەهۆی ئەوە کە بەپێی قابیلەتی خۆی فائیدە و سوودی مادی و مەعنــەوی بگەیەنێ بــە خەڵك‌و هەروا سوودیش لــە خــەڵك وەربگرێ و بەئاســودەیی بژێ . بــەتایبەتی بــۆ ئەوکەسانەی کە ئیش‌وکاریان بەدەستە وەك بەڕێوەبەرایەتی و پەروەردەکردن و ڕێگا پیشان‌دانی خەڵك ، زۆر بەسوودە و ئەبێ بە مایــە و هــۆی سەرکەوتن و ڕزگاری و سەربەرزی لە جیهاندا و لەوانەیە لە هەندێ کاتــدا جێگەی مادە و پارە بگرێ و بەڵکو زیاتریش لە مادە کــار بکا . پێغــەمبەری نازدار ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمۆیەتی : « العَفْوُ لایَزِیدُ العَبْدَ اِلا عِزاً ، وَالتَّواضُعُ لایَزِیدُهُ اِلا رِفعَة ، وَما نَقَصَ مالٌ مِنْ صَدَقَة » . واتــە : چاوپۆشی لە تاوانی تاوانبار هیچ زیاد ناکا بۆ بەندە بەرزی و نرخ و حورمەت نەبێ و ، خۆ بە کەم‌گرتن هیچی بۆ زیاد ناکا پایەبڵندی نەبێ‌و ، هەرگیزیش دارایی بەهۆی خێر لێ کردنیەوە کەم‌ناکا .

بەڵام بۆ خاوەنی ئەم صیفەتە چەنــد مەرجێك پێویســتە . یــەکەم : لە ئەندازەی یاسای عادەتی دەرنەچێ بەجۆرێ کە خاوەنەکەی سوك و ڕسوا بکا . دوەهەم : بەرابەر بە هەمو تاقمێ بێ لە موسوڵمانان و فەرقی پایەدار و بێ‌پایەی تیا نەخرێ ، ئەگینا ئەبێ بە ڕوپامایی و زۆر ناشیرین ئەبێ . سێهەم : کابرای خۆ بەکەم گرتو هەوڵ بدا بۆئەوە کە دڵیشی لەگەڵ دیمەنیا ڕێك‌بکا ، واتە بەڕاستی تەماشای دڵی خۆی بکا و حیسابی خۆی لێك‌بداتەوە و وادابنێ کەوا پێویستە موسوڵمانان قەدر و حورمــەتی یەك‌گرتن لەنیــوانیانا ببێ بۆئــەوە کە ئولفەت

لەبەینیانا پەیدا ببێ ، ئەگینا ئەبێ بە نیفـاق و دوڕوویی کـە ئەوەیش خۆیەکی پەستە و پێویستە ئینسان خۆی لێ لابدا .

پێغەمبەر درودی خـوای لێ بێ فەرمـوویەتی : فریشتەی خوا فەرمانی ئەوەی بۆ هێناوم کەوا بەرابەر بە یـەکتر خۆتان بـە کـەم بزانن و فیز بەسەر یەکتردا نەکەن بۆئەوەی کە ئولفەت و هۆگری لەنێوانتانا دابمەزرێ . قسەیەکی بەجێ مەشهورە کەوا پایە لە خۆ بە کەم گرتندایە و کەرامەت و گەورەیی لە خۆ لە گوناە پاراستندایە و ئازادی لەوەدایە ئینسان بە کەمی خۆی بساچێنێ و چاو نەبڕێتە زۆری خەڵك .

برای سـەربەرزی ڕێـزی یـارانم    جێی هیـوا و هانـای ڕۆژگـارانم
پێت‌ئەڵێم دەرسـی بەسـوود بۆ برا    خۆت بە کەم بگرە لەنـاو بەشـەرا
خۆ بە کەم‌گرتـن ئەبێ بە سـوپەر    بۆ قەزای خودا و ئـازاری بەشـەر
بـەڵام وانەبێ کە سـوکت بکـا    لەنـاو یـارانا مەهتوکـت بکـا
ئەبێ میـزانی قـەدرت بزانـی    ئەگەر بـە تەمـای خۆشـی ژیـانی

★ ★ ★

ئەگەر بۆخودایش خۆت بە کەم ئەگری    پێویستتە بۆ ژین تـا کاتی ئـەمری
چ لەگەڵ گەورە و چ لەگـەڵ هاوشان    چ لەگەڵ بچوك فـەرزە بێ‌گومـان
تەواضوع‌کردن لەبـۆ سـەرداران    ئەیانگەیێنـێ بـە پۆپـەی داران
تەواضوع لەگـەڵ دۆسـت و برادەر    ئەتکا بـە برای هەمویـان یەکسـەر
تەواضوع لەگـەڵ بچوکتر لـە خۆت    پـایەی گەورەیـی پەیدا ئەکـا بۆت
ئیسـپاتە کەوا خۆ بە کـەم دانـان    ئەبێ بە مایەی بەرزی پـایە و شـان

★ ★ ★

بڕوانە هەرکەس لە گەورە و هاوشان    خۆی بە کەم دانا بە دڵ و بە گیـان
خەڵکی بۆی ئەبن بە دۆستی گیـانی    گیان بەخت ئەکەن بۆی بە میهرەبانی
خۆ ئەگەر گەورە خۆی بە کەم دانـێ    بە چاوی برا بـۆ خەڵـك بـڕوانێ
دنیا تەخت ئەکا بە بێ کۆسپ و کەند    دڵی ئەم خەڵکەی بۆ ئەچێتە بەنـد
دۆستی بەوەفا و دوژمنی دڵڕێـش    بۆ پیـاوی بەفیـز ئەبن بە دەروێش
هەریەکێ یەکێ ئەداتـە لای خـۆی    ئەبن بە سوپـا و جیهـان ئەگرن بۆی

★ ★ ★

بـا پێـم بـەم‌لاوە توخـوا پێم‌بڵێ    تۆ دڕکت ئـەوێ یـا دەستەگوڵـێ
چۆن ئەبێ ئینسـان کـاری‌وا بکـا    لەجیـاتی قـازانج ئێشـی بێ بکـا
تۆ چۆن فیز ئەکەی بەسـەر دامـاوا    بەسـەر بێ‌دەستـا یـا دڵشکـاوا
هەرکەسـێ لای خۆی شانێکی هەیە    عیزەتی نەفس و گیـانێکی هەیـە

| | |
|---|---|
| که لەبۆ زامی نابێ بە مەلهەم | بۆچی خەم ئەکەی بە سەرباری خەم |
| ژێژك کە بەرگی دڕکە تان و پۆی | بەچکەکەی نەرمە لە بەرچاوی خۆی |

★ ★ ★

| | |
|---|---|
| دنیاش دۆلابە هەر هەڵئەسوڕێ | ڕۆژێ بە چەند جۆر وەزعی ئەگۆڕێ |
| خودایش زانایە بە ئەحوالی تۆ | بە دەستی ئەوە حاڵ و ماڵی تۆ |
| جا لەبەر خودا نەك لەبەر دنیا | خۆت بێ وێڵ مەکە بە تاقی تەنیا |
| ( ولا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنّاس ) | فەرمودەی خوایە بیکە بە میقیاس |
| ئادەم لە خاکە و ئادەمێ هەروا | میزاج ئەگۆڕێ بە ئاو و هەوا |
| هەوا ئەندازەی ڕابگری چاکە | شەخصی کەم هەوا دڵی ڕۆناکە |
| پێویستە ئینسان بەپێی حاڵی خۆی | بکەوێتە هەوڵ بۆ کەماڵی خۆی |
| هاتو کەوتەبەر هەوای سەرزەوێ | با میانە بێ نە بەرز نە نەوێ |
| بارێ تاکانی یەك بن لە کێشا | بارەبەر ئەبیا بە ڕێ و لاڕێشا |
| کە زۆر و کەم بن ناڕوا بە ڕێدا | بەڵکو ئەکەوێ لە هەمان جێدا |
| کە موعتەدیل بۆن لە دنیا و دینا | بە بەرزێ ئەژێت لە هەردو ژینا |

★ ★ ★

| | |
|---|---|
| ( اعدی عدوك نفسكَ التی | بَیْنَ جَنْبَیْكَ ) گەر بەغیرەتی |
| هەر نەفسە ئینسان ئەخاتە هەوا | ئەیخاتە سێ باز لە نیوەشەوا |
| لەمە ڕزگار بۆی چاوان هەڵدێنی | ڕێی بەختیارێ بۆ خۆت ئەبینی |
| ( رَحِمَ اللهُ مَنْ عَرَفَ نفسَه ) | هەرکەسێ گوێی بێ پەندێکی بەسە |
| هەرکەسێ لەسەر نەفسی خۆی زاڵە | ڕوستەمی چەرخە و خاوەن گوپاڵە |
| خۆ تەسلیم کردن بە نەفسی بەدکار | پەنجە دانانە لەناو دەمی مار |

★ ★ ★

| | |
|---|---|
| هەر بۆ ئەمەیە سزای ڕەهبەران | هاوار و نزای هونەر پەروەران |
| ئینسان بەم ڕێدا بێ هەوا و سزا | لە دنیا دەرچێ بۆ ( دارُ الجزا ) |

★ ★ ★

| | |
|---|---|
| بە ئەخلاقی بەرز بە شیرینێ ڕۆ | ڕێگە ساف بکە لەبۆ هاتوچۆ |
| با یەکێ ببێ بە پەرداخێ ئاو | ڕزگارت بکا لە تیکەی گیراو |
| ئەمەیە دەرسم بۆ هاوزمانم | وایە دەستوری دین و ئیمانم |
| هەر بە تەواضوع ئینسان ( نامی )یە | خۆ بەزلزانین هۆی ناکامییە |

## گوڵی چلهەم ـ گوڵی شەرم و حەیا

وەنەوشەی باخان چونکە بەشەرمە
لەناو گوڵانا شۆرەتی گەرمە
بە تەڕێ بەستەی دەستی دڵبەرە
بە وشکێ دەوای ئازاری سەرە

پێغەمبەر ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی :

**اَلحَیاءُ مِنَ الاِیمانِ .**

واتە : شەرمکردن لە ئیمانەوەیە .

شەرم صیفەتێکە ئادەمیزاد ئەگێرێتەوە لە وتار و کرداری ناپەسەند ، واتە ئەوەی شەرمبکا ، قسەیەك و کردەوەیەکیوای لێ ناوەشێتەوە بە سەنگ و ترازوی کۆمەڵ ناپەسەند بێ و ، هەر مەبەستێکی هەبێ بە شێوەیەك هەوڵی بۆئەدا لەگەڵ عەقڵدا بگونجێ و لە ڕێ و شوێنی هوشیاران دەرنەچێ و لەوانە نەبێ هیچ ئینسانێکی ژێر ڕەخنەی لێ بگرێ . ئیتر مەعنای شەرم ئەوە نیە ئینسان لەبەر بێهێزێ نەفس نەتوانێ مەبەستی خۆی جێبەجێ بکا ، چونکە وەزعیوا بە جۆرە نەخۆشییەك ئەدرێتە قەڵەم .

شەرم لقی زۆرە وەك شەرم لە موقەددەساتی ئاینێ وەکو خوا و پێغەمبەر و قورئان و حەدیث و شەریعەت و ئایین و پێشەوایانی ئایین و پیاوانی لەخواترس و خواپەرست . هەروەها وەك شەرم لە مامۆستای زانا و باوك و دایك و خزم و کەسوکاری لە خۆ گەورەتر بەوجۆرە کە لە ڕێگادا لێیان پێشنەکەوێ و لە مەجلیسدا نەچێتە لای سەرویان و ئەگەر فەرمانێکیان پیادای بەقەدەر توانا بەجێیبێنێ و گوێی بۆ بگرێ و بە گەپ و گاڵتە و هەرا و جەدەل ڕوبەڕویان نەکەی. لقێکیتری شەرم ئەوەیە ئینسان لەکاتی قسەکردنا دەنگی نزم بێ و ، لە قسەی بێنەزاکەتی شەرمهاوەر خۆی بپارێزێ و ، لەخۆیەوە قسەی بێموناسەبە نەکا و، لە وەڵامی خەڵکا قسە بەقەدەر پێویست بکا و، کە پرسیاری لە کەسێك کرد ڕاوەستێ تا کابرا وەڵامەکەی ئەداتەوە و ، لەپێش تەواوبونی وەڵامەکەدا بەربەرچی نەداتەوە تا قسەکەی لێ تێكنەدا و ، ئەگەر کەسێك پرسیارێکی لە کەسێك کرد ئەم خۆی تێهەڵنەقورتێنێ و قسە تێهەڵکیشی قسەی خەڵك نەکا .

لقێکیتری شەرم ئەوەیە ئینسان لەکاتی هێرشی ڕقدا قسەی بێئەدەبانەی وەك جنێو و قسەی تاڵ و سوێر بەدەمیا نەیەت . یا ئەگەر کەسێك یا کۆمەڵێك هاتن بۆ دیدەنی حورمەتیان بگرێ و لەبەر ناچارێ نەبێ بەجێیان نەهێڵێ و کەسێکی بەئەدەب دانێ خزمەتیان بکا و ، وەکو بەرەوڕۆ حورمەتی خەڵك ئەگرێ لە پاش ملەیش حورمەتیان بگرێ تا شەرمەکەی نەبێ بە نیفاق . لقێکیتری

موهیممیشی ئەوەیە هەرچەند بۆی بکرێ لە هەمو حاڵێکدا ئاگای لە خوا بێ و بێ فەرمانی نەکا . جا لەبەرئەوەیە کە شەرم و خواپەرستی لەیەك جوێ ناکرێنەوە پێغەمبەر درۆدی خـوای لێ بێ فەرموویەتی : « اَلْحَیاءُ وَالاِیمانُ فی قَرَنٍ فَاِذا ذَهَبَ اَحَدُهُما تَبِعَهُ الآخَرُ » واتە : حەیا و موسوڵمانەتی پێکەوەن ، کە یەکێکیان فەوتا ئەویشیان ئەڕوا بەدوایا .

یەکێ لە زانایان وتوویە هەر لەشێ بـەرگی شـەرم لـەبەر بـکا عەیبی دەرناکەوێ و ، سەرگەورەی هەمو جۆرەکانی شـەرمیش شەرم‌کردنە لە خوا .

( شکۆ )یش ئەوەیە ئینسان لە قسەدا نەرم و ئارام و لە ڕێگە ڕۆیشتندا هێمن بێ و ، لەگەڵ کەسانی بێ‌نرخ و بێ‌قیمەتدا هاتوچـۆ نەکا و ، نـەڕوا بۆ شوێنێ‌وا گومانی خراپی پێ ببرێ و ، گاڵتە و یاری کەم بێ و ، ئەگەر نەفامێك قسەی توند و زبری لەڕوودا کرد وەڵامی نەداتەوە و ، ئەگەر لە ئیشـێکی سووك ئاگادار بۆ خـۆی لێ هەڵـە بـکا و ئەوەنـدە لێی دوور بکەوێتـەوە وەك هـەر پێی‌نەزانیبێ و ، زۆر بە پارێزەوە تەمێی ئینسانی نەفام و بێ‌دین بکا .

ڕۆڵەکەی خاوەن حەیا و شەرمەکەم
ئـارام کردەوە و وتـار نـەرمەکەم
شێوەی ئـادەمی شـەرم و حەیـایە
ئینسانی بەشـەرم دۆستی خودایـە
ناسـکی و نەرمی و لـەطافەت‌کاری
ئینسان ئـەبەنە پلـەی سـەرداری
هەرکەس شەرمی‌کرد لەخودای عالەم
شەرمی لێ‌ئەکەن گشت بەنی‌ئـادەم
پەڕندەی دەشت و دڕندەی کۆسار
بە داوی شـەرمی ئـەبن گوروفتار
پیاوی بە حەیا و بە شەرم و شـکۆ
پایـەی بلنـدە وەکو لوتکـەی کـۆ
مەردی بێ‌شکۆ هـەرچەند شـایێکە
قیمەت و پایـەی وەك هێ گایێـکە
ئـەوانەی خـاوەن شەرمن و حەیـا
دڵیان ڕۆناکـە بـە نـوری خـودا
خودا بـە یومنی سـیمای دڵپاکان
بمـانژمێـرێ لـە دڵ ڕۆنـاکـان
بـەڵکو بـە نوری دەروونی ( نـامی )
وەربگرین فەیضی دینـی ئیسـلامی

## گوڵی چل‌ویەکەم ـ گوڵی دڵ‌نەرمی

بە دوو بـاڵی پـان ئـەفڕێ ئـادەمی
بـاڵی دڵ‌گەرمـی و بـاڵی دڵ‌نەرمی
دڵ‌نـەرمی لەگەڵ دامـاوانی کـەل
دڵ‌گەرمی لەبـۆ دڵسـۆزی و عەمەل

پێغەمبەر ، درۆدی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی :

**الرّاحِمونَ یَرْحَمُهُمُ الرَّحْمـانُ**

واتە : ئەوکەسانەی لەگەڵ خەڵکدا میهرەبانن ، خوایش لەگـەڵ ئـەوان میهرەبـان ئەبێ .

دڵنەرمیی یەکێکە لەو خووە جوانانەی کە ئەبێ لە ئادەمیزاددا هەبن و ئەبن بەهۆی بەختیاری لە دین و لە ژیانا و ئەبن بە مایەی سەربەرزیی خاوەنەکەیان و ئاسایشی ناو کۆمەڵیان پێ مسۆگەر ئەکرێ . گەلێ لەو کارەساتە نابارانە کە ڕوئەدەن ، بەهۆی دڵڕەقیی و قسەی ناشیرین و ناپاسەندەوە ڕوئەدەن کە لەگەڵ کەسێکدا ئەکرێن . ئەگەر ئەودوانە لەوکاتەدا خۆیان بگرتایە ، ئەو کارەساتانە ڕوویان نەئەدا .

دڵنەرمیی وەك دارێکی ئەستووری ڕیشە داکوتاو وایە چڵوپۆپی زۆری لێ بوبێتەوە و سێبەری بە هەمولایەکدا بکات و خەڵکێکی زۆر لە سایەیدا بحەسێنەوە . لەو لقانەیە دڵسۆزیی و ، ڕوخۆشیی و ، قسەخۆشیی و ، مۆڵەتی قەرزار و ، بەخشش بە داماوانی ڕۆزگار و ، چاوپۆشیی لە هەڵە و بەکارنەهێنانی هێز و زۆر . ئادەمیزاد کە دڵی نەرم بو هەرکەسێکی داماوی دێ بەزەیی پیا دێتەوە و بەپێی توانا یارمەتی ئەدا . ئەگەر شەلێ ، کوێریی ، نەخۆشێ ، هەتیوێ ، پیرەژنێ ، بێکەسێ ، بێدەستێکی دێ بەپێی ڕێکەوت و توانا هەوڵیان بۆ ئەدا و بەم هەوڵدانە بەفریایان ئەگا و سەربەرزیی دنیا و قیامەتیش بۆ خۆی دابین ئەکا .

میهرەبانیی و دڵنەرمیی مایەی ڕاگرتنی دنیا و پەروەردە کردنی منالی ورد و دەرمانکردنی نەخۆش و تیمارکردنی زامارە . بەهۆی میهرەبانیی ئینسانەوە لەگەڵ گیانلەبەران ، خوای تەعالایش میهرەبانیی لەگەڵ ئینساندا ئەکا . پێغەمبەر ، درودی خوای لێ بێ فەرموێەتی : « ارْحَموا تُرْحَموا » . واتە : میهرەبانیی لەگەڵ مەخلوقاتی خوادا بکەن ، تا میهرەبانییش لەگەڵ ئێوە بکرێ ، مەبەستی لەوەیە تا خوایش ڕەحم بە ئێوە بکا . هەر لەبەر زۆریی میهرەبانیی خوایە لەگەڵ گیانلەبەران ، بەتایبەتیی لەگەڵ ئادەمیزاد و نەخوازەڵا لەگەڵ موسوڵمانانا ، خوای تەعالا لە سەرەتای هەمو سورەتێکی قورئانەوە ئایەتی « بسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ »ی داناوە کە واتە دەست ئەکەم بەمکارە بە پیرۆزیی ناوی ئەو خوداوە کە میهرەبانە لەگەڵ هەمو گیانلەبەران لە دنیا و لە قیامەتا ، بۆئەوەی کە میهرەبانیی خوا لە هەمو موناسەبەیەك و لە هەمو سورەتێکدا دەرکەوێ بۆ هەرکەسێ کە پەیوەندی بە تەمێ و پەروەردەکردنەوە هەبێ .

میهرەبانیی جگە لە پاداشی چاکی قیامەت ، ئەبێ بەهۆی ئاسایش و ئارامیی جیهان و قانون و نیظام وەرگرتنی خەڵکیش . بەنمونە ئەگەر داماوێك ڕوی کردە شوێنێك ، مادەم کەسێك هەبێ چاودێریی بکا و ڕێگای ژیانی پێ نیشانبدا ، ئەو داماوە ئەحەسێتەوە و چاوی ئەکرێتەوە و خوی و خێزانی ئەژیێنێ و سوپاسی کابرای ڕێگا پیشاندەریش ئەکا . خۆ ئەگەر کەس گوێی

نەداین ، ئـەوا چەواشە و چوارچاو ئـەبێ و دنیای لێ تاریـك دادێ . جا ئەگەر مەیدانی کار و کاسبێ لێ گیرا و ڕێی نەبێ دەست بۆ هیچ کارێ ڕاکێشێ، ئەوا بە ناچارێ دەست ئەکا بە دزێ و درۆزنێ و پیاوکوژێ و دەسـتبڕین و ، ئەگەر لەناو شاردا مەیدانی ئەوەی نەبێ ئەوا ئەڕواتـە دەرەوە بۆ جـەردەیێ و خەڵك ڕوتکردنەوە و کوشتن و ماڵبردن و ڕێگا لە ڕێبوار ئـەبڕێ و وانەبێ کەسانی وەك خۆیشی ئەچنە پاڵی و پێکڕا ئاشوبێکی گەورە لە وڵاتدا ئەنێنەوە .

ئادەمیزاد کە دڵی نەرم بێ ڕوخۆش و قسەخۆش ئەبێ و خەڵك ئولفەتی پێوە ئەگرن و خۆشـیان ئەوێ . جا ئەگەر گەدا و داماو بێ جێـگەی خۆی لـەناو دڵـی ئەنـدامانی کۆمـەڵدا ئەکاتـەوە . ئـەگەر پیشـەوەریش بـێ خەڵکی لێ کۆئەبنـەوە و بۆ ئیش و کـاری خۆیان ڕوی تێئەکـەن و سودی ئەگەیەنێ و سودی لێ وەرئەگرن . ئەگەر هونەرمەند و زانا بێ قوتابێ زۆری لەدەور کۆئەبێتـەوە . ئەگەر سەرۆك و فەرمـاندەریش بێ کۆمـەڵ ملی بۆ ڕائەکێشێ و خەڵـك بە دڵ ئیشی بۆ ئەکەن بەڵکو خۆیان ئەکـەن بە قوربانێ لەبەر پێیدا . خوا فەرموێەتی بە پێغەمبەر : « فَبِما رَحْمَةٍ مِنْ اللهِ لِنْتَ لَهُم ، وَلَـوْ كُنْتَ فَظّاً غَلِيظَ القَلْبِ لاَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِـكَ » واتە : بەهۆی ئەو میهرەبانییەوە کە لەلایەنی خواوە پێت دراوە ، دڵت بۆ هاوڕێکانت نەرمبوە . ئەگەر بنیادەمێکی مۆن و دڵڕەق بوێتایە خەڵك ئولفەتت پێوە نەگرن ، ئەو هاوڕێیانەت بڵاوەیان لێ ئەکرد و بەدەورتدا نەئەمان .

دڵنەرمێ لقی زۆرە ، گەورەتریان دڵنەرمێ پیاوی بەدەسەڵاتە ، ئەمجار دڵنەرمێ مامۆستای قوتابێ ، ئەمجار دڵنەرمێ ئینسـانی دارای خاوەن مایە و پایە ، چونکە تا ئینسان دەسەڵاتی زۆرتر بێ دەستە و بەستەی زۆرتر ئەبێ . تا دەستە و بەسـتەشی زۆرتر بێ دڵنـەرمێ بێ پێویسـتترە . لـە هەمو دڵنەرمییەکیش پێویستتر دڵنەرمییە لەگەڵ ئینسـانی بێدەستدا وەك قەرزاری نابوتکـەوتو و پیـاوی خێزانـداری بێکاسـبێ و هەتیـوی بێکـەس و بێسەرپەرشتێکەر . بەڵام لە هەمو سورەتێکی دڵنەرمێ و چاوپۆشیدا ئەبێ ئینسان لە ئوسـوڵی دین دەرنەچێ ، بەتایبـەتێ پێویستە دڵنـەرمێ لەگەڵ کەسێکیوادا نەبێ کە ئەگەر ڕزگار بۆ دیسانەوە ببێتەوە بەهۆی تێکدانی دین و بەهۆی ئاشوبی دنیا ، چونکە چاکە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا خراپەیە لەگەڵ دین و جیهان و کۆمەڵدا .

ڕۆڵەی خۆشەویست دڵنەرمی مەردم | شێری بەشـکۆی ڕۆژی نەبـەردم
مەردێ بۆ ئینسان ڕەوشتێ بەرزە | ڕەوشتی بەرزیش خۆشێ ڕوی ئەرزە
لەم ڕەوشتانا دڵنـەرمێ ئینسـان | ئینسـان ئەباتە مەرتـەبەی شاهان
هەر بە دڵنەرمێ و چـاکە بۆ داماو | ئەڕژێ بەسەرتا ڕەحمەت وەك سێڵاو

حازر بە لەبۆ دەرمانی دەردی — ڕزگاری بکە گەر ڕاستە مەردی
قسەم ئاشکرا دا بەدەستەوە — ڕۆی خۆش هاتوە لە بەهەشتەوە
کاتێ هاتەلات شەخصی لێقەوماو — بە جۆشی سینە و بە کزەی هەناو
من ئامۆژگاریم بۆ سودی تۆیە — خولقت گەنم بێ کە نانت جۆیە
مەبەست هەرتەنیا ئاو و نان نیە — مەبەست لە دیدار میهرەبانییە
ئاوی سویر و تاڵ لە دەستی خۆش ڕۆ — نەك ئاوی زولاڵ لای شەخصی بەدخۆ
بە صەرفی نەظەر لە تاوانباری — ڕەحمەتی خودات لەسەر ئەباری
ئەگەر شەخصێکی بێ ڕەنگ و بێ بۆ — بە هیوا و پەنا هاتە ماڵی تۆ
باش وەری بگرە و مەرحەبای بکە — بە دۆ قسەی خۆش ئاشنای بکە
بە تەنگی خولقی سەرۆك و سەردار — ژینیان تاڵ ئەبێ بەرەی دەردەدار
بەرزێ مەرتەبەی عەفوی گوناهێ — ئەگاتە بەرزێ مەرتەبەی شاهێ
مادەم ئینسانی بە شێوە و بە ڕەنگ — دلت ڕەق نەبێ وەکو سیاسەنگ
ئەبێ بزانێ بناغەی ئیسلام — لەسەر ڕەحمەتە لەبۆ خاص و عام
سورەتەکانی قورئانی کەریم — سەریان بیسمیللا و ڕەحمانە و ڕەحیم
یەعنێ ڕەحمەتی خودا کاملە — بۆ سەر ئەم خەلقە هەمۆی شاملە
ئەمەیە دەرسی مامۆستای ( نامێ ) — عەینی ڕەحمەتە دینی ئیسلامێ

## گوڵی چلودوهەم ـ گوڵی خزم دۆستێ

**خزم دۆستەکان بە میهرەبانێ**
**مایەی پیرۆزین بۆ زیندەگانێ**
**هوشیار بێگانە ئەگا بە برا**
**چۆن برا ناگا بە برای گیانێ !**

خوای تەعالا لە قورئانا فەرموێەتی :

**قُلْ لا اسألُكُمْ عَلَيهِ اجراً الا المَوَدَّةَ فِي القُربى**

واتە : ئەی پێغەمبەر بە کافرەکان بڵێ من لەسەر ئەم ئامۆژگاریێ کردنەم بۆ ئێوە ، هیچ کرێیەکم لێتان ناوێ ، ئەوە نەبێ کە لەگەڵ خزمی خۆتاندا دۆست بن .

هەروەها فەرموێەتی :

**وَاُولُوا الارحامِ بَعضُهُمْ اَولى بِبَعضٍ فِي كِتابِ اللهِ .**

واتە : ئەوانەی خزمیان هەیە هەندێکیان لە هەندێکی تریان نزیکترن لەوانی تریانەوە . بەمەعنا کامیان نزیکتر بن ، شایانترن بە چاودێرێ .

خزم دۆستی ئەوەیە ئینسان بەرابەر بەوکەسانەی لە ڕشتەی نەسەب و بنەچەدا ئەبنەوە بە یەك و ئەوکەسانەی بەهۆی ژن و ژنخوازەوە بوون بە خزم ، بەپێی ڕێکەوت و توانا و بۆلوان یارمەتی و دەسگرۆیی بەکاربێنێ .

خوای تەعالا ڕشتەی هۆنراوەی هەمو نەوعی بەنیئادەمی لە تاقە پیاو و ژنێ ڕێکخستوە . هەمو گیانلەبەرێ ژیانی خۆشئەوێ وەك چۆن هەمو ئادەمیزادێ پایە و شانیشی بۆ خۆی پێئەوێ بۆئەوەی خۆیان بپارێزن لە فەوتان و بەرباد بون . هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە هەر چەند بنەماڵەیەك یەکیانگرتوە بۆئەوەی هێزیان بێ بۆ پاراستنی خۆیان ، هەروا هەر چەند بنەماڵەیەکیش کە لە باپیرە گەورەدا یەكبگرنەوە کەوتونەتە یەك و بە هۆزێ ناوبراون بۆئەوەی هێزیان زۆرتر بێ و خۆیان بپارێزن لە دەستدرێژی دوژمن . بینا لەسەر ئەمە ، کە ئەڕوانین یەکەم تاقمێ کە خزمەتی ژیانی ئینسان بکات خزم و خوێشە . بۆیە پێویستە تۆلەی ئەم چاکەیەیان بدرێتەوە بە یارمەتی و دەسگرۆیی کردن .

لەلایەکیتریشەوە ئەم خزمانە لەبەرئەوەی کە نزیکن لە یەك و هاتوچۆی لای یەکتر ئەکەن ، لە هەموکەسێ زۆرتر خزمەتی شەخصی ئینسان ئەکەن و زۆرتر خۆشەویستییان بۆ یەك هەیە . کەواتە زۆر لە ویژدان دورە و لەگەڵ ئینساف ناجۆرە ئینسان بەرابەر بەمانە بێموبالاتی بکا ، بەڵکو پێویستی ئینسانییەت و ئیسلامەتی و پیاوەتییە بەپێی توانا و دەسەڵات خزمەت بکرێن و ، ئەگەر حاڵ و ماڵ ڕەسایی نەبو بنیادەم خزمەت بەهەموییان بکا ، کامیان نزیکترە و لە نزیکەکانیشیاندا کامیان موستەحەقترە خزمەت بەوەیان بکا . ئەگەر وایش ڕێکەوت کە ئینسان ماڵی دنیای نەبو بیانداتێ ، بە خۆوڕەوشتی باش و بە نامە ناردن و سەرلێدان بەسەریانبکاتەوە و دڵیان ڕابگرێ . بەکورتی ڕێگای خزم دۆستی زۆرە، ئینسان هەرکامیانی بۆ ڕێکەوت ، بەجێیبێنێ و بەوە خزمەتی بە دینی پیرۆزی ئیسلام کردوە و کارێکی بەسودی بۆ دنیا و قیامەتی خۆی بەجێهێناوە . پێغەمبەر ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی : « صِلَةُ الرَّحِمِ وَحُسْنُ الخُلُقِ وَحُسْنُ الجِوارِ يُعَمِّرْنَ الدِّيارَ وَيَزِدْنَ فِي الأعمارَ » واتە : خزمەتی خزم و خوێش و خۆوڕەوشتی جوان و دراوسێ پەرستی ئەبن بەهۆی ئاوەدانبونەوەی وڵات و زیادبونی عومری ئەوکەسانەی خاوەنی ئەو سیفەتانەن .

| | |
|---|---|
| **ڕۆڵە دڵبەندە پایەدارەکەم** | **جێگای ئومێدی ڕۆژگارەکەم** |
| **کەس لە جیهانا ناچێ بە عەبەس** | **ڕەنجێ بکێشێ بێسود و مەبەس** |
| **دەشتەوان ئەچێ تۆو ئەکاتە خاك** | **ئەیەوێ بژێ بە ژینێکی چاك** |
| **باخەوان ئەڕوا نەمام ئەنێژێ** | **چەند ساڵ لەگەڵیا ئارەق ئەڕێژێ** |

هیوای ئەوەیە پاش ماوەی چەند ساڵ    خۆشیی وەربگرێ لە میوەی حەڵاڵ
هاوڕشتەکانت لە خزم و لە خوێش    کە بۆ ژینی تۆ ئەبن بە دەروێش
هەلهەلە ئەکەن بە کۆمەڵ هەموان :    خوا کوڕێکی نوێی بەخشیوە پێمان
دێن ئێشك ئەگرن حەفتەیێ تەواو    ذیکر و تەلیلەیش ئەکەن ناوبەناو
حەیوان سەرئەبڕن مەولوود ئەخوێنن    ئوسوولی حەوتم بەجێ ئەهێنن
مەلایش ئەخوێنێ بەگوێرەی عادەت    بانگ بەگوێی ڕاستتاو بەچەپتا قامەت
جا یا بە قورعە یا حەزی خۆیان    ناوت لێ‌ئەنێن ناوێکی زۆر جوان
ئەمە گشت لەبەر ئەوەیە کەوا    دوازۆژ بۆ هەموان بێ بە پەنا
کوڕێکی وابێ ئازا و بەغیرەت    بێ بە مایەی پیاوەتێ و خزمەت
بەر لە هەموکەس بۆ خزم و خوێشان    ئەوجا بۆ گەل و خاکی نیشتمان
ئیتر مەپرسە لە خوشك و پوورت    ئەکەونە سەما لە خوار و ژوورت
توخوا ویژدانە ڕۆڵەی بەتەمکین    سوودیان نەدەیتێ بۆ دنیا و بۆ دین
نەبێ بە دەرمان بۆ زامی دڵیان    نەبێ بە چارەی گرێ و موشکولیان
من هیوام وایە ڕۆڵەی گیرامێ    تۆ ڕۆڵەیەك بێ بە سوود و ( نامێ )
سوودت بۆ گەل و نیشتمان زۆر بێ    زۆر بەکەلکیش بێ نەك زۆر و بۆر بێ
ئەمجا بەتایبەت بۆ خزم و بۆ کەس    لە تەنگییاندا بێ بە فریادڕەس
ئەوکەسەی دڵی خزم خۆش‌ئەکا    پاش مەرگ (شرابا طهورا) نۆش ئەکا
چونکە لە ژینا مەردی مەیدانە    حەشریشی لەگەڵ گەورە مەردانە
مەخصوص بۆدایكو بۆخوشکی داماو    بۆ پوور و پوورزای گەدای لێ قەوماو
ئەمانە هەموو چاوەڕوانی تۆن    تینۆی سەرچاوەی پڕ ئیحسانی تۆن
مادەم ئەمانە تێراو بوون لە تۆ    خەڵاتی خێرت بۆ دێ نۆ بە نۆ

* * *

ئەوکەسەی کەوا ڕژد و دەس وشکە    هۆی نائومێدێ دایك و خوشکە
دیارە وەجاخی کوێر ئەبێتەوە    خۆیشی لەو نانەی ناحەسێتەوە
هەناسەی ساردی خزمانی گەدا    زۆر زوو ئەگاتە بارەگای خودا
دادی خۆی ئەکا لای پەروەردگار    لەبەر بێ‌ڕەحمێ خزمی نالەبار
جوابیش وەرئەگرێ لەخودای قەهار    کە بێ‌دەنگ نابێ قەت لە ستەمکار

* * *

وەرە سەیری ئەم داد و بێ‌دادە    خوا فریادڕەسە بۆ ئەم فریادە
بێ‌ڕەحمان ئەبێ چۆن بێن ڕزگار    لە داوی قەهری خودای کردگار
خوایە بە ئیحسان بە شێوەی کەماڵ    بمانهێنە سەر پرسینی ئەحواڵ
تا خزمان دڵیان لێمان ڕازێ بێ    بەڵکو ئاخرمان سەرفرازێ بێ
بە مایەی نووری حەزرەتی (نامێ)    بە پایەی فەیضی دینی ئیسلامێ

# گوڵی چلوسێیەم ـ گوڵی دراوسێ پەرستی

ئەوکەسەی خـودا بە حەق ئەناسێ
ڕەوشتی باشـە لـەگەڵ دراوسـێ
ئەوەی ناپرسـێ لـە دراوسێی خۆی
دیـارە حورمەتی خۆیشـی ناناسـێ

پێغەمبەری نازدار ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی :

**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ**

واتە : ئەوکەسەی باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی قیامـەت هـەیە پێویستە حورمەتی دراوسێی خۆی بگرێ .

ڕاگرتنی حەقی دراوسێ یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئادەمیزاد . ئـەم ڕەوشتە لە ئایینی ئیسلامدا زۆر بەرز و بەنرخە و جیاوازێ لەوەدا نیـە کەوا دراوسێکە ماڵی لەنزیك ماڵتەوە بێ یا نە و خزمت بێ یا نە . خوا لـە قورئاندا فەرمویەتی : وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ . واتە : چاکە بکەن لەگەڵ دراوسێی نزیکدا خواه بە خزمایـەتی نزیك بێ یا بـە ماڵ . لـەگەڵ دراوسێی دوریشدا خواه بە خزمایەتی دور بێ یا بە ماڵ . پێغەمبەریش درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : دراوسێ کە خزمیش بێ و موسوڵمانیش بێ سێ حەقی بەسەر ئینسانەوە هەیە ، حەقی دراوسێتی و حەقی خزمایەتی و حەقی موسوڵمانەتی . دراوسێی کافریش حەقێکی هەیە کە بریتییە لـە تـەنها حەقی دراوسـێتی . هەروەها پێغەمبـەر فەرمویەتی : مـازالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ . واتە : جیبرەئیل ئەوەنـدە زۆر لەبابەتی دراوسێ دۆستییەوە قسەی بۆ کردوم وامئەزانی کە دراوسێ مرد دراوسێکەی میراتی لێ ئەبا .

چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ لقی زۆری لێ ئەبێتەوە وەکو ئەوە کە نەهێڵی ستەمی لێ بکرێ و شەرەفی بشکێنن ، یا کە کەوتە تەنگو چەڵەمەیەکەوە یارمەتی بدەی ، یا قەرزی کەسێکی کەوتەسەر هەوڵبدەی قەرزەکەی بۆ بدەیتەوە ، یا کە برسێ بۆ هەوڵبدەی بۆ تێرکردنی، یا کە نەخۆش کەوت بچێ سەری لێبدەی و دوکتۆری بێنیتە سەر و دەرمانی بۆ بکڕێ ، یا کە مردویەکی مرد نان و چێشتیان بۆ بکەی ، یا کە چو بۆ سەفەرێك ئاگاداری و سەرپەرشتی مـاڵ و منالەکەی بکەی تا خۆی دێتـەوە ، یـا کـە منالـەکانی بێشەرمییەکیان لەگـەڵ کردی چاوپۆشییان لێ بکەی و بە هێمنی ئامۆژگارییان بکەی و، تەمێی منالەکانی خۆت بکەی کە دڵی نەیەشێنن ، یا کە دیارییەکی کەمیابیان بۆ هێنای بەشی بدەی لێی،

یا ئەگەر عەیب و عارێکی بەسەردا هات هەوڵبدەی بۆی داپۆشی و بیشاریتەوە، یا ئەگەر کردارێکی چاکی‌کرد هەوڵ بدەی دەنگوباسی ئەو کردارەی بڵاوبکەیتەوە. ئاشکرایشە ئەم ئیشانە هەمو بەسراون بەتواناوە و لە سنوری دەسەڵاتدا پێویستە بکرێن .

( بێداری ) ئەم جۆرە چاکەکردنانەی باسمان‌کردن ، بەرابەر بە دراوسێی باش ئازایەتییەکی ئەوتۆیان تیا نیە ، چونکە ئەویش هەروا ئەکا لەگەڵ تۆ . مەردی ڕاستەقینە ئەوەیە لەگەڵ دراوسییەکدا بیانکا کە ئەو وانەبێ لەگەڵ ئەم.

ئازاردانی دراوسێ ، بەتایبەتی دراوسێی بێگانە و غەریب یا بێ‌کەس و بێ‌دەسەڵات، لە تاوانە گەورەکانە و لەوانەیە ببێ بەهۆی غەزەبی خوا. پێغەمبەر، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی : لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لا يَأْمَنُ جارُهُ بَوائِقَهُ . واتە : هەرکەسێ دراوسێی ئەمین نەبێ لە کرداری بەدی ئەو ، ئەوکەسە ناچێتە بەهەشت . بەم‌مەعنا ئەگەر ئینسان کردەوەی خراپ لەگەڵ دراوسێدا بە حەڵاڵ بزانێ ئەوە کافر ئەبێ و کافریش ناڕواتە بەهەشت . ئەگەر بە حەرامیشی بزانێ و بیکا ناچێتە بەهەشت تا سزای ئەو گوناهەی ئەچەژێ ، مەگەر بە ئیحسانی خوا خۆی بەر عەفو بکەوێ یا تکایەکی بۆ بکرێ ، یاخود مەبەست لەوەیە کە خراپەکردن لەگەڵ دراوسێ گوناهێکی ئێجگار گەورەیە . بۆیە ئەگەر موسوڵمانان لەناو خۆیانا بەپێی ئەم ڕێ و شوێنە بجوڵانایەتەوە کە ئایینی ئیسلام بۆی داناون ، ئەبون بە خێزانێکی بەختەوەر و بە شادی و خۆشی بۆ خۆیان پێکەوە ئەژیان ، بەڵام بەداخەوە لەم شارێیەی ژیان لایاندا و ئەوەش یەکێ بۆ لە هۆیەکانی ئەو وەزعەی ئیستا تیایدان .

ڕۆڵەم ! ئەوکەسەی خودا بناسێ — ڕەوشتی باشە لەگەڵ دراوسێ
یاخود قەدری خۆی بە راستی بگرێ — قەدری دراوسێیش بە ڕاستی ئەگرێ
لەگەڵ دراوسێ شیرینی ڕەوشت — کلیلی دەستتە بۆ دەرگای بەهەشت
کێیش کاری لەگەڵ دراوسێ پەستە — نە خوا ئەناسێ و نە حەق‌پەرستە
دراوسێ کەوا پێی خۆی لار دانێ — بۆ دۆزەخ ئەبێ ڕێگا نازانێ
پیاوی خاوەن دڵ لە گشت لای جیهان — تیشکئەدا هەروەك ئەستێرەی بەیان
تۆیش ئەگەر مەردیو خاوەنی ویژدان — قەدری دراوسێ بگرە وەك مەردان
دراوسێ کە هات خۆی خستە پاڵت — ماڵی خۆی هێنا بن‌دەسی ماڵت
وای‌دانێ پەنای بە تۆ هێنابێ — تۆی بە سەنگەر و قەڵا دانابێ
بۆ پەنا هاوەر ، پیاوی بەکەماڵ — یەکسەر بەخت ئەکا گیانو پایەو ماڵ
تۆیش لەگەڵ ئەودا بە شەرم و تەمکین — ببە بە هاودەم بە قسەی شیرین
ببە بە دەرمان بۆ ئازاری ئەو — بە دڵ تێکۆشە بۆ تیماری ئەو
تۆ لەبۆ ئەوان ، ئەویش لەبۆ تۆ — تۆ وەکوەنەوشەو ئەویش وەکشەوبۆ
بۆنی خۆش بەرن بیەن بە یەکتر — ژینتان بەرنەسەر ڕۆژ لە ڕۆژ خۆشتر

★ ★ ★

منالەکانتان بە پەندی جوان جوان — پەروەردە بکەن صوبح و ئێواران
قسەی جوان وەك نوقڵ بخەنە دەمیان — قسەی جوان بکەن بە مۆچە و ژەمیان
چەندە بەسۆدە ئەو نوقڵە جوانە — ئەینێنە دەمی ئەو مناڵانە
بە لێو ئەیمژن ، بە چاو ئەڕوانن — ئێوەش بە خاوەن نوقڵ ئەزانن
ئا بەمجۆرەیە ئامۆژگاریێ دین — دەر و دراوسێ بەمجۆرە بژین
ئەمەیە دەرسی دین و ئایینم — باش وەریبگرە برای شیرینم
ئەگەر ئەشگاتە ( بەهاری جامێ ) — ئەشێ بۆ پایەی ئەدەبی ( نامێ )
مەبەست لە ( جامێ ) و (نامێ) ئەمەیە — حەق بێتە بەرچاو ، باقێ گەمەیە
جوانێ لە بەرگا مالی بەرچاوە — حەقیقەت ساغێ مەکینەی ناوە
وا داوا ئەکەین لە پەروەردگار — زانای ظاهیر و باطین و ئەسرار
بە سیرڕێ نوری ڕەهبەری نازدار — بمانپارێزێ لە نەفسی بەدکار
زەمانمان بکا بە خامەی نوسین — بۆ نیشاندانی ڕێی خۆش بەختێ ژین

## گوڵی چلوچوارەم ـ گوڵی غەریبنەوازێ و میوانداریێ

بە عورفی پیاوان غەریب و میوان
خۆیان خاوەنن بۆ ماڵ و دیوان
ماڵ بۆ غەریب و بۆ میوان نەبێ
جنۆکە ئەیبا و ئەیدا بە دیوان

پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی :

مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ .

واتە : ئەوەی باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، با حورمەتی میوانی خۆی بگرێ .

لە لایەکیتریشەوە خودای تەعالا ڕێبوار و هەژاری وەك یەك بە هاوبەش داناوە لە خێراتی کۆمەڵەی موسوڵمانانانیدا .

غەریبنەوازێ ئەوەیە بەرابەر بەوکەسەی لە ولاتێ یا شارێ یا دێیەکیترەوە هاتوەتە ماڵت ، یارمەتێ و میهرەبانێ بنوێنێ تا چاوی ئەکرێتەوە و ڕێگا و جێگایەك بۆ خۆی ئەدۆزێتەوە و دەستی ئەچێ بە ئیشێکا ، یا تا کارەکەی مەیسەر ئەبێ و ئەگەڕێتەوە ، یا تا لای تۆ نامێنێ و ئەڕوا بە لایەکیتردا .

غەریبنەوازێ پێویستە بە چەند دەلیل ، یەکەم : ئەوەیە غەریب ئەگەر موسوڵمانە، دیارە موسوڵمان برای موسوڵمانە و حەقی برای دینێ بەسەر برای دینییەوە بەپێی ئایینی ئیسلام جێگای گومان نیە . ئەگەر کافری ئەهلی ذیممە یا

پەنادراو یا پەیمان لەگەڵ کراویشە ، ئەوە مادەم خوێن وماڵی حەرامە لەسەرمان ، حەقی یارمەتی و دەسگرۆییشی هەیە . دۆهەم : ئادەمیزاد بەهۆی ژیان و بەهۆی پێویستی فێربوونی پیشە و زانستەوە ناچارە بۆئەوە کە بڕوا بە وڵاتاندا و زۆر وائەبێ ئەم جۆرەکەسانە یا خەرجییان تەواو ئەبێ یا هەر لە خۆیاندا گەدا و بێدارایین . جا ئەگەر موسولمانان یارمەتییان نەدەن گەلێ سوودی گشتی و فەردیی موسولمانان ئەفەوتێ و دنیا لەڕووی زۆر کەسدا تاریك دایەت . سێهەم : ئادەمیزاد بە ڕێکەوتی ئاشوب و شەڕ و شۆڕ و گرانی و لێقەومان و باوك مردن و شتیوا ئەکەوێتە وڵاتی غەریبی . جا ئەگەر چاودێری غەریب نەکرێ بەشێکی گەورەی ئادەمیزاد ئەفەوتێ . چوارەم : ئادەمیزاد بە میهربانی و دڵسۆزی لە زۆر لە گیانلەبەرانیتر جیا ئەبێتەوە . غەریبیش لەوکەسانەیە کە زۆر پێویستیان بە میهرەبانییە ، چونکە دوورە لە ماڵ و حاڵ و خزم و خوێش و ئاشنا و ، دڵتەنگ و بێتاقەتە و هەرکەس بە قسەیەکی خۆش دڵی شاد بکا زۆر مەمنوون ئەبێ و ئەتوانێ هەوڵێ بدا بۆ کەسبی زانست و فێربوونی پیشە . ڕزگاربوونی ئەویش بۆ باقی میللەت بەسوودە ، کەواتە چاودێری کردنی غەریب کارێکی پێویستە . جا لەسەر ئەم ئەساسانەیە لە دینی ئیسلامدا بڕیار دراوە بەشێ لەزەکاتی ماڵی دەوڵەمەند بدرێ بە ڕێبواران کە دیارە غەریبن بۆئەوەی سەفەرەکەیانی پێ تەواو بکەن .

میوانیش ئەگەر غەریب بێ ، ئەوە باسی غەریب نەوازیمان کرد . ئەگەر غەریبیش نەبێ ، ئەوە یا ناسراوە و بە صیفەتی ناسراوی ئەبێ ئینسان خزمەتی بکا ، یا نەناسراوە و لەمحاڵەدا مادەم ڕووی کردوەتە ماڵی ئینسان ئەبێ ئینسان چەندی لەتواناادا بێ خزمەتی بکا .

**ڕۆڵەی دڵبەندم ، غەریب و میوان — خزمەتیان فەرزە لە ئەستۆی ئینسان**<br>
**صەد ڕەحمەت لەوەی غەریب ئەوازە — چونکە غەریب زۆر بێهاز و بازە**<br>
**بێبرا و باوك ، بێ خزمە و بێخوێش — وێڵ وێڵ ئەگەڕێ بە وێنەی دەروێش**<br>
**چەند نەجیبزادە و ئینسانی مەشهوور — ڕۆنەدا ئەڕوا بۆ وڵاتی دوور**<br>
**جا دائەمێنێ بێدەس و بێکەس — بێیار و کۆمەك بە بێفریادڕەس**<br>
**مەخصوص غەریبی ڕێی خوێندەواری — زانست بۆ میللەت دێنێ بەدیاری**<br>
**لە خۆراواوە هەتا خۆرەڵات — دنیا ئەگەڕێ وڵاتەو وڵات**<br>
**لەمدەر و لەودەر وەرئەگرێ زانست — خۆی فیدا ئەکا هەروەك حەقپەرست**<br>
**وابزانە ئەگەر وریا و لەبیبی — کوڕەکەی خۆتە وا لە غەریبی**<br>
**ساتێ کوڕەکەت کە لێت ببێ ون — دەروونت ئەبێ گشت ئەنجن ئەنجن**<br>
**هەروا باوکی ئەو بە ڕۆژ و بە شەو — خەم بۆ ئەو ئەخوا ، بێ خۆراك و خەو**

★ ★ ★

میوانی زێی کـەوت لـە دیوەخـانت
ئیکرامی میوان بـە دینـی ئیسـلام
مەلێ بـە ناوەخت هاتوەتە سـەرم
قیسمەت هێناویـە بـەو نیوەشەوە

پێویســـتە خولق و ئیکرام و نـانت
با کافریش بێ فەرزە لەســـەر عـام
مـن لـە هـاتنی ئـەو بێخەبـەرم
با نانی تـۆیش بێ ، نصـیبی ئـەوە

★ ★ ★

ئەگەی کە میـوان گەیشـتە مـالت
ئەوکاتـە کـاتی حـال و مـەقامە
ئـەو وا تێئـەگا بـە هـاتنی ئـەو
بـە شەرمەزاری دڵ ئـازاری خۆی

دەس‌کەی بـە هـەرا لەگەڵ منـالت
کـاتی مەرحەبـا و کـاتی سـەلامە
دنیـات لێ بـوە بـە تـاریکەشەو
بە فیزۆ ئەڕوا هـەرچی ئەکەی بۆی

★ ★ ★

گەر بێتو ( بانو ) بێ سەرلێشێوان
بە بێ گۆشت و ڕۆن خۆشـە طەعامی
مادەم میوانیش بـە شەرافەت بـێ
ئـاداب ئەمـەیە کـە تێم‌گەیـانی
( نامێ ) بە غەیری دەرسی شاگردان

سفرە بەڕێی خۆش ڕاخا بۆ میوان
هـەر لفت و گفتی ئـەبێ بـە تامی
ئەبێ چاوی هـەر لە لەطافـەت بـێ
ئیتر هەرکەســێ خـۆی و ویژدانی
مەبەستی نیە لـە چەرخی گـەردان

## گوڵی چل‌وپێنجەم ـ گوڵی دڵپاکی

ئـادەمێ هەرپەند نەوعێـکە خاکی
پایـەی بڵنـدە لەبـەر دڵپـاکی
ئەتـەوێ ببێ بـە ڕۆژی ڕۆنـاك
بـە دڵ تێکۆشـە بـۆ دڵڕۆنـاکی

پێغەمبەر ، درۆدی خوای لێ بێ ، فەرموێەتی بە مەعاذی هاوڕێی :

یا مَعاذُ قَلْبٌ شاكِرٌ وَلِسانٌ ذاكِرٌ وَزَوْجَةٌ صالِحَةٌ تُعِينُكَ عَلى أَمْرِ دِينِكَ وَدُنْياكَ خَيْرُ ما اكْتَنَزَ النّاسُ .

واتە : ئەی مەعاذ دڵێکی پاك و ڕۆناك و نوورانی کە سوپاسی پەروەردگار بکا و زوبانێکی خەریك بە هێنانی ناوی خواوە و ژنێکی باش کە هاودەمی تۆ بێ و یارمەتی بەجێ‌هێنانی کاری دینێ و دنیاییت بدا ، چاکترین شتێکن کە بنیادەم تائیستا بۆ خۆی هەڵی‌گرتبێ .

مەعنای ئەم فەرموودەیە وایە دڵی پـاك و ڕۆناك و زمانی بـە ناوی خواوە خەریك‌بێ و ژنی چاك لە شیر و تیر و زێڕ و زیو و هەمێ گەنجینەیەك چاترن بۆ

ئادەمیزاد ، چونکە سوودیان لە هەموو ئەو شتانە زۆرترە و بەردەوامترن .

لەناو ئەوانەدا کە خوای تەعالا دروستی کردوون و گیانی کردوون بەبەرا ، ئادەمیزادی بەوە هەڵبژاردوە کە بەشێوەی پەیکەرێکی جوان و نازەنین دروستی کردوە و لە پەنامەکیشەوە عەقڵ و هۆشی پێداوە کە مایەی ئەوەیە ئەرز و ئاسمان و وشك و تەڕ و دەریا داگیر بکا و بە تێگەیشتن و پێگەیشتن بەسەر هەموو شتێکی ترا شانازی بکا . ئەم عەقڵ و هۆشەشی لە مێشك و دڵی ئینسانا داناوە بەوجۆرە کە خۆی ئەیزانێ و ئیشارەتی بۆ ئەم مەعنایە کردوە و لە ئایەتێکی قورئاندا فەرموویەتی : « أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ؟ » واتە : ئاخۆ ئەم کافرانە خۆیان بیرناکەنەوە لەم قورئانە کە ئێمە ناردوومانە بۆ موحەممەد ، کە بە لەفظ و مەعنا موعجیزەیە و ڕۆشنترین دەلیلە لەسەر یەکێتی خوا و ناردنی موحەممەد بە پێغەمبەرێتی و ساغی ئایینی ئیسلام ، یاخود قوفڵ لەسەر دڵیان دانراوە و ڕێگای بیر کردنەوەیان نیە و دڵیان لەڕاستی تێناگا . ئەم ئایەتە بەئاشکرا ئەوە ئەگەیەنێ کەوا دڵ پەیوەندی بە تێگەیشتنەوە هەیە . بۆیە دڵ مادەم پاك بکرێتەوە لە ژەنگی بێئاگایی و پڕوپووچی بێکەڵکی هەوایی و لە شوبهە و گومانی گومڕایی ، ئەبێ بەهۆی ڕێکەوتن و سازشی هەموو ئەندامانی لەشی ئینسان و ئەکەونە کار بۆ دابین کردنی بەختیاری بۆی .

یەکەم پایەی دڵپاکی ئەوەیە ئینسان باوەڕێکی پتەوی بە پەروەردگاری خاوەن کەماڵ و بێعەیبی ئەم دنیایە ببێ ، هەروا بە هەرچی کە حەزرەتی موحەممەد لای خواوە هێناویەتی . دووهەم پایەشی ئەوەیە پاك بێ لە خوی خراپی وەك کینە و ڕژدی و ڕق و فێڵبازی و ساختەچیەتی و فیز و خۆپەرستی و ئارەزووبازی و بێپەیمانی و سپڵەیی و دووڕوویی و هەرخویەکی خراپیتر .

لە پێش چاوی ئینسانی هوشیاردا دیارە کەوا خوی پەست خاوەنەکەی ئەگەیەنێتە شانی دڕندە و جانەوەرە زیانبەخشەکان ، بەڵکو لەوەیش خراپتری لێئەکا . کەواتە پێویستە ئینسان هەرچۆن بێ خۆی لەو خووە خراپانە بپارێزێ . مەسەلا وەکو چۆن ئینسان ڕازی نابێ بەوە کە پشکۆیەك لە باخەڵی خۆیدا دابنێ چونکە ئەزانێ ئاگری تێبەرئەدا و ئەیسووتێنێ ، ئەبێ ڕازیش نەبێ کەوا خوی خراپ لە دڵ و بیریدا بمێنێتەوە چونکە زیانی لە ئاگر بۆ ماڵ و گیان کەمتر نیە .

بەئەهمیەتترین هۆی پاك کردنەوەی دڵ هاوڕێیەتی ئینسانی دڵنورانی و هوشیار و پارێزگارە . ئەنجا خەریك بوون بە کردەوەی چاکەوە وەکو خواپەرستی و بەندەیی بۆ خوا وەك نوێژ و ڕۆژوو و تەوافی ماڵی خوا و خوێندنی قورئان و دەرس وتنەوە بە قوتابییان و ئەو شتانەی تر کە بۆ ڕووناکی دڵ بەسوودن .

ڕۆڵەی شیرینی ئاگا لە حاڵم    دڵ بێدارەکەی خاوەن کەماڵم
ئەگەر ئەتەوێ بژیت بەختیار    دڵت پاککەوە لە گەرد و غوبار
یا بە هاوڕێیێ مەردانی دڵپاك    یا بە تاعەتی خودای تەنها و تاك
ئەمجا ئەو نەفسە ئەژدەها سەرە    کە تا عاصێ بێ زۆرتر خەتەرە
دەخیل صەد دەخیل هەروەها زینهار    بەرەڵڵای نەکەیڕەشمەی نەفسی هار
نەفسی بەدسروشت وەك ئەژدەهایە    ژاری کوشندەی لەناو دڵتایە
کانە بۆ هەمۆ پەستێ و بەدخوێێ    ساختە و دەغەڵێ و کینە و دوڕوێێ
درۆ و دوڕوێێ هەم دۆ زوبانێ    پیشەی مەردان نین ئەگەر بزانێ
مەردان بە پاکێ ئەژین و ئەمرن    لە هەردۆ دنیا هاوشانی فەخرن
ئارەزوبازێ و شەهوەت پەرستێ    ئەنجامی نیە بێجگە لە پەستێ
بلێ هەزار ساڵ یەکێ نەخۆش بێ    بە ئارەزۆی خۆی لە عەیش و نۆش بێ
ئەنجامی چیە غەیری بێهۆشێ    سۆکێ و ڕسوایێ و لاتێ و نەخۆشێ
صەدجار داپەڕێ ڕەوشتی پەستێ    هێشتا هەر ئاگا بە خۆپەرستێ
ئەوە چاترە هاودەمی مار بێ    لەگەڵ خودپەرست نەك هاوگوفتار بێ
پیاوی خودپەرست تا ماوە پەستە    نەفسی بتیەتێ و خۆی بتپەرستە
مادّە بناغەی هەمۆ ئەمەیە    بناغەی ئەم گشت دەرد و خەمەیە
شێرێکی ڕۆتە لە ڕاسەری مەرد    ڕەق ئەکا دڵی ئینسان وەکۆ بەرد

★ ★ ★

لە زانایەکیان پرسێ جارێکیان    کە فەرقی مادّە و مەعنا کا بەیان
وتی ئەم قورسە وا لەپالمانا    ئەو سۆکە و ئەمڕوا بەئاسمانا
واتە پایەی ئەم وا لەسەر ئەرزە    ئەو لە ئاسمان ئەوەندە بەرزە
خوا مادّە بگرێ کانێ جێبگرێ    هەزار پایەدار بە بایێ ئەگرێ
لە هەرلا نانێ بێتە ناوناوان    بە گونیە و خەروار زێز ئەبێ تاوان
دەخیل صەد دەخیل بۆ پایە و بۆ نان    ئەبن بە هاوڕێی دەستەی بەدناوان
زۆر کەسیوام دێ دیمەن جەوانمەرد    نانیان بۆ دەرخست دڵی بۆ بە بەرد
زۆریوایش هەیە نە نان نە پایە    دین و باوەڕی نادا بە زایە

★ ★ ★

قەساب بۆ پلە گۆشت گێر و گەڕیەتی    چ باکی چەقۆی ملی مەڕیەتی
پیاوکوژێ کەوا دڵی وەك بەردە    کە بۆ جەردەیێ چۆتە ئەو هەردە
بە دڵیا نایێ لە تالان زیاتر    کەی مەبەستیەتی گریانی تاجر
دز کە دەرئەچێ بەهیوای دەسکەوت    لای ئەو چون یەکە ماڵی تۆ ومزگەوت
جانباز کە ئەڕوا بەدەم گەلەوە    سەرما لێیئەدا بەسەر ملەوە
متمانەی هەیە کەوا سبەینێ    لادییێ داماو هەڵئەخلەتێنێ

حـاکمی خوێنڕێژ کە لای ئەو فەرزە
بەخوێن سوێری کا ڕۆی ئەم سەرئەرزە
گوێ نادا بەوە چەند کەس ئەکوژرێ
چەند منـاڵ بـێ شیر لە دایکی ئەبڕێ
ئەوکەسەی بە شەو ئەڕواتە سەر ماڵ
شەویـان لێ ئەکا بە وەیشوومەی تاڵ
فەخرە لەلای ئەو ئازاردانی خەڵـک
بۆ خۆی دائەنـێ بە خزمەت و کەڵک
خۆی ئەخـاتە بەر لەعنەت و نەفرین
بۆنـەوەی ئـاغەی بڵێ ( ئافەرین )
بەڵام هەرچەندیش کە درێژ بێ ساڵ
ئەو چەرخە ئەڕوا و ئەگۆڕێ ئەحواڵ
ئەمجار مەیدانـی مەحکەمـە و دادە
کە زاڵم خەمگـین ، مەزڵووم دڵشادە
لەسەر کێشانەی حەقی خاوەن حەق
سـزای تـاوانی ئەدرێتـەوە دەق
سەربـاری هەموو عـارەقی نـاوچاو
بە شەرمـەزارێ دەرئەچـێ لەنـاو
لەمـانە بەدتـر لەبـۆ بەدبەختـێ
تاوانبار بوونـە بۆ سـوودی خەڵکـێ
حەدیثی شـەریف جێگەی یەقینـە
( اخسَرُ النّاسِ مَنْ بـاعَ دینَه )



تـاوانێکی‌تر لـەم ڕۆی جیهـانە
تـاوانی شـەخصێ کـە دۆزمـانە
شەخصی دۆزمـان ئەوەنـدە شوومە
لـە هەر لایێ بـێ هەر ئەلێـی بوومە
دۆکەڵی فیتنەی وەک تونـی حەمـام
بەرز ئەبێتەوە بۆسەر خـاص و عام
پیـاوی درۆزن بێ‌ئیعتیبـارە
مەهتـووکی لادێ و بـازاڕی شـارە
ئەگەر ئـاگرێ بەر بـێ لـە مـاڵی
کەس گوێـی ناداتێ و ناپرسێ حاڵی
زیاد لەوەش کە خۆی ئاخر شەڕ ئەکا
خەڵکیش لە یەکتر بێ‌بـاوەڕ ئەکـا
کە دڵـت پـاک بـێ لە خـۆی ئەمانە
دڵپاکێ بـۆ تـۆ مولکـە بیـزانـە
ئەگەرچێ زۆرن ڕەزیلـە و پەسـتێ
هەمووی دێتـە سـەر دنیـا پەرستێ
خـودا بنوێنـێ پێمـان ڕۆنـاکێ
بمـانخاتە سـەر ڕێگـای دڵپـاکێ
بەڵکو ( نـامێ ) بێ درەختـی دڵمـان
سـایەش بێتە سەر ماوا و مەنزڵمان

## گوڵی چلوشەشەم ـ گوڵی داوێن‌پاکێ

بۆ داوێـن پـاکێ وێنـەی دڵپاکـان
بـگرە بە ئیخلاص داوێنـەی چاکان
بەڵکـو بە فەیضـی تەوفیقی خـودا
بگەی بە پلـەی دەروون ڕۆنـاکـان

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرموویەتی :

**قُلْ لِلمؤمنينَ يَغضُّوا منْ ابصارِهمْ ويَحفَظوا فروجَهمْ .**

واتە : ئەی موحەمـەد بە پیـاوە موسوڵمانەکـان بڵێ بەرابـەر بە ژنی نامەحرەم چاوی خۆیان داخەن و عەورەتی خۆیان بپارێزن .

هەروەها فەرمویەتی :

**وَقُلْ لِلمؤمنات يَغضُضْنَ منْ ابصارِهِنِ وَيَحفَظْنَ فُروجَهُنَّ ولا يُبدِينَ زينَتَهُنَّ الا ما ظَهَرَ منها ولْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ على جُيوبِهِنَّ .**

واتە : بە ژنە موسولمانەکان بڵێ چاو کز کەن و نەڕوانن بۆ نامەحرەم و عەورەتی خۆیان بپارێزن و جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی هەر خۆی بەدەرەوەیە و سەر و مل و سنگی خۆیان داپۆشن .

( بزانن ) هەمو گیانلەبەرێ لەوانەی کە زاوزێ ئەکەن خاوەنی هێزی شەهوەتڕانی و ئارەزوی نەفسن لە سروشتدا. ئادەمیزاد کە خوا هەڵیاوێردوە و ئایینی بۆ ناردوە ، فەرمانی دراوەتێ کەوا بە غەیری ئەو یاسا و ئوسوڵە نەجوڵێتەوە کە خوای تەعالا لە مەیدانی پەیوەندی نێر و مێدا دایناوە و ، شوێن ئارەزوی نەفس نەکەوێ بۆئەوە کە نەوەی ئەم و ئەو تێکەڵی یەك نەبن و خانەدان و خێزان تێكنەچێ و ئاشوب نەکەوێتەوە لەناو ئادەمیزاددا .

هەروا بزانن هەرکارێ کە ڕەوا نەبێ ، سەرەتا و پێش قەرەوڵیشی ڕەوا نیە ، مەسەلا هەروەکو زیناکردن و دەستبردن بۆ نامەحرەم کردارێکی تاوان و ئاشەرعییە ، تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم بۆ پیاو و هی پیاوی نامەحرەم بۆ ژن و دەستدان لە لەشی و بەتەنها دانیشتن لەگەڵیدا ، ئەویش تاوان و گوناهە چونکە ئەبن بە سەرەتا و پێشقەرەوڵ بۆ زینا و دەسبردن بۆ نامەحرەم . لەسەر ئەم بناغەیە زانایانی ( أصول الفقه ) وتویانە سەرەتای کرداری واجب مادەم لە ئیختیاری موکەللەفدا بێ واجبە و ، سەرەتای کرداری حەرامیش هەروا حەرامە .

بۆ ئیشارەت بەو ئەنجامە خراپانەی لە تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەمەوە پەیدا ئەبن ، پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « اَلنَّظْرَةُ سَهْمٌ مَسْمُومٌ مِنْ سِهامِ اِبْليسَ » واتە : تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم تیرێکی زەهراویە لە تیرەکانی شەیتان . مەبەستی لەوەیە وەك چۆن ئەو تیرە زەهراوییە ئەگەر بەتەنیا تیژییەکەی و بەو برینەی لە ئینساندا ئەیکا ، ئینسان نەکوژێ ، بە ژاراوییەتەکەی ئەیکوژێ ، هەروەها تەماشاکردنی نامەحرەمیش هەرچەند لە ذاتی خۆیدا تاوانێکی زۆر گەورە نەبێ ، بەڵام بە پەیداکردنی پەیوەند لەنێوان نەفسی ئینسان و ئەوکەسەدا کە بۆی ئەڕوانێ و مانەوەی ئەم پەیوەندە لە دڵدا ، ئینسان خراپ ئەکا و ئامادەی ئەکا بۆ دوبارە کردنەوەی ئەو تەماشایە تا وردە وردە ئەگا بە تاوانی گەورە. هەر لەبەر ئەم ترسەیە دروست نیە پیاو بەتەنها لەگەڵ ژنی نامەحرەمدا دانیشێ چونکە یا ئەکەوێتە تاوانەوە یا گومانی تاوانی پێئەبرێ . هەر لەبەر پەیوەندی نەفسێ پیاو و ئافرەتیشە بەیەکترەوە و لەبەر موسەخخەربونی نەفسی ئینسانە بۆ ئارەزو ، حەزرەت لە گەڵێ حەدیثدا پیاوانی

موسوڵمانانی ترساندوە لە تێکەڵبوّن لەگەڵ ژنان و هەڵخەڵەتانیان پێیان . بە هەرحاڵ داوێنپاکیٖ بە خوّی و سەرەتاکانیەوە کارێکی زوّر بەئەهمیەتە بوّ ئینسانی موسوڵمان .

لە داوێنپاکییە ئەمە کە ئینسان نەڕوانیٖ بوّ حەوشەی ماڵی خەڵك یا بوّ ناو هوّدەی و بوّ هەرکویٖ کە کەسێکی تیا دابنیشیٖ ، بەتایبەتیٖ لە کاتیٖوادا کە کاتیٖ حەسانەوە و خوّ ڕوّتکردنەوە و نوّستن بیٖ . هەروا لەگەڵ نامەحرەمدا سەفەر نەکا. هەروا کە بانگکرا بوّماڵێك بوّ نان خواردن، بە بەهانەی خوّشەویستییەوە تەماشای نامەحرەمی ئەو ماڵە نەکا . ئەمانە هەمیٖ تاوانن و بە بیٖناموّسیٖ و داوێنپیسیٖ ئەدرێنە قەڵەم و بە بیٖشوعوّریٖ ئەژمێردرێن .

داوێنپیسیٖ زەرەری زوّرە بوّ ئادەمیزاد، یەکێکیان ئەوەیە بە تەماشاکردنی نامەحرەم توّوی بیٖشەرمیٖ لە دڵی ئەوکەسەدا ئەچێنریٖ و ئەم تەماشایە مەراقی لەناو دڵدا دروستئەکا تا تەماشاکە دوّبارە و سیٖبارە ئەکاتەوە . دوّهەم مادەم ئەو نامەحرەمە لە پێشچاوی تەماشاکەرەکەدا جوان بیٖ حەسرەت و ئێشێکی زوّر سەخت لە دڵیا پەیدا ئەبیٖ و گەلیٖجار وائەبیٖ ئەبیٖ بەهوّی ناساغیٖ و لەڕ و لاوازیٖ تەماشاکەرەکە . سێهەم : کەسیٖ بوّ نامەحرەم بڕوانیٖ مادەم ئەو نامەحرەمە لە حەلاڵی خوّی جوانتر بیٖ ، ئەبیٖ بەهوّی ساردیٖ لەنێوان تەماشاکەرەکە و حەلاڵەکەی خوّیدا و بەپێچەوانەشەوە، بەمجوّرە لەوانەیە دڵیان لە یەکتریٖ سارد ببێتەوە و ئاشوّب و هەرا لە ماڵا پەیدا ببیٖ لەنێوانیانا و ئەم ئاشوّبە ئەکێشێتەرە بوّئەوە کە لەیەك جویٖ ببنەوە و بنەماڵەی خێزانەکەیان تێكبچیٖ . چوارەم : وائەبیٖ ئەمکەسەکەوا بەردەوام ئەبیٖ لەسەر تەماشاکردنی نامەحرەم ، پەنابەخوا ، توّشی زینا ئەبیٖ کە لە تاوانە گەورەکانە لە شەریعەتیٖ ئیسلامدا و ، لەم تاوانەشەوە چەند زیان پەیدا ئەبیٖ :

یەکەم : فێربوّنی کردەوەیەکی بەد کە لە ئایینی ئیسلامدا لەپاش کوشتن تاوانی یەکەمە . دوّهەم : ڕیٖتیٖچوّنی توّشبوّنی نەخوّشیٖوا کە تیماری زوّر زەحمەت و گران بیٖ . سێهەم : لەدەسچوّنی دارایی ئەوکەسە بە سەرفکردنی لەپێناوی ئارەزوّبازیدا و بوّ تیمار بەنیسبەت ئەوانەیانەوە کە توّشیٖ نەخوّشیٖ خراپ ئەبن . چوارەم : نەمان یا کەمبوّنەوەی پەیوەندی خوّشەویستیٖ لەنێوان ژن و مێرددا . پێنجەم : ئەو هەرا و ئاشوّبەی لەم کردارەوە پەیدا ئەبیٖ لەو وڵاتانەدا کە بە چاوی ڕێز و قەدرەوە تەماشای مەسەلەی شەرەف و ناموّس ئەکەن. جا لە حاڵێکا کە پیاو توّشی ئەم گوناهە گەورەیە ببیٖ لەوانەیە ژنەکەیشی لەبەر ئارەزوّ یا لەبەر توّڵە سەندنەوەی خوّی توّشی ئەم کارە ناپەسەندە ببیٖ .

لەسەر بناغەی ئەم وەزعە نابارەیە کە لەئەنجامی داوێن پیسییەوە پەیدا ئەبیٖ ، لە ئایینی ئیسلامدا بڕیاردراوە ئەگەر کوڕی بیٖژن یا کچی بیٖمێرد ئەم

تاوانەی لێ بوەشێتەوە سەد داری لێ بدرێ و ساڵێکیش دوور بخرێتەوە . ئەگەر لە پیاوی ژن‌دار یا ژنی مێردداریش بوەشێتەوە سەنگەسار بکرێ تا ئەمرێ .. هەر لەبەرئەوەشە کە ئادەمیزاد لەم تاوانە دوور بکەوێتەوە بڕیار دراوە مادەم گەنج ئارەزوی نەفسی پەیدابو و مەسرەفی ژن‌هێنانیشی بو سوننەتە زو ژن بهێنێ . هەروا سوننەتە کچ زو شو بکا واتە پاش باڵغ‌بون ماتڵ نەکرێ و نەهێلرێتەوە . هەروەها بۆیە سوننەتیشە مارەیێ کەم بێ و شیربایێ حەرام کراوە و ئەگەر باوك داوای شیربایێ بکا ویلایەتی بەسەر کچەکەیەوە نامێنێ و تا توبە نەکا بوی ناگەڕێتەوە . سوننەتیشە پاش نیازی ژن هێنان و شوکردنی کوڕ و کچ و بەر لە خوازبێنی کوڕ و کچەکە تەماشای یەکتر بکەن بوئەوە کە ڕێکەوتنەکەیان بە ئارەزوی خویان بێ . هەروەها سوننەتە لەپێشا هەردوکیان لە ڕەوشتی یەکتر بپرسن تا باش لەیەك حاڵی ببن .

بزانن هوی یەکەمی فێربونی داوین‌پیسی بریتییە لە هاوڕێیەتی ئینسانی بێ‌ئەخلاقی ناپاك . بەتایبەتی پێویستە گەنج ، کوڕ بێ یا کچ ، لە عومری چواردە ساڵان بەم‌لاوە تا بە هاوڕێی شەرعی خویان ئەگەن مەجالی ئەوەیان نەدرێ لەگەڵ ئینسانی داوێن‌پیس و بێ‌ناموسدا هاوڕێیەتی و تێکەڵی بکەن . ئامادەیی لاو بو فێربونی ئەخلاقی خراپ لەم تەمەنەدا وەکو گڕگرتنی بەنزینە لە نزیکی ئاگرەوە . هوی دوهەمی فێربونی داوین‌پیسی هاتوچوی ئەو شوێنانەیە کە دیمەنی‌وایان تیا پیشان‌ئەدرێ هانی گەنج ئەدەن بو گرتنەبەری ئەم ڕێگایە وەك هەندێ فلیمی سینەما ، یا ئافرەتیان بەشێوەی‌وا تیا دەرئەکەوێ کە گەنج ئەخاتە سەر ئەم ڕێگایە وەك تیاترۆخانە و شتی‌وا . هوی سێهەمیشی ئەوەیە مەسرەفی ژن‌هێنان گران بێ و کەس‌وکاری ژن داوای خشڵ و کەل‌وپەل و مارەیی زۆر بکەن وەك ئیستا لە زۆر خێزاندا باوە . چوارەم ئەوەیە کەس‌وکار بە زۆر ڕێگا لە کچیان بگرن کە شو بکا بە کەسێ کە موناسبی بێ و ئارەزوی بێ شوی پێ بکا ، یا هەڵی‌بگرن بوئەوەی بە ژن‌بەژن بیدەن بە شو یا بەتەمای پارە و شیربایێ زۆر بیدەن بە کەسێکی پیر و نابار کە کچەکە نەیەوێ .

ڕۆڵەی دڵبەندم سیرەتت ببێ — خولقی ناموس و غیرەتت ببێ
مەشهوری عامە چاو بو بینینە — بو دوزینەوەی ڕێگای یەقینە
بە چاو بڕوانە لەبو ڕێگای ڕاست — جیابکەرەوە مو لە کاسەی ماست
موتاڵای دەرزی پیروزێ ئینسان — بە تەماشایە بو عیلم و عیرفان
نەك بوتەماشای جێی شەرم‌و عەورەت — بون بە حەیوانات پاش ئینسانییەت
عارە بو عاقڵ لەبەر بێ‌کەڵکێ — تەماشای شەرم و ناموسی خەڵکێ
خەیانەت کاری مەینەتە و سزا — لەبو پاشەڕۆژ ئازارە و جەزا
خوا ئەمری داوە بە پیاو و ژنان — کەسیان نەڕوانن بو لەشی ئەویان
نەظەر تیرێکە ژاراوییە و پیس — لە تیرەکانی تیردانی ئیبلیس

★ ★ ★

چاو بۆ لادانە لە کۆسپی سەر ڕێ    نەك بۆ فرمانی بێسوودی بێجێ
چاو بەرەڵلا بێ چاڵ هەڵنەکەنێ    ئیمڕۆ تێی ئەکلێی یاخود سبەینێ
بە وردە وردە دەرچوون بۆ گەورە    بەرز ئەبێتەوە دەورە بە دەورە
کاتێ بۆ گوناه کەوتیتە سەما    ئەوەندەت زانێ شەرەفت نەما
شوشە کە شکا نالکێتەوە    حەیا کە تکا ناگەڕێتەوە
چاو بۆ پارێزە لە بەرد و لاڕێ    هەتا لانەدا ڕێ ڕەو لە شاڕێ
بۆ هێنانەوەی قەدری سەلەفە    لەبۆ نووسینی نامەی شەرەفە
بۆ وەرگرتنی تاجی ڕەئیسێ    نەك وەرگرتنی ڕەزیلە و پیسێ



بە دڵ تێفکرە و بە چاو بڕوانە    ڕێگەکەت لارە یاخود تەختانە
چاك بەلادا کە بۆ شەرەفکارێ    نەك هەرزەکارێ بۆ شەرمەزارێ
با نەکوژێتەوە وەجاخی بەرزت    با نەشکێ شانی نامۆس و عەرزت
بمێنیتەوە بە تەندروستێ    ناساغ نەکەوێ بە ڕەوشت پەستێ
مایەی دارایێ و پایەت بەرجا بێ    پەنات مەڵبەندی تکا و ڕجا بێ
من لەبەر تۆمە ئەم حیکایەتە    تا خۆت لابدەی لەو جینایەتە
( نامێ ) وا ئەڵێ بە داواکردن    داوێنە پاکان لە دنیا فەردن

## گوڵی چل‌وحەوتەم ــ گوڵی دەم‌پاکێ

نیشانەی یەکێ کە دڵی چاکە
یەکەم ئەوەیە کە دەمی پاکە
دەم تەرجومانە بۆ خەزێنەی دڵ
بە خراپ بدوێ یاخود بە چاکە

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرمویە :

**وقولوا لِلناسِ حُسناً**

واتە : قسەی جوان بکەن بۆ خەڵك .

پێغەمبەریش ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەلی :

**قُولُوا خَيْراً تَغْنَمُوا ، وَاسْكُتُوا عَنْ شَرٍّ تَسْلَمُوا**

واتە : قسەی چاك بکەن بۆ خەڵك با قازانجتان دەسگیر ببێ و ، لە قسەی خراپ بێدەنگ بن با بپارێزرێن .

دەم‌پاکێ بریتییە لە پاراستنی دەم لە وتارێ کە بەپێی ئایین ڕەوا نەبێ بوترێ . وتاری‌وا کە ڕەوا نەبێ بوترێ جۆری زۆری هەیە ، گرنگترینیان

ئەمانەن : کوفرکردن ، لەعنەتکردن لە خەڵك ، بوختان ، قسەی خراپ بردن بۆلای پیاوی گەورە کە پێی‌ئەڵێن ( سعایە ) ، قسەهێنان و بردن لەنێوان خەڵکدا بەنیازی تێکدانی بەینیان کە پێی‌ئەڵێن (نمیمە) ، غەیبەت و لە پاشملە قسەکردن، ڕۆشکێنی ، ناتۆرە هەڵدان بەسەر خەڵکدا ، تەعنەدان لە خەڵك ، جنێودان ، شادەکامی‌کردن بەوانەی کە تۆشی دەرد و بەڵایەك ئەبن کە بەعەرەبی پێی‌ئەوترێ ( شماتە ) ، زەم‌کردن بە ناحەق ، تەعریف کردن و بەسەردا هەڵخوێندنی خەڵك بە ناحەق ، درۆ کردن لەبەر هەر هۆیەك بێ .

خوای تەعالا عەقڵ و هۆشی داوە بە ئادەمیزاد بۆئەوەی بزانێ قسەی باش بکا و کرداری باشی لێ بوەشێتەوە . ئایینی بۆ ناردوە بۆئەوەی ، ئەوەی کە چاکە یا خراپە ، سودمەندە یاخود بێ‌سودە لە وتار و کردار بیانزانێ ، لە چاك و سودمەندەکان نزیك بکەوێتەوە و لە خراپ و بێ‌سودەکان خۆی دورخاتەوە . دیارە ئادەمیزاد لە هەمو کاتێکا قسە و کردەوەی ناپەسەند ناکا ، بەڵکو لەکاتێکا ئەیانکا کە بە گومانی خۆی قازانجێکی لێ دەسگیر ببێ وەکو کاتی تەماع و هەوڵدان بۆ پایە و شان ، یا کاتێ بیەوێ خۆی لە زیانێ لابدا وەکو ئەوە کە دوژمنایەتێ و ناحەزێ هەبێ لەگەڵ کەسێکدا و بیەوێ بە وتاری ناشیرین دوری بخاتەوە لە خۆی و دەفعی بکا . ئینسانی موسوڵمان بەپێی دین و ئایین داوای لێ ئەکرێ کەوا بۆ خاتری تەماع یا بۆ دوژمنایەتێ لەگەڵ کەسێکدا لە ڕێگەی شەرع و ئایین لانەدا و قسەی ناڕەوای بەدەمدا نەیەت و کردەوەی ناپەسەند نەکا . جا ئەگەر خۆی لە خۆیدا پەیوەندی لەگەڵ ئایین‌پەرستێ ئەوەندە بەهێز بێ ڕاست بڕوا ئەوە باشە ، ئەگینا بە زۆر نەبێ هەرگیز لە ئارەزوی خۆی لانادا .

بێجگە لەم شتانەی کە وتمانێ چەند شتی‌تر هەیە وتنیان زیانی هەیە بۆ ئینسان وەك سوێندخواردن و تەڵاق‌خواردن و ئاشکراکردنی قسەی پەنامەکی‌وا کە شاردنەوە و نەوتنی پێویست بێ و، قسەی پڕوپوچ و گاڵتەکردنی لە شێوەی سوعبەتدا بۆ کەیف خۆش کردن وەك کەسانی بەتاڵ و بێ‌کار ئەیکەن ، یا بڵاوکردنەوەی هەندێ قسەی‌وا کە بەڵا و مەینەت بەسەر ئینساندا بهێنێ وەکو ئەوە کە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموێەتی : «البَلاءُ موَكَّلٌ بالمَنْطِقِ» واتە : مەینەت و ئازار بەسراوە بە زمان و بە قسەکردنەوە . لەناو خەڵکدا مەشهورە «سَلامَةُ الاِنْسانِ فِی حِفْظِ اللّسانِ» واتە : پارێزراوێ ئادەمیزاد بەسراوە بەوەوە کە ئینسان زمانی لە هەندێ وتاری ناموناسب و نەگونجاو بپارێزێ کە بۆ ئەو شوێنە و ئەو سەردەمە دەستنەدا .

وا وردە وردە لە جۆرەکانی وتاری خراپ ئەدوێین و لێکیان ئەدەینەوە .

کوفرکردن . وا ئەبێ ئینسان لەبەر نەفامی زمانی خۆی بەرەڵلا ئەکا بۆ وتاری‌وا کە ببێ بەهۆی کافربون وەکو ئینکاری خوا یا بەندێ لە بەندەکانی

ئیمان و ئیسلام ، یاخود لەکاتی ڕق هەستاندا سەری لێ تێك ئەچێ و قسەی ناباری وەك کوفری بەدەمدا دێ . ئەم کردارە ناپەسەندە چەند زیانی لێ ئەوەشێتەوە . یەکەم : ئەوە کە کابرا بەو قسەیەی لە ئایینی ئیسلام دەرئەچێ و پێویستە گورج تەوبە بکا و داوای چاوپۆشی بکا لە خوا ، ئەگینا موستەحەقی ئازاری‌دنیا و قیامەت ئەبێ . دۆهەم : ئەوە کە خەلکی‌تریش بەهۆی ئەوەوە فێری ئەم خووە ناپەسەند و نابارە ئەبن و هەتا هەتایە هەرکەس کە لەوەوە فێربوبێ وشەیەکی کوفر بەدەمیا بێت ئەمیش ئەبێ بە هاوبەشی تاوانی ئەو .. سێهەم : ئەوە کە بەهۆی ئەم وەزعەوە متمانە و باوەڕ بە دین و ئایینی ئەم کابرایە نامێنێ . چوارەم : بیجگە لە شەرمەساریێ هیچ سوودێ لەو قسەیە وەرناگرێ .

لەعنەت . لەعنەت لە مەعنادا داواکردنی ئەوەیە کابرا لەعنەت لێ‌کراوەکە لە ڕەحمەت و میهرەبانێ خوا بێ‌بەش بێ لە دنیا و قیامەتدا . دوعای‌وا ڕەوا نیە لە حەقی کەسێکدا نەبێ کە دلنیا بێ بە کافرێ مردوە . کەسێك لەعنەت لە کەسێك بکا ، بەو لەعنەت کردنەی نزیك ئەبێتەوە لەوە کە خۆی لەعنەتەکەی بەسەردا بێتەوە چونکە داوای نائومێد بونی موسولمانێکی کردوە .

بوختان . بوختان کە بە عەرەبی پێی‌ئەوترێ ( بهتان ) ئەوەیە ئینسان بە درۆ عەیبێکی ناڕەوا بداتە پاڵ کەسێك مەسەلا بلێ کوفری کردوە یا کەسێکی کوشتوە یا زینای کردوە ، یا شتێکی‌تری لەم‌چەشنەی کردوە . ئەم جۆرە نیسبەت‌دانانە لە ئایینی ئیسلامدا زۆر ناڕەوان و تەنانەت ئەوەی بوختانی زیناکردن بەدەم کەسێکەوە بکا ئەبێ هەشتا داری لێ بدرێ مادەم ئیسپاتی ئەوە نەکا کە ئەو کەسە زیناکەی کردوە و بە فاسقیش ئەناسرێ و شایەتێ لێ وەرناگیرێ مەگەر تۆبە بکا و سالێ بەسەر تۆبەکەیدا تێبپەڕێ .

قسەی خراپ بردنیش بۆلای پیاوی گەورە ، تاوانێکی گەورەیە و بەپێی کردەوەی کابرای گەورە لەگەڵ ئەوکەسەی قسە لەبارەیەوە براوە بۆ لای ئەو پیاوە گەورەیە ، گوناە ئەکەوێتە ئەستۆی قسە بەرەکە ، بەتایبەتێ قسەبردنێ کە ببێ بەهۆی کوشتن یا نان‌بڕین . بەلکو ئەگەر کابرای گەورە هیچ ئازارێکیش نەگەیەنێ بەوکەسە کە قسە لەبارەیەوە براوە ، ئەم هەر گوناهبار ئەبێ . لەڕاستیدا قسەبردن زیان‌بەخشە چ بۆ کابرای قسەبەر و چ بۆ قسە لەبارەوە براوەکە و چ بۆ گەورەکە کە قسەی براوەتە لا . بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « حَدِيثُ السَّاعِي مُثَلِّثٌ » واتە : قسەی ئەوکەسەی قسە ئەبا بۆلای خاوەن دەسەلات سێ کەس تۆشی زیان ئەکا وەکو باسمان‌کرد .

قسەهێنانیش لەنێوان خەلکدا بەنیازی تێکدانی بەینیان کە پێی‌ئەلێن (نمیمە) وەکو ئاگری هاوین وایە کە بەربێتە شارای دەغڵ و گەلێ زیان و فیتنە و ئاشوب و کوشتاری لێ پەیدا ئەبێ . بۆیە حەزرەت درودی خوای لێ بێ

فەرموویەتی : « لایَدخُلُ الجَنَّةَ قَتّاتٌ » واتە : ئەوەی قسەی خراپ لەبەینی خەڵکدا دێنێ و دەبا ناچێتە بەهەشت .

غەیبەتیش ئەوەتە کەسێك ناوی یەکێ بەجۆرێ ببا کە خۆی یا کەسێك لە ئەندامانی خێزانی یا هۆزی یا نەتەوەی یا هەر پەیوەندێکی عەیبێکیان تیایە کە ئەگەر ئەوان بیبیسنەوە پێیان ناخۆش بێ و لەوانەبێ هەرایەکی لێ پەیدا ببێ . لەبارەی تاوانی گەورەی غەیبەتەوە خوا فەرموویەتی : « وَلا یَغتَب بَعضُکُم بَعضاً ، اَیُحِبُّ اَحَدُکُم اَن یَاکُلَ لَحمَ اَخیهِ مَیتاً » واتە : نابێ هەندێکتان غەیبەتی هەندێکیترتان بکەن،چونکە غەیبەتکردنی کەسێك وەك خواردنی گۆشتی ئەوکەسەیە بە مردوویی ، دەسا کێتان حەز ئەکا گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوا ؟ سەیرێکی ئەم وێنە بەسام و دڵلێبێزراوەی غەیبەت بکەن کە خواوەند لە قورئاندا پیشانی داوە . لەڕاستیدا غەیبەت دەرگای دوژمنایەتی ئەکاتەوە لەنێوان خەڵکدا ، چونکە کابرای غەیبەتکراو کە غەیبەتەکەی خۆی بیستەوە ، ئەویش ئەکەوێتە بیری تۆڵە سەندنەوە بە غەیبەتێکیتر و بەمجۆرە چەند ئازار و بێزار لەنێوانیاندا ڕوئەدا و ئەکێشێتەوە بۆ گەلێ مەینەت و پشێوە لەنێوان موسوڵماناندا . لەولایشەوە بەهۆی غەیبەتەکەوە هەردولا لە بەرچاوی کۆمەڵدا سووك ئەبن و خەڵکیش لە سوود لێ وەرگرتنیان نائومێد ئەبن .

ڕووشکێنی و ناتۆرە هەڵدان بەسەر خەڵکدا و تانەدان لە خەڵك و جنێودان بە خەڵك ئەمانە هەموو جگەری ئەوکەسەیان پێ بریندار ئەبێ کە ئاراستەیان کراوە و پێیان ئەکەوێتە گیروگرفت و موشکیلەی نەفسییەوە، چونکە ئەم وەزعانە ئەبن بەهۆی سووکبوونی ئەوکەسە لەناو کۆمەڵدا و کەسیش ڕازێ نابێ بەوە کە پایەی بشکێ و لە هەمانکاتدا ئەویش هەوڵئەدا بۆئەوە کە وێنەی ئەو قسانە بە کابرا بڵێتەوە جا هەردولا ئەبن بە کەسێکی بەد وەکو حەزرەت دروودی خوای لێ بێ فەرموویەتی : « المُتَسابّان شیطانان یَتهاتَران » واتە : دووکەس کە جنێو بە یەکتر بدەن ، دوو شەیتانن قسەی تاڵ بە یەکتر ئەڵێن .

کەواتە زۆر پێویستە ئادەمیزادی موسوڵمان شەرم بکا لە خودا و لە پێغەمبەری خودا و لە شەرافەت و پایەی خۆی و ، پایەی موسوڵمانان نەشکێنێ و دڵیان ئازار نەدا ، چونکە ئەم جۆرە وتارە نابارانە و ئەم کردەوە ناپەسەندانە ئەبن بەهۆی پەیدابوونی دوژمنایەتییەکی نەبڕاوە لەناو کۆمەڵدا و خانەدان لە خانەدان و هۆز لە هۆز و مامۆستا لە قوتابێ و بچووك لە گەورە و برادەر لە برادەر و ژن لە مێرد جیائەکەنەوە . مەشهوورە برینی تیر سارێژ ئەبێ ، بەڵام برینی قسە خۆش نابێتەوە . بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی : « یا اَیُّها الَّذینَ آمَنوا لا یَسخَر قَومٌ مِن قَومٍ عَسی اَن یَکونوا خَیراً مِنهُم ، وَلا نِساءٌ مِن نِساءٍ عَسی اَن یَکُنَّ خَیراً مِنهُنَّ ، وَلا تَلمِزوا اَنفُسَکُم وَلاتَنابَزوا بِالاَلقابِ . بِئسَ الاِسمُ الفُسوقُ بَعدَ الاِیمانِ وَمَن لَم

يَتُبْ فاوُلئِكَ هُمْ الظّالِمونَ » واته : ئەی موسولمانینه ! با هیچ کۆمەڵە پیاوێ گاڵته بە کۆمەڵە پیاوێکی‌تر نەکەن ، لەوانەیە گاڵتە پێ‌کراوەکان لە گاڵتەکەرەکان چاکتر بن . با کۆمەڵە ژنێکیش گاڵتە بە کۆمەڵە ژنێکی‌تر نەکەن ، لەوانەیە گاڵتە پێ‌کراوەکان لە گاڵتەکەرەکان چاکتر بن . خۆیشتان مەکەن بە نیشانەی تیر و توانج و ناو و ناتۆرەی ناشیرین لە یەکتر مەنێن . ئەم ناو و ناتۆرە خراپانە زیانبەخش و ناشیرینن پاش‌ئەوەی کە هەردولا ئیمانتان بە خوا و پێغەمبەر هێنا و لە تاریکی گومڕاهییەوە چونە بەر ڕۆناکی موسولمانەتی . ئەگەر لەمەولایش کەسانێ ببن تۆبە نەکەن لەم گوناهە نابارانە ئەوە ئەوکەسانە بەڕاستی بە ستەمکار ئەژمێررێن .

شادەکامییش کە بە عەرەبی پێی‌ئەڵێن ( شماتە ) ئەوەیە یەکێ تۆشی مەینەت و مصیبەتێ بوبێ و کەسێکی‌تر ئۆخەی بۆ بکا بڵێ دە بخۆ ئەوە دردت بێ ! کرداری‌وا کرداریکی سۆك و پەستە ، چونکە مادەم کابرای گیرۆدە بۆ کابرایەکی موسولمان بێ پێویستە ئینسان بەهۆی ئەو مەینەتەوە کە تۆشی بوە دڵگران ببێ چونکە موسولمان برای موسولمانە و نابێ بەهۆی ناحەزییەکی نێوانیانەوە دڵیان لەیەك ئەوەندە ڕەش ببێ حەز لە گرفتاربونی یەکتر بکەن. زیاد لەوە ئەو خودایە کە ئەویانی تۆش کردوە ئەتوانێ ئەمیش تۆش بکا . بۆیە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموێەتی : « لا تُظْهِرِ الشَّماتَةَ لاخيكَ فَيَرْحَمَهُ اللهُ وَيَبْتَلِيكَ » واتە : شادەکامی دەرمەبڕە بەرابەر بە برای خۆت ، نەکا خودا ئەو ڕزگار بکا و تۆ گرفتار بکا . لەناو کوردیشدا مەشهورە : هەرچی بڕواتە ژێری گڵ ، شادەکامی نارواتە ژێر گڵەوە . لە هەمو خراپتریش لەم مەیدانەدا ئەوەیە ئینسان بایێ ببێ و وابزانێ ئەوکەسەی تۆش بوە لەبەر بێ‌قابیلیەتی تۆش بوە ، بەلام ئەم خۆی بەقابیلەت و لێ‌هاتوە و تۆش نابێ . مەسەلەی کوردێ ئەڵێ : بەخ ناچێتە قەبرەوە .

پێویستە ئینسانی موسولمان ئاگای لە خۆی بێ و لەم بەردەبازانەدا نەخلیسکێ . پێویستە ئینسانی هوشیار هەر تەعریف و ستایشێکی کەسێك بکا و بەیانی هەر ناتەواوییەکی کەسێکی‌تر بکا زیادەڕەوێ تیا نەکا چونکە زیادەڕەوێ لە ستایشدا ئەگاتە پایەی گومڕایێ و سەرگەردانبونی ئادەمیزاد . باسی ناتەواوێ هەر کەسێکیش ئەگەر بە بێ‌ڕەوابونی شەرعێ بێ ئەوە کەم و زۆری تاوانە . تاوانیش تا کەمتر بێ باری ئینسان سوکترە . ئەگەر لەسەر یاسای شەرعیش بێ بەوڕەنگە کابرا ڕاوێژی پێ‌کرابێ و ناچار بێ بیڵێ ، ئەوە ئەبێ لە ئەندازەی پێویست لانەدا .

درۆکردنیش هیچ پێویست نیە باسی خراپیەکەی بکەین ئەوەندە ئاشکرایە . لای کەمی خراپێ درۆ ئەوەیە ئینسان لە دنیادا قسەی بێ‌نرخ و بێ‌ئیعتیبار ئەبێ و خۆی سوك ئەبێ ، بێجگە لەوە کە لای خوایش موستەحەقی

ئازار و عەذاب ئەبێ و بەگوێرەی ئەنجامی درۆکەی تاوانبار ئەبێ و ئەگەر درۆکە شایەتێ درۆ بێ کە حەقێ بەتاڵ ئەکاتەوە ، ئەوە بە تاوانی گەورە ئەژمێررێ و گەلێ جار چەنـد ئاشوبی لێ پەیدا ئەبێ . ئەگەر سـوێندی درۆیش بێ ئەوە بەپێی یاسای ئیسلام تاوانێکیوایە پێویستی بە کەفارەتە . ئەگەر لە دادگایشدا بێ ئەوە خاوەنەکەی ئەبا بە چاڵی قاری خوادا و وڵاتیش بەمجۆرە سوێندانە وێران ئـەبێ وەکو حەزرەت درۆدی خـوای لێ بێ فەرمویـەتی : « الیَمینُ الفاجِرَةُ تَـدَعُ الدّیارَ بَلاقع » واتە : سوێندی درۆ وڵات وێـران ئەکا ، مەبەستی ئەوەیە بەهۆی بڵاو بونەوەی سوێندە درۆکەوە ئاشوب و فیتنە بەناو خەڵکدا پەرەئەسێنێ و ئەکێشێتەوە بۆ وێرانبونی وڵات و بەهۆی سوك کردنی ناوی خوایشـەوە خوا قار ئەگرێ لەو خەڵکە و وڵاتەکە وێران ئەبێ .

لەملایشەوە سـوێندخواردنی کەسێ لەسەرئەوە کە فلانـە شت ئەکا یا نایکا ، هەر ذەمی کراوە لە ئایینی ئیسلامدا چونکە حەزرەت درۆدی خوای لێ بێ فەرمویـەتی : « الیَمینُ حَنَثٌ اَوْ نَـدَمٌ » . واتە : سـوێند خواردن لەسەرئەوە کە ئەو شـتە ئەکەم یا نایکەم ئەنجامی ئەوەیە کابـرای سوێندخۆر سوێندەکەی بشـکێنێ و کەفارەت بدا . یاخود ئەگەر نەیشـکێنێ پەشیمان ئەبێتەوە ئەڵێ ئەو سوێندەم بۆچی خوارد و بۆچی خۆم هاویشتە ناو کورەی نارەحەتییەوە بـەو سوێند خواردنە . ئەگەر قسەی درۆ بۆ هەڵـە پێکردنی خەڵکیش بێ ئەوە بە مەکر و فێڵ دائەنرێ و خاوەنی قسەیوا توشی عەذاب و ئازار ئەبێ وەکو پێغەمبەر ، درۆدی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی : « مَنْ غَشَّنا فَلَیْسَ مِنّا » واتە : هەرکەسێ غەش بکا لە موسوڵمانان ئەوە لە ئێمە نیـە ، یەعنی بە موسوڵمانی ساغ ناناسرێت . هەروا فەرمویەتی : « المَکْرُ وَالخَدیعَةُ فِي النّارِ » واتە : کەسێ فرۆفێڵ بکا بـۆ زیان گەیاندن بە موسوڵمانان لەناو ئاگری دۆزەخدا ئـەبێ و ئازار ئەدرێ . خودای تەعالا هەڕەشـەی کردوە لە ئینسانی مەکرباز و فەرمویەتی سەرەنجام خۆی ئەبێ بە داوی مەکرەکەیەوە . لە قورئاندا وتـراوە : « وَلا یَحیقُ المَکْـرُ السَّیِّیءُ اِلاّ باهْلِـهِ » . واتە : فرۆفێڵی خراپ سەرەنجام هەر دەوری خاوەنەکەی ئەداتەوە و خۆیی پێ گیرۆدە ئەبێ .

لە وتاری ناپەسـەندە باسکردنی مردو بە خراپە ، چونکە مـادەم کابرا مردوە خۆ تازە ناتوانرێ ئەو کابرایە لـەو خراپەیە بگێڕرێتەوە . بۆ پاراستنی خەڵکیش لە زیانی کردەوەی خراپی وەك کردەوەی خراپی ئەو مردوە ، ئەتوانرێ خراپێ ئەو جۆرە کردەوانە بە خەڵك بگەیەنرێ و باسی ئەوە بکرێ کە ئەو جۆرە کردەوانە بورن بەهۆی زیان پێگەیشتنی نەوەکانی پێشو و لە حاڵەتی تایبەتیدا نەبێ ناوی کەسە کردار بەدەکان نەهێنرێ . پێغەمبەر ، درۆدی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « اذْکُروا مَوْتاکُمْ بِالخَیْرِ » واتە : ناوی مردوەکانتان بە چاکە

بەرن . لەبارەی ئەوەشەوە کە پێویست نیە ئینسـان خۆی بە باسی خراپـەی وەچەکانی پێشـوەوە خەریك بکا ، ئەو ئایەتە باس ئەکەین کـە ئەفەرموێت : « تِلْكَ اُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ، لَها ما كَسَبَتْ وَلَكُمْ ما كَسَبْتُمْ وَلاتُسألُونَ عَمّا كانـوا يَعْمَلُونَ » . واتە : ئەو ئۆمەتانەی باسمان کـردن ئۆمەتێك بۆن بەسەرچۆن . ئـەوەی ئەوان کردۆیانە بۆ خۆیانە و ئەوەیش ئێـوە ئەیکەن بۆ خۆتانە و پرسیارتان لێ ناکرێ لەبارەی کردەوەی ئەوانەوە .

هەر لە جۆری کردەوەی بێ سۆدە قسەی پڕوپۆچ و گەپ و گاڵتەی لە ئەندازە زیاد کە زۆرجاریش وائەبێ هـەرا و دڵئێشانی لێ ئەوەشێتەوە وەك ئەڵێن : المِزاحُ لِقاحُ الضَّغائِنِ ، واتە : گەپ و گاڵتە کردن هۆی بڵاوبۆنەوەی تۆوی کینەیە لە دڵاندا .

( بێداریێ ) ئینسان ئەبێ لەکاتی قسەکردنا ئاگای لە دەمی خۆی بێ و تا ورد نەبێتەوە لەوەی ئەیەوێ بێڵێ ، نەهێڵێ لە دەمی دەرچێ . مەشهۆرە : هر سخن جایی و هر نکته مقامی دارد . واتە : هەر قسەیەك جێی خۆی هەیە . ئینسان ئـەبێ ئاگادار بێ لەوە کەوا قسـە تا لە دڵایە کەس پێی نـازانێ و لە بەندیخانەی بنیادەمـەکەدایە ، بەڵام کـە کردێ هەر بەوەوە داناکـەوێ کە لە بەندیخانەکەی ڕزگار بوە و بڕوا بە ڕێی خۆیەوە ، بەڵکو کابرای قسەکەر ئەخاتە بەندەوە و هەر تاوێك لەوانەیە کابرا تۆشی ئەنجامی خراپی ئەو قسەیە ببێ کە کردۆیەتی .

باشترینی قسە ئەوەیە ئەبێ بەهۆی سۆدی کۆمەڵ هەمۆی یا یەکەیەکەکانی وەکو ئەو ئامۆژگاریيانەی کە ئەکرێن بۆ موسوڵمانان لە موناسەبەت و ڕێکەوتی وەك ڕۆژانی جومعە و جەژن و کۆبۆنەوەی موسوڵمانانا ، خوا بە پەخشان بێ یا بە هۆنراوە . لەم جۆرەشدا جوانترینی ئەوەیە کە لەبەر ڕازاوەیی و ڕەوانبێژی پلەیەکی بەرزی ببێ و هانی خەڵك بدا لەسەر کردەوەی باش و بە سۆد وەك پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی : « اِنَّ مِنَ الشِّعْرِ لَحِكْمَةً وَاِنَّ مِنَ البَيانِ لَسِحْراً » واتە : بەڕاستی هەندێ شیعر هەیە پڕن لە حیکمەت و ڕاستی و هەندێ پەخشان هەیە وەك جادۆ کار ئەکەنە سەر دڵ .

| | |
|---|---|
| ڕۆڵەی هوشیـاری دڵ پڕ شوعـۆرم | هیـوای ژیـانم ، مـایەی سرۆرم |
| ئادەمێ دڵە و دڵ گەنجـی ئەسـرار | یـا پـڕە لە نـۆر یـا پـڕە لە نـار |
| یـا وێنەی گوڵـی بـاغی صەفـایە | یـا دڕکوداڵی شـاخی جەفـایە |
| تەرجومـانی دڵ زیـڕەی زمـانە | زمـان کاشـیفی دڵـی ئینسـانە |
| ئاگـات لە دڵ بـێ یـا دڵت پـاك بێ | بە وێنـەی جـامی مینای ڕۆناك بـێ |
| چونکـە ئەوکەسـەی دڵی ڕۆنـاکە | لە خەوش‌وخـاڵی کەدۆرەت پـاکە |



ئاگات لە خۆت بێ بە حەق نەناسێ     کوفری حەق نەکەی بە ناسوپاسێ
لەپاش نیعمەتی ئیجادی وجوود     تەمێ و تەربییە و میهرەبانێ و جوود
لەپاش نیعمەتی عەقڵ و هۆشی تۆ     ناردنی مایەی عەیش و نۆشی تۆ
لەپاش صوورەتی ( احسن التقویم )     لەپاش دەماغ و شوعووری سەلیم
پاش بەعثی ڕەهبەر بۆ ئیرشادی عام     تەنویری عوقوول بۆ دینی ئیسلام
حەق نیە بۆ تۆ خۆت خامۆش بکەی     حوقووقی خودا فەرامۆش بکەی
لەعنەت و نەفرین نەکەی بە زمان     نەفرین حەرامە لەسەر موسوڵمان
هەرگیز خۆ مەگرە بە بوختانەوە     ئەگەر دڵت وا بە ویژدانەوە
بوختان تیرێکە تیژ و ژەهراوێ     ئەدا لە دڵ و بەندی هەناوی
وەها کە بەدەی لە بێ گونایێ     بە بێ ئاگایێ بیخەیتە چایێ
جا نەخوازەڵڵا بوختانێکی وا     بدا لە نانی ماڵێکی ئاوا
ئەوەی کە ذەوقی لە نان بڕینە     دوژمنی دین و مانیعی ژینە
نان بڕین ئەبێ بە مایەی غەوغا     ئەبێ بە ئاشوب بۆ گەدا و ئاغا
یەکێ ئەم فیتنە بکوژێنێتەوە     ژیانی گەلێ ئەژێنێتەوە
خۆزگەم بەو کەسە بە بێ چاوڕاو     ئەبێ بە حافیظ بۆ نانی داماو

★ ★ ★

بەدێ و بەدگۆیێ لەلای سەرداران     غەضەب ئەڕژێنێ بە وێنەی باران
ئەم بە وتارێ گەلێ ئەکوژێ     خودایش بارانی قاری ئەڕێژێ
کێ بێ خۆی بگرێ لەبەر لافاوا     ئەسوتێ لەناو ئەم جۆش و تاوا
واتەی بەد مەبەن بۆ لای خاوەن دەس     خەڵکێ توند مەکەن لە تەلی قەفەس
بە فیتنە و ئیفساد هەڵمەکەن عەلەم     ئاگر بەرمەدەن لە گیانی عالەم
کاتێ پەرەی سەند ئاگری فەساد     بەر لە ڕەفیقان خۆت ئەبێ بەرباد
بە ئاه و نالەی دڵ بریندارێ     شەوێ یا ڕۆژێ ئەتگەزێ مارێ
خودا دێتە قار بۆ دڵ شکاوێ     تۆش زنجیر ئەکا بە ڕشتەی داوێ

★ ★ ★

ئەوەی کە قسە ئەبا و ئەهێنێ     ناوبەینی ئەم و ئەو ئەشێوێنێ
بو ئاگری شەڕ داری وشك دێنێ     خۆشی وەك ئەوان هەڵئەقرچێنێ
دنیا بە جارێ گشت ئەداتەبەر     گڕ بەرئەداتە کرد و وشك و تەڕ

★ ★ ★

غەیبەت کردنی برای موسوڵمان     ناگونجێ لەگەڵ ئیمان و ویژدان
تۆ غەیبەتی ئەو ، ئەو غەیبەتی تۆ     ئەگبەتێ دێنێ بۆ ئەو و بۆ تۆ
وڵات داتەگرێ بەدێ ئاثاری     گەلێ تۆش ئەبن بە دەردی کارێ

باوەڕ نامێنێ و متمانە و پەیمان — دڵ خاڵێ ئەبێ لە نووری ئیمان
کێ بگرێ گۆشتی مردووی خۆی ئەخوا — چۆن دنیایەکە دنیایەکی وا !

★ ★ ★

نە توانج بگرە و نە تیر و تانە — لە کەس ، خۆیێ بێ یاخود بێگانە
کە پەستێ کەسێ بە خەڵک ئەنوێنێ — شەرەف و قەدری خۆیشت ئەشکێنێ
وریابە نەکەی قەت سەرشەق نەبێ — فێری جنێو و قسەی ڕەق نەبێ
عەیبە قسەیێ بدەی بە هەوا — خۆتی پێ بکەی بەدناو و ڕیسوا
دڵ مەیەشێنە چونکە دەردی دڵ — چاک نابێتەوە هەتا ژێری گڵ
سەهلە زامی دڵ چاک ببێتەوە — بەڵام هەمیشە سوێی ئەکولێتەوە
بۆ زامێ ئەکەی کە بە وێنەی خاڵ — شین بکاتەوە بە درێژایی ساڵ
مولکی ئەم دنیا ئەوە ناهێنێ — ئینسانێ دڵی یەکێ بێشێنێ

★ ★ ★

هەرگیز لامەدە لە ڕادەی عادەت — نە بۆ عەداوەت نە بۆ عیبادەت
نە بۆ زویرێ و شکات لە جەفا — نە بۆ تەعریفی ئەربابی صەفا
هەرکەس لە چەرخا ڕانەگرێ میزان — ببێ بە فیدای کەسێکی نەزان

★ ★ ★

نەکەی بە شێوەی هەوای نەفامێ — خۆت دڵخۆش بکەی بە شادکامێ
( شاکامێ ) ناکەن مەگەر نەفامان — مەگەر هەرزەگۆ و هەرزە کەلامان
نازانێ خودا باش خەبەردارە — لەم وەزعی تۆیە زۆر ئاگادارە
داماوی ناکام ڕۆیێ بە ئەرزا — تۆیش سبەی ئەڕۆی بە ناخی درزا
بە کورتێ و کوردێ نیشانەی مەردێ — خۆ دوورگرتنە لە هۆی دڵ سەردێ

★ ★ ★

زمان شیرێکی خاوەن بڕشتە — شیروەشێنەکەیش خولق و سروشتە
بۆ تەمێی ئادەم بۆ ئامۆژگارێ — بۆ دەرخستنی ڕێگای ڕزگارێ
پلۆسکی پاکی سەرچاوەی دڵە — دڵ بۆنی خۆش بێ ئەویش هەر گوڵە
جاربەجار مشتێ لەو ئاوە جوانە — مایەی مانەوەی گەلی ئینسانە
جاربەجار وێنەی پیاڵەی ژارە — زیندوو ئەمرێنێ ئەوەند بەکارە
یەعنی زمانت وێنەی تەرجومان — مەبەستەکانت ئەدا بە جیهان
کەلام صیفەتی موتەکەللیمە — نەخۆش بێ نەخۆش ، ساغ بێ سالمە
هەروا دەست و پێت خادیمی دڵن — یا نێشی خارن یا پەڕەی گوڵن
خۆزگەم بەو دڵەی جێگەی ئەنوارە — لە ڕۆی جیهانا لانەی ئەسرارە

★ ★ ★

دەم و زوبانێ کە وان لەکارا سبەینێ ئەڕزێن لە گڵ و خارا
تۆ بە دەم تۆوێ ناچێنیتە گڵ سبەینێ بێ بە دارێکی گوڵ
دەرچێ لەم ئەرزە بەرەو ئاسمان دەماغت پڕکا لە ڕەوح و ڕەیحان
هەر وتارێکت شیرین وتارە سبەینێ بۆ تۆ باخ و گوڵزارە
هەروا هەر کارێ بەسوود و بەر بێ بە شەرعی ئیسلام خاوەن ئەمەر بێ
سبەی بە وێنەی کۆشکی شاهانە جیلوەگای تۆیە ئەو کۆشکە جوانە
بەپێچەوانەیش ئەسڵە نەك عەکسە ئەمە فەرموودەی جەنابی قودسە

★ ★ ★

چیت لێ کەم ئەبێ بەم واتە چاکە لە خۆت گەورەتر بانگ بکەی : کاکە
بە بێگانەیێ بڵێی : برا گیان لە خزمەتتایە چ ماڵ و چ گیان
کە چۆی بۆ خزمەت عالمی زانا بە شێوەی ئەدەب بڵێی : مەولانا
بە پیران بڵێی مامە و خالە و پوور بە ئافرەت بڵێی هەی خوشکی ڕۆسوور

★ ★ ★

بێجگە لەمانە ئیسلام پاکییە صەفای سینەیە و دڵ ڕۆناکییە
جل‌وبەرگی بەر هەم دەس و ڕوخسار بکەشێنەوە وەك گوڵی هەنار
کاسە و گلاست تا قوری و پیالە خاوێن بێ چونکە زینەتی ماڵە
خودا بە دیمەن جەمالی ئەوێ لەبارەی مەعنایش کەمالی ئەوێ

## گوڵی چل‌وهەشتەم ـ گوڵی‌تەندروستی و ئاسایش

نیعمەتی گەورەی خودا بۆ ئینسان
یەك لەش‌ساغییە و دووهەمیان ئەمان
واتە بێ‌ترسی گەزەندی بەشەر
بەسەربەی بۆ خۆت سەردەمی ژیان

پێغەمبەر ، درودی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی :

**نِعمَتانِ مَغبُونٌ فِيهِما كَثِيرٌ مِنَ النّاسِ الصِّحَّةُ وَالفَراغُ**

واتە : دوو نیعمەت هەن گەلێ‌کەس حەقی خۆیانیان نادەنەدەس و بەتەواوی قەدریان نازانن ، یەکەم ساغی لەش و دووهەم بوونی مەجاڵ بۆ خۆخەریك‌کردن بە کاری سوودمەند و بەکەڵکەوە .

لە هەندێ ڕیوایەتیشدا لەجیاتی ( والفراغ ) گێڕراوەتەوە : ( والأمن ) واتە ئەمینی و نەترسان لە ستەمکار .

بەڕاستی هەرکام لەم دوو ڕیوایەتە تەماشا بکەین هەر ڕاستە ، چونکە چ‌نیعمەتی مەجاڵ بوون بۆ خۆخەریك‌کردن بە کاری بەکەڵك و بەقازانجەوە و

چ نیعمەتی ئەمین بوون لە ستەمی ستەمکار هەردوکیان دوو نیعمەتی گەورەن نرخیان تەواو نابێ . لەواقیعدا ئادەمیزاد ئەگەر لەشی ساغ نەبێ ژیانی پڕ ئەبێ لە دەرد و مەینەت و کەلکێکی وای بۆ خۆی لێ وەرناگرێ و بۆ کۆمەڵیش وەك مردوو وائەبێ . ئەگەر لەژێر باری ترس و مەینەتیشدا بێ هەمیشە دڵی پەرێشانە و بنیادەم بە دڵی پەرێشان و پڕ لە دڵەکوتەوە ناتوانێ کارێکی ئەوتۆ بەئەنجام بگەیەنێ . بۆیە لە خوا ئەپاڕێینەوە ئەم دوو نیعمەتەمان پێ ببەخشێ و هێزی ئەوەشمان بداتێ لەسەر نیعمەتەکان سوپاسی بکەین .

ڕاگرتنی تەندروستێ بۆ ئینسانێ کە دەستی بگات بە دوکتۆری باش ، بەوە ئەبێ کە لەسەر ئامۆژگاریێ دوکتۆرەکە بڕوا لە خواردن و حەسانەوە و هەستان و دانیشتن و نوستن و شتیوادا و چێ بۆ دیاریێ ئەکرێ ئەوە بخوا و چێ لێ قەدەغە ئەکرێ توخنی نەکەوێتەوە . بۆ کەسێکیش کە دەستی نەگا بە دوکتۆر هیچ لە بەراورد باشتر نیە ، واتە ئینسان لەسەر بەراوردی خۆی ڕەفتار بکا لە ئەندازەی خواردەمەنێ و جۆرەکەیدا . هەروا بە بەراوردی خۆی هەرشتێ زیانی هەبێ بۆی نەیخوا و خۆی لێ بپارێزێ . حەزرەت ، دروودی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی : « رَأسُ الحِكْمَةِ الحِمْيَةُ » واتە : بناغەی ڕەفتاری ڕاست بۆ پاراستنی تەندروستێ پارێزکردنە لەو شتانە کە زیانیان هەیە بۆ لەش ساغێ ئادەمیزاد ، چونکە بەراورد دەلیلێکی ساغ و باوەڕپێکراوە .

لەم چەرخەدا زۆرخواردن بوە بە باو . بەڵام لە سەرەتای ئیسلامدا تێرخواردن کەم بوە ، چونکە موسوڵمانان ویستوویانە لەشیان سووك بێ بۆ عیبادەتکردن و نوستنیان کەم بێ بۆ شەونوێژ کردن . موسوڵمانەتێ و ئیطاعەکردنی خوایش پەیوەندیان بە ڕابواردن و ئارەزووبازییەوە کەمە . ئەم وەزعەی ئیستا لەگەڵ وەزعی لەمەوپێش زۆر دوورن لە یەك . لە لایەکیترەوە ئینسان تەماشائەکا گەلێجار گەدە ( میعدە )ی بەهۆی زۆر خواردنەوە ماندوو ئەبێ ، بەڵکو نەخۆشیش ئەکەوێ . چاری عادەتێ ئەم حاڵە ئەوەیە ئینسان تا ماوەیەك نیوەی ئەوەندە بخوا کە زوو ئەیخوارد ، بۆئەوەی کە گەدەی بتوانێ پاشماوەی پێشووی شیبکاتەوە و لەو دەردی زۆرخواردنەی پێشووی ڕزگار بێ .

لەسەر بناغەی ئەوە کەوا کەمخواردن ئەبێ بەهۆی سووكبوونی لەش بۆ عیبادەت ، هەروا ئەیشبێ بەهۆی نورانییەتێ دڵی ئینسان ، چونکە بەهۆی ڕیاضەکێشانەوە ئارەزووی نەفس کەمئەبێتەوە و نورانیەت زۆر ئەبێ ـ خوای تەعالا لە هەموو ئایینێکیا ڕۆژووی فەرزکردوە بەتایبەتێ لە دینی ئیسلامدا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی واجب کردوە .

فەلسەفەی ڕۆژوو بەکورتێ بریتیە لە : یەکەم ـ بەهۆی کەمخواردنەوە دڵی ئینسان ڕوناك ئەبێ و نەفسی سەرکێش ڕام ئەبێ بۆ تاعەتی خوا .

دۆهەم ـ بەم مەشق کردنە ئینسان خۆئەگرێ بە برسیەتییەوە و لەکاتی نەهاتێ و برسیەتیدا ئەتوانێ ماوەیێ خۆی بگرێ و بژێ . سێهەم ـ بەهۆی برسیەتییەوە قەدر و قیمەتی تێرێ ئەزانێ و سوپاسی خوای تەعالا ئەکا . چوارەم ـ بەهۆی برسیەتێ خۆیەوە لە برسیەتێ داماوان و لێقەوماوان ئاگادار ئەبێ و رەحمیان پێ‌ئەکا . پێنجەم ـ ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینەی بە خودای خۆی دەرئەکەوێ چونکە ئەگەر کابرا باوەڕی بەخودا نەبێ ، لە خانوی چۆلی خۆیدا کە کەس بە ئەحوالی نازانێ بۆچی نان ناخوا ؟

( بزانن ) پێشینان وتویانە بێجگە لەو ڕوداوانەی لە ئینسان ڕوئەدەن و ئەبن بەهۆی مردنی وەکو کوژران و سوتان و خنکان و شتی‌وا ، بەشی زۆری ناساغێ لە سەرما و ماندو بون و خواردەمەنێ نامووناسب و زیادەخۆرێ و خەم و مەراق و شتی‌واوە پەیدا ئەبێ . بۆیە پێویستە بۆ ئینسانی ژیر لەبەر ناچارێ نەبێ خۆی زۆر ماندو نەکا و خۆی لە سەرما بپارێزێ و شتی‌وا نەخوا کە پێی‌نەکەوێ و زیادەخۆرێ نەکا و زۆریش ئەهمیەت نەدا بە خەم و خەفەت چونکە چاری ڕابوردو ناکرێ بە خەم و خەفەت . هەروەك پێویستە ئینسان بە نیعمەتی پەیدابویش زۆر شادمان نەبێ . خوای تەعالا فەرموێەتی : « لِكَيْلا تَأْسَوا عَلَى ما فاتَكُمْ وَلا تَفْرَحوا بِما آتاكُمْ » واتە : بۆئەوەی خەم نەخۆن بۆ شتێ لە دەستان دەرچوە و شادمانیش نەبن بەوەی خوا پێی‌داون ، چونکە ئەوەی ڕۆیشتوە ناگەڕێتەوە و خوایش ئەتوانێ بۆتان بژێرێتەوە و ، ئەوەش کە بەدەستانەوەیە لەوانەیە لە دەستان دەربچێ و هەر ڕەزای خوا مەبەستە و پشت هەر بەو ئەبەسترێ .

تەندروستێ بۆ ساغێ لەش و ساغێ هۆشە . هەروەکو پێویستە ئینسان چ بە پارێزکردن و چ بە بەراوردکردن و تاقێ‌کردنەوەی خۆی و چ بە پەنابردنە بەر دوکتۆر ساغێ لەشی خۆی بپارێزێ ، هەروەها پێویستە ساغێ عەقلیشی بپارێزێ ، بەڵکو سودی لەش‌ساغێ لەکاتێکا دەرئەکەوێ کە عەقڵ و هۆشیش ساغ بن . لەسەر بناغەی ڕیعایەت و چاودێرێ‌کردنی ساغێ عەقڵە ئایینی ئیسلام شەراب و تریاك و ئەو جۆرە شتانەی حەرام کردوە . ئەو مەشروباتەی کە ئینسان سەرخۆش ئەکەن ، لەوانەیە ماڵ و بەڵکو شەرەفیشی بفەوتێنن و لەناوبەرن . ئەو ئینسانەی گیرۆدەی خواردنەوە ئەبێ ، ئەبێ بە دیلی ئەم عادەتە . ئەگەر جارێکیان لەکاتی خۆیدا بۆی ڕێ‌نەکەوێ بخواتەوە وەزعی تێك‌ئەچێ و واش‌ئەبێ نەخۆش‌ئەکەوێ . ئیسپات بوە کە خواردنەوە دەورێکی خراپ ئەبینێ لە پەیدابونی گەلێ نەخۆشێ و لە پەرەسەندنی گەلێ نەخۆشێ‌تردا .

لەم موناسەبەتەدا باسی ئەوە ئەکەین کەوا ئەو شتانەی پاراستنیان لە هەمو ئایینێکدا بڕیاردراوە بە ناچارێ ئەمانەن : دین و ئایین ، ژیان ، عەقڵ و هۆش ، شەرەف و ناموس ، ماڵ و دارایێ . بۆ پاراستنی ئایین حەد و یاسایەکی

تایبەتی دانراوە لە کتێبەکانی شەرعدا بەدرێژی باسی لێ کراوە . بۆ پاراستنی ژیانیش قیصاص دانراوە کە لە حاڵەتی کوشتنی عەمدی و دەسەنقەستدا ئەگاتە کوشتنەوە . بۆ پاراستنی عەقڵ و هۆشیش مەنعی خواردنەوەی مەشرۆبی سەرخۆشکەر بڕیاردراوە و بڕیاردراوە ئەوەی شتی وا بخواتەوە چل تا هەشتا جەڵدەی لێ بدرێ . بۆ پاراستنی ماڵ و داراییش حەد لەسەر دز و ڕێگر دانراوە کە بۆ دز دەستبڕین و بۆ ڕێگر کوشتن و هەڵواسینە . بۆ پاراستنی شەرەف و ئامۆسیش حەدی قەذف دانراوە کە هەشتا جەڵدەیە و حەدی زینای بنیادەمی بێهاوسەر کە سەد جەڵدە و دوورخستنەوەی ساڵێکە و هی هاوسەردار کە سەنگەسار کردنە .

هەروەها بۆ تەندروستی ئینسان پێویستە بنوێ ، بەڵام بە ئەندازەیەك کە لەگەڵ ساغی لەشدا ڕێك بکەوێ ، یەعنی ئەوەندە بنوێ کە لەشی ئارام بێ و ئەوەندەیش زۆر نەبێ کە ببێ بەهۆی دواکەوتنی لە کار و کاسبی و پەیداکردنی هۆی ژیانی خۆی و خێزانی . دیارە کاتی نوستن شەوە ، لە ڕۆژگاری درێژیشدا هەندێ وەختی ڕۆژیش هەر دائەنرێ بۆ خەو . هەروا ئاشکرایە ئینسان لە شەو و ڕۆژدا حەوت هەشت سەعات بنوێ بەسیەتی. ئەگەر بیشتوانێ کەمتر بنوێ و لەشی تێك نەچێ ئەوە عەیبی نیە .

هەروا پێویستە بۆ تەندروستی ئینسان زۆر نەدوێ و لەڕادەی پێویست تێنەپەڕێ ، چونکە تا زۆرتر بدوێ پرسیاری زۆرتری لێ ئەکرێ و کە زۆر دوێ چاکیش و خراپیش بە دەمیدا دێ و ناتوانێ ئەوەی لە دڵیایەتی بە پاڵاوتەیی دەری کاتە دەرەوە و ئەوکەسانەیش کە قسەکەی وەرئەگرن مەلول و بەرێشان ئەبن . کەواتە پێویستە قسە بەئەندازەی پێویست بێ ، ئەگینا بێدەنگ بێ و خۆی لە دەرد و مەینەت بپارێزێ . پێویستیشە ئەو قسەیەی ئەیکا وای بکا بە ڕەوانی بێ و خەڵك حاڵی ببن لێی وەکو پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ فەرموویەتی : « رَحِمَ اللّٰهُ امْرءً اَصْلَحَ مِنْ لِسانِهِ » واتە : ڕەحمەتی خوا لەوکەسەی لە کاتی قسەکردنا ڕاست و ڕەوان بێ .

پێویستیشە ئینسان هەرچیەکی بیست باشەکەی هەڵگرێ بۆ خۆی و ڕەفتاری پێ بکا وەکو خوا فەرموویەتی : « اَلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ اَحْسَنَهُ » واتە : خۆشی بۆ ئەو بەندانەم کە گوێ بۆ قسە شل ئەکەن و شوێنی باشەکەی ئەکەون . ئەگینا بڵاوکردنەوەی قسەی بێبناغە یا هیچوپووچ زیان ئەگەیەنێ نەك سوود ، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی : « كَفَى بِالْمَرْءِ اثْماً انْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ ما سَمِعَ » واتە : بەسە بۆ گوناهی پیاو ئەوە کە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە . هەندێ لە زانایان وتوویانە : ئەگەر قسەکردن زیو بێ بێدەنگی زێڕە، بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە قسەکردنیش و بێدەنگییش هەریەکی

ئەندازە و شوێنی تایبەتی خۆیانیان هەیە . قسەیوا هەیە واجبە و هیوا هەیە سوننەتە و هیوا هەیە حەرامە و هیوا هەیە مەکرۆهە و هیوایش هەیە کردن و نەکردنی لەبارەی حوکمی شەرعییەوە وەك یەك وایە . موهیم ئەوەیە هەر قسەیێ بۆ هەرکەسێ بکرێ لە ئەندازەی تێگەیشتنی ئەوکەسەدا بێ و بەگوێرەی باری دەروونی ئەو بێ و لەوانە نەبێ بێتاقەت و عاجزی بکا و لە سنووری ئەدەب و ئیحتیرام نەچێتە دەرەوە و قسەی زەقی تیا نەبێ و ئەگەر بەنیازی هێنانەدێ مەبەستێك بێ وابێ کە مەبەستەکەی پێ بێتەدێ وەکو خوای تەعالا بە پێغەمبەری فەرموە : ادْعُ الى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالحِكْمَةِ والمَوْعِظَةِ الحَسَنَةِ وجادِلْهُمْ بِالَّتي هِيَ احْسَنُ . واتە : خەڵك بانگ کە بۆ ڕێگەی فەرمانبەرداریێ خوا بە وتار و کرداری باش و ئامۆژگاریێ جوان و بە کام شێوە جوانترە بەو شێوەیە موجادەلەیان لەگەڵ بکە . مەبەستی لەوەیە کەسانیوا هەن چاو لە کرداری باش ئەکەن و گوێ بۆ قسەی جوان ئەگرن . لەگەل ئەوانەدا بەوجۆرە بجوڵێرەوە . کۆمەڵێکیش هەن حەز لە موجادەلە ئەکەن . ئەوانە موجادەلەیان لەگەڵ بکە ، بەلام با بە جۆرێکیوا بێ لە هەمۆ جۆرێ جوانتر و باشتر بێ .

ڕۆڵەی نموونەی فریشتەی بەرزم — لە ماوەی ژینا پڕتەوی ئەرزم
بڕوانە بە دڵ زنجیرەی دنیا — بۆ هەر مەبەستێ شتێ دانرا
چوار فەصڵەی جیهان هەرکام بەبارێ — قازانجیان هەیە بۆ ئیش و کارێ
ڕۆژ کاتی هەوڵە بۆ مایەی ژیان — شەو بۆ ئاسایش بۆ لەش و بۆ گیان
ئەوکەسەی شەو زۆ ئەچێتەناو جێ — سبەینێ زۆر زۆ لە خەو هەڵئەستێ
بێجگە لە دوعا و ئیطاعەی خودا — خودا وەسیلەی ڕزقیشی ئەدا



خواردن بۆ هێزی لەش و گیانە — زیاتر لە پێویست باری گرانە
با میانە بێ ئاو و نانی تۆ — با سەر زەو نەکا لە میزانی تۆ
بەقەد ئارەزۆ طەعامێکی پاك — ئەبێ بە مایەی تەندروستێ چاك
کە خۆت گرت بە کەم کاتێ لێقەومان — بە خۆشی ئەژیت بێ ئاخ و ئامان
کە خواردن کەمبۆ نوستن کەم ئەبێ — بۆ خواپەرستێ لەشت گەرم ئەبێ
بە خواپەرستێ دڵت جەم ئەبێ — لە خێردا نەبێ قسەت کەم ئەبێ
ئینسانی کەمدۆ کەمخۆر و کەمخەو — هەمیشە سیمای پڕە لە پڕتەو
بە نوری خودا دڵی بە ئیمان — ئەشئە وەرئەگرێ لە بەرەبەیان
ئەو ئەشئە ئەدا لە دەماخی دڵ — بۆنی خۆشترە لە نەسرین و گوڵ
بە وێنەی بولبول دڵ دێتە فوغان — نەك بۆ عەشقی گوڵ بۆ عەشقی یەزدان
لێئەدا نەغمەی هەزار ئاوازە — عاریف تێئەگا لەم نەوعە ڕازە
زەوقی مەحەبەت سەرمەستی ئەکا — لە دەرد و ئازار سەربەستی ئەکا

به نوور ئەسووتێ وەکو پەروانە | لە کەس ناپرسێ وێنەی دیوانە
جا ئەژییێتەوە بە نەزمێکی نەو | لەسەر حسێبی پەروانە پڕتەو

★ ★ ★

به گەزاف نالێم بە چاوت قەسەم | لەم قسەی منە بە خاترجەم
دنیا بە بێ‌دڵ پووچ و بەربادە | شا ئەوکەسەیە کە دڵی شادە
بەذەوقی دڵبەر سەرخۆش و سەرشار | هاوین و پایز زستان و بەهار
ئیش بە دەم نابێ بە کردەوەیە | هەرکەس تێکۆشێ بەش بۆ ئەوەیە
لەبۆ بێ‌دڵان فوغان عەبەسە | هەرکەسێ کەسە حەرفێکی بەسە

## گوڵی چلونۆهەم ـ گوڵی سوپاسگوزاریێ بۆ خودا

سوپاسی خودا فەرزی ئینسانە
مایەی لێشاوی فەیضی ئیحسانە
ئەوکەسەی سوپاس بۆ بە ڕەوشتێ
سەیری بەهەشتێ لەبۆ ئاسانە

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرمویەتی :

**لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ ، وَإِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ**

واتە : بەڕاستێ ئەگەر سوپاسی خودا بکەن لەسەر نیعمەتەکانی ئەوا نیعمەتتان بۆ زیاد ئەکەم ، ئەگەر ناسوپاسییش بکەن بەرابەر بەو نیعمەتانە ، ئەوە بزانن بەڕاستێ ئازاری من زۆر سەختە .

سوپاسی نیعمەتی خوا کردارێکی مەردانەیە ، ئەوەی دڵی پاك و ڕۆناك بێ لەم کردارە دواناکەوێ . ئینسان بە ویژدانی خۆی چاك و خراپ لە یەك جوێ ئەکاتەوە . جا هەروەکو یەکێ زیانێك بە کەسێك بگەیەنێ ئەوکەسە دڵی پەرێشان ئەبێ ، یەکێ چاکەیەکیش لەگەڵ کەسێك بکا ئەوکەسە دڵی خۆش و شاد ئەبێ و بە پێویستی ئەزانێ دان بە چاکەکەیدا بنێ و ئەوەندەی ئەو چاکەیە تۆڵەی چاکی بداتەوە .

یەکەم کەس کە سوپاسی پێویست بێ ذاتی خوایە کە ئینسانی دروست‌کردوە و صورەت و سیرەتی جوانی پێ بەخشیوە و بە بیر و هۆش و ویژدان و حەواس و هەستی ساغ ڕازاندویەتیەوە . دوەهەم ئەو پێغەمبەرە نازدارەیە کە وەکو چرایەکی عالەمێ لە جیهاندا هەڵکراوە و بەرچاوی ئادەمیزادی ڕۆناك کردوەتەوە و شارەزای کردوە بۆ ڕێگای ڕاست لە هەمو بابەتێکەوە و وەسیلەی ڕزگاریێ دنیا و قیامەتی نیشان‌داوە و گەلێ نیعمەتی

بەسەردا ڕژاندوە . سێهەم ئەو باوك و دایکەن کە هۆی پەیدابونی ئینسانن و ڕەنجێکی زۆریان لەگەڵدا کێشاوە و پەروەردەیان کردوە و چەند جۆر تاڵی و سوێریان لەپێناویدا چەشتوە . چوارەم مامۆستای دەرسی زانستە کە ئینسان بەهۆی ئەو دەرسەوە لە خامی و نەفامی دەرئەچێ و ئەبێ بە ئادەمیزادێکی خاوەنبیری ڕوناك و ئەندێشەی چاك و لە جیهاندا سەربەرزی ئەکات ، بەتایبەتی ئەو مامۆستایە کە بوە بەهۆی ڕوناکبونەوەی دڵ و دەرچون لە تاریکی هەوای نەفس و گومڕاهی بۆ مەیدانی هیدایەت و عینایەتی ئیلاهی تا بوە بە مەردێکی پێگەیشتو و تێگەیشتو . پێنجەم مامۆستای پیشە و سەنعەت کە ئینسانی پێ ئەبێ بە ئینسانێکی ئازاد لە ژیانی دنیایدا . دیارە ئینسان بێزانینی پیشەیەك وەك کوێر وایە ، هەمیشە پێویستی بە کەسێکە دەستی ڕابکێشێ و ئیشێکی پێبکا . بەڵام شەخصی خاوەن صەنعەت خاوەنی خۆیەتی و بە بێمنەت بە سەربەخۆیی ئەژێ ، بەڵکو خەڵکیتر لە سایە و پەنایدا ئەژین . شەشەم هەرکەسێ لەم جیهانەدا حوقوق و چاکەیەکی بێ لەسەرت ، یا لە ڕەنج و کێشەیەك ڕزگاری کردبێ ، یا نان و نیعمەتێکی دابێتێ . ئەمانە سوپاسیان لەسەر ئینسان پێویستە .

سوپاسی ئەمانە هەرکام شێوەی تایبەتی هەیە . سوپاسی خوای تەعالا بەوەیە کە ئینسان بە دڵ و بە لەش هەرچی خودا فەرمانی داوە بکرێن ، بیانکا و هەرچی فەرموێەتی نەکرێن ، نەیانکا . سوپاسی پێغەمبەریش درودی خوای لێ بێ ئەوەیە ئینسان تێبکۆشێ بۆ بڵاوکردنەوەی دین و ئایینەکەی و بە دڵ خۆشیبوێ و بە دەم سەڵەواتی لێ بدا و هەرکەسێ لە نەتەوەی ئەو بێ حورمەتی بگرێ و بە خاوەن پایە و شەرەف تەماشایان بکا . سوپاس بۆ مامۆستای زانست و ڕێگاپیشاندان و وەستای سنعات و پیشە و هەر خاوەن حوقوقێکیش بەوەیە بە دڵ خۆشتبوێن و ، حورمەتیان بگرێ و شەرمیان لێ بکەی و ، هەر یارمەتییەکیان پێویست بۆ پێشکەشیان بکەی و ، کە تۆشی هەر دەرد و مەینەتێك بون تا پێتبکرێ هەوڵی ڕزگاربونیان بدەی و ، پاش مردنیان دوعای خێریان بۆ بکەی و لەگەڵ نەوەیان باش بی و پێویستی وەفایان لەگەڵ بەجێبهێنی .

| | |
|---|---|
| ڕۆڵەی بەوەفای خاوەن سوپاسم | دڵ پڕ لە صەفای حەقیقەتناسم |
| سوپاس ڕەوشتی سیرەت پاکانە | خولقی بەهەشتی دڵ زاناکانە |
| سوپاس بەرابەر بە نیعمەت ئەبێ | ئەنجامی سوپاس هەر ڕەحمەت ئەبێ |
| نیعمەتی خودا حسێبی نیە | جێگەی نوسینی کتێبی نیە |
| وجود نیعمەتە دەرکەوت لە عەدەم | خوا ئامادەیکرد بۆ عیلم و عەلەم |



بەلام بەکورتی چەند بابێ هەیە      بۆ هەرکامێکیان حیسابێ هەیە
یەکەم لەش‌ساغێ و تەندروستێ تۆ      بۆ وەفا بەهۆی حەق‌پەرستێ تۆ
دۆهەم ئاسایش لەگەڵ بەروبوم      بە بێ‌تۆش‌بوونی بەلای ڕەش و شوم
بە تەندروستێ و بەهرەی ئاسایش      بۆ تۆ دێتەدێ گەشە و نومایش
سێهەم ژیواری ڕەسا بە ئەحواڵ      بۆ خۆت و میوان بۆ ماڵ و مناڵ
خانوی بێ‌ژیوار بەندیخانەیە      وەك گۆڕی سیای ئەم ژیانەیە
ئەمجار هاوسەری خاوەن وێڵ و فام      ڕازاوە و نازدار وەك تولە ئەمام
دەم‌خۆش‌و ڕوخۆش ماڵداری ماڵ بێ      خاوەن ڕەوشتی پڕ لە کەماڵ بێ
هاتو بەدڕۆ بوو بەدخوو بەدسروشت      لەگەڵیا مەڕۆ بۆ باخی بەهەشت
بەهەشت لەگەڵ بەد دۆزەخی تارە      ژیان لەگەڵیا چون ژاری مارە



چوارەم دراوسێی ئارام و هێمن      وەك قەلایە بۆت بەرەوڕوی دوژمن
بۆیە ڕەهبەری پێشڕەوی ئازار      پەندی داداوین ( الجار قبلَ الدار )
خانویەك ئەگری بێ دراوسێی چاك      ئەگەر ناتەوێ سەر بدەی لە خاك
هاوسێی بەد چاکەت ئەهاوێتە چاڵ      ورتەت لێوە بێ بۆت ئەکا بە قاڵ
پەنا بە خودا لە دراوسێی‌وا      ژینە لەگەڵ مار ژیان لەگەڵیا
پێنجەمین هاوڕێی هاودەرد و دڵە      بە دڵ ئامادەی حەللی موشکولە
ئەبێ بە سپێر لەبۆ برای خۆی      کاتێ کە ناحەز تیرێ باوێ بۆی
مایەی سەربەرزێ ڕۆژانی ژینە      شانازێ دنیا و شانازێ دینە
ئەمانە وێنەی هومای ڕاسەرن      بە فرچەی هاوین شنە و سێبەرن



شەشەم سەرۆکی بەهۆش و دادە      سایەی ڕەحمەتی ( ربّ العباد )ە
مایەی ڕەحمەتی هەموو عالەمە      هۆی ئیسراحەتی بەنی ئادەمە
پێویستە بە دڵ خزمەتی بکەی      هەرگیز مەیدانی ڕەحمەتی نەدەی
شەو و ڕۆژ بە دڵ بپارێتەوە      عالەم لەسایا بحەسێتەوە
بە دڵ ، بە زوبان ، بە خامە و نامەت      یارمەتی بدەی هەتا قیامەت
ولات بێ سەرۆك بەربەرەللایە      سەروکیش بێ داد دەرد و بەلایە
حەوتەم مامۆستای دەرسی ڕزگاری      هێ دین و زانست هێ سەنعاتکاری
بۆ نەخۆشی دڵ چارە و دەرمانە      حەللی موشکولی لەلا ئاسانە
بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵی بەشەر      ڕەوایە ناوی ببەی بە ڕەهبەر
یەك ئینسانی ساغ ملیۆنێ ئەژێ      بۆ چاری دەرد و بۆ مەینەت کوژێ
ئینسانی لاریش مارە و ئەژدەها      بۆ دەسکەوتی خۆی ئەکوژێ صەدها



ئەم نیعمەتانە هەمو بۆ خودان     هەر لە ڕەحمەتی خوداوە پەیدان
بێ ڕەحمەتی حەق نیعمەتی نابێ     چ لەبۆ شا بێ چ بۆ گەدا بێ
حەمد و سوپاس و ثەنا و ستایش     هەر لەبۆ خودا ئەدا نومایش
بۆ کەسێکیوا لەسەر مەظهەرە     مەسەلا ئەڵێن حەزرەت ڕەهبەرە
لەلای خوداوە ئایینی هێنا     دڵی تاریکیکردین بە مینا
ئەڵێن باوکودایك لەسەرخواستی ئەو     بوّن بە وەسیلەی ڕۆڵەی بە پڕتەو
ئەڵێن سەرکۆمار بە فەیضی خودا     بۆ بە سایەی خەیر بۆ دارا و گەدا
هەروا هەرکەسێ مایەی نیعمەتە     لەخوداوەیە ئەمو حەقیقەتە
ئەمانە هەمو ڕیزی ئەسبابن     فەرعی تەحریری ( ام‌ّ الکتاب )ن
تەوفیق بۆ ئەسباب هەر لە خودایە     تێکۆشانی تۆیش پەیوەندی تیایە
لە ئێمە کۆشش لە خودا تەوفیق     ( واللهُ الهادی سَواءَ الطریق )

★ ★ ★

با لێرا شتێ بەیانبکەم بۆت     کۆسپی زل هەیە با نەیەتە ڕێت
ئەو کۆسپە چیە بایێبۆن لە خۆ     لەسەر نیعمەتێ هاتوە بۆ تۆ
زینهار نەنازێ بە شانی خۆتا     دار نەدەی بەسەر ئیمانی خۆتا
دەخیل صەد دەخیل نەڵێی ئەم نانە     بە هەوڵی خۆمە و بە ڕەنجی شانە
هەزار شان و قۆڵ بۆ خۆت بکوتی     کە خوا نەتداتێ هەروا بێدەستی
نەڵێیت ئەم پایە بە مایەی خۆمە     تەقەلای خۆمە و بە سایەی خۆمە
پاڵەوانی زۆر مردن بێئەنجام     پاڵتویان دانا بێکام و مەرام
تێکۆشان فەرزە بەڵام سەرەنجام     وەستاوە لەسەر خودای (ذو الاکرام)

★ ★ ★

ئەسباب دۆ نوعە بۆ مایەی ژیان     نەوعێکی دیارێ و نەوعێکی پەنهان
پەنامەکیەکەی تەنیا هەر خودا     بە ئیرادەی خۆی جێبەجێی ئەکا
بەو ڕێگا لێژا کە تۆ سەرئەخا     شێر بۆی بڕوانێ ( فورا ) بەرئەخا
موشکولێ هەیە تیایا داماوی     ئەوەند هەوڵتدا تیا تێشکاوی
بێ عیلم و حەول و تێکۆشینی تۆ     دەوا دێ لەبۆ نەخۆشینی تۆ
یەکێ ئەبینێ بە مەحضی ئیحسان     ئەو کارە زلەت بۆ ئەکا ئاسان
جا خۆت و بەخت و بەختیاری خۆت     خۆتو وریایێو خۆشکرداری خۆت

★ ★ ★

( لئن شکرتم ) شەرطی خودایە     زۆربونی نیعمەت بۆ ئەو جەزایە
( لئن کفرتم ) مەرجی دۆهەمە     جەزای عەذابی ناو جەهەنەمە
بەهار بوئەوە باران ئەڕێژێ     باخەوان داری پڕ بەر بنێژێ
ئەگەر تێفکرێ بە عەقڵ و میقیاس     ئەزانێ فەرز و پێویستە سوپاس

★ ★ ★

سوپاسی خودا ئیخلاصی دینە	به عەقـڵ و نەقڵ ڕیشـەی ئایینە
بۆن و بیر و هۆش ساغی بۆ ئەندام	پایە و مایەی تۆ بەو دێتـە ئەنجام
خۆ تۆ ئینسـانی مەبە بـە شاخی	لە سوپاسی حەق خۆت مەکە یاخی
خوا خۆی فەرموویە بێ زیاد و کەم :	بۆ سوپاسگوزار نیعمەت زیاد ئەکەم
لانابـا نیعمـەت حەتتـا لە عاصی	هەتـا دەس‌نـەکا بـە ناسـوپاسی
لـە دوو جیهانـا ئاسـایش بـۆ تۆ	لەسـەر سـوپاسە بـە بێ گفتوگۆ
هەرکەس کە سوپاس ڕەوشتی ئەو بێ	بەشی لە بەهەشت ئەبێ بۆ ئەو بێ
مادەم بە سوپاس زۆر ئەبێ نیعمەت	بە ناسوپاسی وەرمـەگرە زەحمەت

★ ★ ★

سوپاس بە دڵە و بە دەمە و بەکار	بە هیوای جەزای خوای پەروەردگار
بۆ هـەر نیعمەتی خزمـەتی فەرزە	باسی ئەم فەرزە لەسـەرمان قەرزە
کەسێ لە مالیـا خەڵکی بەشدارە	ئەوکەسـە بە حـەق سوپاسگوزارە
یەعنی ئەو بەشە خـودا داویە پێت	لەبۆ خزمـەتە ئاگات بێ لـە خۆت
بۆ خۆت ئەصیلی بۆ خەڵکی وەکیل	خەیانەت نەکەی دەخیل صەد دەخیل
وەکیـلی خائـین زۆ ڕسـوا ئـەبێ	لە سـزای خۆیـا زوو تـوونا ئـەبێ

★ ★ ★

کە هات‌و نەهات هەر بە ڕەحمەت بێ	هەردوو لەلای تۆ ئەبێ نیعمەت بێ
بـۆ بـەراوردە بـێ مـاڵت ئـەکا	یاخود بێ شـان و بێ حـاڵت ئەکا
( لِیَبْلُوَکُمْ ) فەرمـوودەی خوایە	ئینسـانی هوشـیار لەمـە ئاگایـە
تا لە زحمـەتدا سـوپاسی بـکەی	وەك لە ڕەحمەتیا حەق‌ناسی ئەکەی
ئەگەرنـا توخـوا پێـم بـڵێ بـرا	ئەو هەر ڕات‌بگرێ لە کۆشك و سەرا
پەروەردەت بـکا بە نـاز و نیعمەت	بە پایەی بەرز و بە قەدر و قیمەت
هەرگیز نەبینی ڕەنـج و نەخۆشی	کام کالا ئـاڵە بۆ خـۆت بپـۆشی
ساتێ ئـارەقی مەینـەت نەڕێـژی	کـاتێ تامێـکی تـاڵی نەچێـژی
بە چ دەلیلـێ ئـەڵێی مـن سـاغم	عەبدێـکی ساغی سینە و دڵ داغم

★ ★ ★

زۆر کەست دیوە بێ دەست و داماو	بێ‌حاڵ و بێ‌مـاڵ خـام و ناتـەواو
زۆریشت دیـوە پیـاوی خانـەدان	بە لێ‌قەومـاوی کەوتە نـاو کۆڵان
مادەم ئینسانی تۆیش هەر لەوانیت	خوا کوڕی نیە تۆیش کوڕی خوا نیت
بەندە تا مـاوە فـەرزە بەنـدە بێ	بۆ خودای عالـەم سەرئەفگەندە بێ
کەوایە بێ دڵ فەرمـان بەردار بە	لەسەر بەنـدەیی باش پایـەدار بە
بێ‌جەزا نابێ ، ئەمـڕۆ بێ و سبەی	حەقت نافـەوتێ بە حـەقت ئەگەی
بە مایەی دنیا یا پایـەی بەهەشت	یەکوودە جەزات بـۆ ئەنرێتە مشـت

★ ★ ★

ئەمجار بە ئەمری حـەزرەتی داوەر
بێ بـۆ سوپاسی جـەنابی ڕەهبەر
ڕەهبـەر ( رَحمـةً للعالمـينَ )ە
پیرۆزێ ژیـن و هێ دنیـا و دینـە
ئێمەی دەربازکـرد لە تاریکسـتان
لە شوێن‌کەوتنی ڕێی ڕەشی شەیتان
دەرسـی مەبـدەئی ئـایینی هێنـا
دەرسـی ژیـانی ئـەمینی هێنـا
دەرسی ئـەخلاق و ڕەوشـتی هێنا
دەرسی خولـودی بەهەشتی هێنـا
دەرسی برایێ و سـافی و یەکێتێ
دەرسی ئـارامێ بـۆ چەرخی گێتێ
ڕەهبـەرێکی‌وا سـوپاسی فـەرزە
چونکە ڕۆنـاکێ ئاسـمان و ئـەرزە
سوپاسی چیـە ؟ ئیمانـە و باوەڕ
لەگەڵ پەیـڕەوێ ئەخلاقی ڕەهبـەر
تەئییـدی دینی هەتـا هەتایـە
بە هـەر پایەیێ کـە لـە دەسـتایە
بەربەرچدانـەوەی دوژمنـی ئـایین
خزمەتی ئایـین تا ( یـوم اليقـين )

★ ★ ★

شوکری باوك و دایك ئەمری قورئانە
پاش خودا و ڕەسوڵ نۆبەی ئەمـانە
بە پارە ، بە دەست بە دەم بە فرمان
هەرچۆن پێویست بێ بۆ ڕەوتی ژیان
دوعای خێر بۆیـان بەیانێ و شێوان
کە بـکەونە بەر ڕەحمـەتی یەزدان

★ ★ ★

هەروا سـوپاسی مامۆسـتای زانا
کە دەرسی دادای بەگـوێرەی توانا
هەرکەسێ چاکەی هەیـە لەسەرت
گـەورە یـا بچـوك یا بـەرابەرت
بە مەردێ و گوردێ لادە لە پەستێ
هەرکەس حەقی خۆی بەدەرە دەستی
بـۆ نەتەوەشـیان لـەکاتی جـەفا
فەرامـۆش مەکە دەسـتوری وەفا
ناوی گەورەکان فـەرامۆش مەکەن
چرای پیاوەتێ قـەت خامۆش مەکەن
دڕنـدەی کێـوان نـانی بدەیـتێ
ئەو نان‌پێـدانەی هـەر لەبیر ئەبێ

★ ★ ★

بـا پایـەدار بێ حـەقی قـەدیمێ
هەر بەرقەرار بێ خولـقی کەریمێ
هەرکەسێ نـەکا سوپاسی ئینسان
سپڵەیە و نایشـکا سوپاسی یەزدان
چـاوێ نەبینـێ نیعمـەتی زەوێ
چلۆن ئەبینێ فەیضـی مەعنـەوێ
هەرکەس بە ساغێ ڕۆی لە خودا بێ
ئەبێ بۆ سـوپاس بـە دڵ ئـاگا بێ
ئەمەیـە دەرسـی مامۆسـتای نامێ
بەپێی پەیڕەوی شـەرعی ئیسلامێ

# گوڵی پەنجاهەمین ـ گوڵی پاراستنی حەقی خودا

**هەرکەس پاراستی حوقـوقی خودا**
**خوایش ئەیپارێزێ لە دەرد و بەڵا**
**ئینسـانی دڵسۆز حـەقی دابینـە**
**چونـکە پاداشـی دڵسـۆز یەقینە**

پێغەمبەر ، درودی خوای لێ بێ ، ڕۆژێ لە ڕۆژان عەبدوڵلای کوڕی عەبباسی ئامـۆزای خستبوە پاشکۆی خۆی ، پێی‌فەرمو : « یا غـلامُ انّی اُعلّمُكَ كلماتٍ » واتە : ڕۆڵە من چەند کەلیمەیەکت فێرئەکەم بۆئەوەی ڕەفتاریان پێ بکەی و نیشانیشیان بدەی بە خەڵك « احفَظِ اللهَ یحفظكَ ، احفَظِ اللهَ تجِدهُ تجاهَكَ » واتـە : حوقوقی خوا بپارێـزە ، ئەوەی فەرمانی‌داوە بیانکەی بیانکە ، خوایش حوقوقی تۆ ئەپارێزێ ، چونکە پاداشی ئینسان لـە چەشنی کردەوەکانیـەتی . حوقوقی خوا بپارێـزە و مەهێڵە بفەوتێن ، تۆیش لە پاداشی ئەوەدا هەمیشە خوا لە بەردەمی خۆتدا ئەبینی و لە هەمو شتێکدا دێ بەدەمتەوە و یارمەتیت ئەدات « وَاِذا سألتَ فاسألِ اللهَ » واتە : کە ویستیشت داوای شتێ بکەی لە خوای داوا بکە ، چونکە هەمو شتێ بە دەستی خوا و بە دروست‌کردنی ئەوە و کەس پایە و مایە بە کەس نادا خوا نەبێ « واِذا استَعَنتَ فاستَعِن باللهِ » کە ویستیشت داوای یارمەتی و بەفریاگەیشتن بکەی لە کارێکی دنیایی یا قیامەتیدا ، هەر ڕوبکەرە خوا چونکە هەر ئەو بەسەر هەمو شتێکدا دەسەڵاتی ئەشکێ و لەو بەولاوە کەس توانـای هیچی نیە « واعلَمْ اَنَّ الامّةَ لو اجتَمَعَتْ علی اَنْ ینفعوكَ بِشَیءٍ لم ینفعوكَ اِلاّ بِشَیءٍ قد كَتَبَهُ اللهُ لكَ » واتە : بیشزانە ئەگەر خەڵك هەمو کۆببنەوە بۆئەوە قازانجێکت پێ بگەیەنن ، ناتوانن هیچ قازانجێکت پێ‌بـگەیەنن مەگەر لە شـتێکدا کە خوا خۆی لـە چارەی نوسیبی « وَاِنْ اجتَمعوا علی اَنْ یضرّوكَ بِشَیءٍ لم یضرّوكَ اِلاّ بِشَیءٍ قـدْ كَتَبَهُ اللهُ علَیكَ » واتە : ئەگەر خەڵك هەمـو خڕببنەوە بۆئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنن مەگەر لە شتێکدا کە خوا خۆی لە چارەی نوسیبی . « رُفِعَتِ الاقلامُ وَجَفّتِ الصُحُفُ » واتە : هەمـو شتێ بڕاوەتەوە ئـەو قەڵەمەی قەزا و قـەدەری پێ نوسراوە هەڵگیراوە و ، ئەو کاغەزەی قەزا و قەدەری لەسەر نوسراوە وشك‌بوەتەوە . کەواتە پێویسـتە ئادەمیزاد هەر پشت بـە خوا ببەستێ و هەر ئـەو بکا بە پاڵپشتی خۆی و باوەڕی وابێ هەمو شتێ بە خواست و ئارەزوی ئەوە .

ئەم فەرمودە بەنرخە ئینسان بانگ ئەکا بۆئەوە کە بە خوای خۆی پشت ئەستور بێ و لەئاست هیچ ئازارێکدا دڵی نەلەرزێ چونکە ئەوەی بە عیلمی

خوادا ڕابوردبێ ڕوئەدا و خواستی لەسەر بوبێ ڕوبدا هەر ڕوئەدا .. ئیتر مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوە نیە ئینسان پاڵ بداتەوە لە ئیش‌کردن ، چونکە ئەوەی لە عیلمی خوادا ڕابوردوە ببێ ، ڕایشبوردوە کە ئینسان لە ڕۆژێکی تایبەتیدا هەوڵی بۆ ئەدا و هۆی بۆ بەکاردێ . ئەوەیش لە عیلمی خوادا ڕابوردبێ کە نابێ و خواستی لەسەر نەبوبێ ، بەعیلمیشیا ڕابوردوە کە کابرا سەبەب سازێ بۆ ناکا ، یاخود بەپێی ئەو ئوسوڵەی بۆ جیهانی داناوە ، بۆ هەرشتێ سەبەبێکی بڕیار داوە و لە ئایەتی قورئاندا ئەمری فەرموە کە ئێمە شوێنی ئەسباب بکەوین و بەتایبەتێ فەرمویەتی « وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسانِ إلاّ ماسَعى » واتە : هەرکەسێ حەقی تۆڵەی ئەوەندەی هەیە کە بۆی تێکۆشاوە و لەوە زیاتر حەقی نیە و هەرچێ زیاد لەوە دەس‌کەوێ لە دنیادا یا لە قیامەتا هەر بە فەضڵی خوا خۆیەتی .

( بزانن ) مەعنای ئەو قسەیە کە پێغەمبەر فەرموی : کاتێ داوای شتێکتان کرد هەر لە خوای داوابکەن ئەوە ئەگرێتەوە کە داواکردنەکە ڕاستەوخۆ لە خۆتانەوە بێ یا بەهۆی کەسێکەوە بێ کە داواتان لێ کردبێ دوعاتان بۆ بکا ، چونکە حەزرەت درودی خوای لێ بێ لەوساڵەدا کە حەزرەتی عومەری کرد بە سەرگەورەی حەج و ناردی بۆ مەککە ، داوای لێ کرد دوعای خێری بۆ بکا . هەروەها چونکە پێغەمبەر فەرمویشیەتی « أَرْجَى الدَّعَواتِ دُعاءُ الأَخِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الغَيْبِ » واتە : نزیکترین دوعا لە قوبوڵبون لەلایەن خواوە دوعای برایە بۆ برا لە پاشملە .

هەروەها مەعنای ئەو قسەیەش کە فەرموی : ئەگەر ویستت داوای یارمەتییەك بکەی ، هەر لە خوای داوا بکە ئەوەیە یارمەتییەکە ڕاستەوخۆ بێ یا بەهۆی کەسێکی‌ترەوە بێ و هەردو جۆرەکە ئەگرێتەوە چونکە وەسیلەسازێ بە حەزرەت لە ژیانی حەزرەت خۆیدا ڕوی‌داوە وەکو ئەوە کە ( نسائي ) و ( ترمذي ) گێڕاویانەتەوە کەوا پیاوێکی کوێر هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر عەرزی‌کرد بۆم بپاڕێرەوە لە خوا کە لەم کوێرییە ڕزگارم‌کا ، ئەویش فەرموی ئارەزوت هەیە دوعات بۆ ئەکەم و ئارەزوێشت هەیە صەبر بکە و خۆت‌بگرە بۆ جەزای قیامەتت باشترە ، ئەویش عەرزی کرد ئەمەوێ دوعاکەم بۆ بکەی چونکە کەسم نیە دەستم ڕاکێشێ و هاتوچۆم بۆ ناکرێ . پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ فەرموی بڕۆ دەس‌نوێژێکی باش بگرە و بپاڕێرەوە لە خوای تەعالا و بڵێ : « اللّهمَّ إنّي أسألُكَ وأتوَجَّهُ إليكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ ، يا مُحَمَّدُ إنّي أتوَجَّهُ بِكَ الى رَبّي في حاجَتي لِتُقْضى . اللّهمَّ شَفِّعْهُ فِيَّ » واتە : ئەی خودا من لێت ئەپاڕێمەوە و ڕوت تێ ئەکەم بەهۆی موحەممەدی پێغەمبەری خۆتەوە کە پێغەمبەری ڕەحمەتە . ئەی موحەممەد من ڕوت تێ ئەکەم و ئەتکەم بە وەسیلە بۆلای خوا بۆئەوەی ئەم مەبەست و

داوایەم بۆ جێبەجێ ببێ . خوایە تکای لەبارەی منەوە قوبوڵکە . « فَعادَ وَقَدْ ابْصَرَ » واتە : کابرا ئەم دوعایەی کرد و دوعاکەی گیرا بۆ و چاوی ڕۆشن بوەوە .

( بخاري ) لە تەئریخەکەیدا و ( ابن‌ماجه ) و ( حاكم ) لە (مستدرك)دا ئەم حەدیثەیان بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاوەتەوە . (جلال الدینی سیوطی)یش لە (الجامع الكبير) و (الجامع الصغير)دا گێڕاویەتەوە .

بە وەسیلە کردنی جاهی مردوێش لەپاش مردنی دروستە و بەڵگەی لە دیندا هەیە وەکو ئەو حەدیثە کە (طبراني) لە (كبير) و (اوسط)دا و (ابن‌حيان) و ( حاكم )یش گێڕاویانەتەوە و تەصحیحی ئیسنادەکەشیان کردوە لە ( انس )ی کوڕی ( مالك )ەوە خوای لێ ڕازیٰ بێ ئەفەرموێت کە ( فاطمه )ی کچی ( اسد ) دایکی حەزرەتی (علي کوڕی ابوطالب) وەفاتی کرد پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ لایا دانیشتبۆ، چونکە وەختی خۆی پاش وەفاتی (آمنـە)ی دایکی حەزرەت، ( فاطمه ) حەزرەتی بەخێو کردبۆ . حەزرەت فەرموی خوا ڕەحمەت پێ بکا ئەی دایکی من لەپاش دایکم و ئەمری فەرمۆ قوماشێکی بوردی یەمەنییان بۆ کرد بە کفن و قەبریان بۆ هەڵکەند . کە گەیشتنە ئاستی ئەلحەدەکەی ، حەزرەت خۆی چوە ناو قەبرەکە و ئەلحەدەکەی هەڵکەند و گڵەکەشی بە دەستی خۆی ئەکردە دەرەوە . کە قەبرەکەش تەواو بۆ خۆی لەناویا ڕاکشا . ئەنجا فەرموی : « اللهُ الَّذي يُحْيِي وَيُمِيتُ . وَهُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ . اغْفِرْ لِاُمّي فاطِمَةَ بِنْتِ اسَدٍ وَوَسِّعْ عَلَيْها مَدْخَلَها بِحَقِّ نبيّكَ والاَنْبِياءِ الَّذينَ مِنْ قَبْلي فانَّكَ ارْحَمُ الرّاحِمينَ » واتە: خودا ئەو خودایە کە خەڵك ئەژێنێ و ئەشمرێنێ و خۆی هەمیشە زیندوە و هەرگیز نامرێ . خوایە لە فاطمەی کچی ئەسەدی دایکم خۆش ببە و گۆڕەکەی گوشاد بکە بۆ خاتری من خۆم و پێغەمبەرەکانی پێش خۆم ، تۆ لە هەمۆ بەڕەحمێ بەڕەحم‌تری .

هەروەها بە وەسیلە کردنی خاتری پیاوچاکان و کرداری چاکیش دروستە. (ابن‌ماجه) بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتەوە لە (ابوسعیدی خدري )یەوە کەوا پێغەمبەر فەرمویەتی : کەسێ لە ماڵی خۆی دەرچێ و ئەم دوعایە بخوێنێ ئەوە خوا ڕوی ڕەحمی تێ‌ئەکا و بەزەیی پیا دێتەوە . دوعاکەیش ئەمەیە « اللّهُمَّ اِنّي اسْاَلُكَ بِحَقِّ السّائِلينَ عَلَيْكَ واَسْاَلُكَ بِحَقِّ مَمْشايَ هذا الَيْكَ ، فانّي لَمْ اخْرُجْ اَشَراً وَلا بَطَراً وَلا رِياءً وَلا سُمْعَةً ، خَرَجْتُ اتِّقاءَ سَخَطِكَ وَابْتِغاءَ لِمَرْضاتِكَ ، فَاسْاَلُكَ اَنْ تُعيذَني مِنَ النّارِ وانْ تَغْفِرَ لي ذُنوبي ، فَانَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنوبَ الاّ انْتَ » واتە : خوایە من داوات لێ ئەکەم بە حەقی حورمەتی ئەوکەسانە کە داوای ڕەحمەتیان لە تۆ کردوە . داوات لێ‌ئەکەم بە حەقی حورمەتی ئەم ڕێ‌کردنەم بۆلای تۆ ،

چونکە من بۆ فیزکردن و خۆبەزلزانین نەهاتوم .. بۆئەوە نەهاتوم خەڵك بمبینن یا ناوبانگی باشی خۆم ببیسمەوە . بۆیە هاتوم خۆم لە عاجزبونی تۆ بپارێزم ، بۆئەوە کە ڕەزامەندیٔ تۆ دەستبخەم . داوات لیٔ ئەکەم پەنام بدەی لە ئاگری دۆزەخ و لە گوناهەکانم خۆش ببیٔ ، چونکە لە تۆ بەولاوە کەس لە گوناه خۆش نابیٔ .

داوای دوعاکردن لە زیندوێش دروستە وەکو پێغەمبەر درۆدی خوای لیٔ بیٔ فەرموێەتی بە حەزرەتی عومەر لەکاتێکا کە کردی بە سەرکردەی حەج و ناردیٔ بۆ مەککە : « لاتَنْسَنا مِنْ دُعائِكَ يا اُخَيْ » واتە : برای خۆشەویست فەرامۆشمان مەکە لە دوعای خێرت . عومەریش فەرموێەتی : « كَلِمَةٌ ما يَسُرُّ انَّ لِي بِها الدُّنْيا » واتە ئەم فەرمودەی حەزرەتە قسەیەکە حەزناکەم بیگۆڕمەوە بە موڵکی دنیا . دوعا بۆ مردوٕ کردنیش لە گەڵیٔ ئایەتی قورئاندا هەیە . ئەم هەموٕ جۆرانە کە باسمانکردن قازانجیان هەیە چونکە گەیشتنی سودیان لە فەضڵی خوا خۆیەوەیەتی و پەیوەندی بە عەدالەتەوە نیە، چونکە عەدالەت لەسەر بناغەی ئایەتی « وَاَنْ لَيْسَ لِلاِنْسانِ الاّ ماسَعى » بەڕێوە ئەڕوا .

کەواتە دروستە ئینسان پایە و جاهی خودا بکا بە وەسیلە و بڵیٔ خوایە بۆ خاتری پایەی دڵسۆزیٔ و ساغیٔ کردەوەی باشی پێغەمبەر درۆدی خوای لیٔ بیٔ یا فلانە ئەصحابە یا فلانە وەلیٔ تەوفیقم بدە و باوەڕی وابیٔ خوا بە میهرەبانیٔ خۆی دوعاکەی گیرا ئەکا ، وەکو ئەوە کە حەزرەتی عومەر لەکاتی پاڕانەوەدا لە خوا بۆ باران حەزرەتی عەبباسی مامی پێغەمبەری کرد بە وەسیلە بۆ لای خوا . بە تکاکارکردنی دڵسۆزیٔ ئینسان خۆی و کردەوەی خۆیشی هەر دروستە وەکو لە ( صحاح )دا بەیانکراوە لە باسی ئەو سیٔکەسەدا کە لە ئەشکەوتەکەدا گیریان خواردبوٕ .

| | |
|---|---|
| ڕەهبەری بەرزی فروستادەی خوا | بۆ ( ابن عباس ) وا دەرسی دادا |
| فەرموی تۆ حەقی خودا ڕابگرە | حەقت ڕائەگریٔ خواوەندی گەورە |
| کە فەرمانی ئەو ڕابگریٔ بە دڵ | لەگەڵتا ئەبیٔ مەنزڵ بە مەنزڵ |
| باوەڕت وابیٔ ئادەمیٔ هەموٕ | ناتوانن تەنها ئەوەندەی یەك موٕ |
| بگەیەنن پێت قازانج یا زیان | مادەم ئیرادەی وانەبیٔ یەزدان |

★ ★ ★

| | |
|---|---|
| ئەم دەرسە بەرزەی ڕەهبەری نازدار | بەسە بۆ دین و بۆ دنیای هوشیار |
| یەعنی هەر خودا پەروەردگارە | هەر ئەو کلیلی گوشادیٔ کارە |
| دڵپاکیٔ ئینسان بە ناوی ئەوە | ڕۆناکیٔ جیهان بە ناوی ئەوە |

تەوانایێکە لەنــاو بــەردی ڕۆت — وەك خوێنی جگەر دەرئەكا یاقـوت
بۆ سـکی صــەدەف نمێ ئەنێـرێ — سبەی دەریاگەرد گەوهەر ئەژمێرێ

★ ★ ★

بـۆ پاراسـتنی ( نـوح نجـیّ الله ) — کەشتێ سازئەکا بـۆ دەفعی بـەلا
بـۆ پاراسـتنی گیـانی ئیبـراهیم — تەنـوری ئاگـر ئـەکا بـە نەعیـم
یونس دەرئەکا لـە سکی نەهەنـگ — یوشەع سەرئەخا لە مەیدانی جەنگ
بـۆ پاراسـتنی یوسـفی کەنعـان — بنی بـیری کرد بۆی بـە گوڵستان
تا ملی عیسـا لـە پـەت دەربێنێ — جوڵەکەیـەکی پـێ ئەشـوبهێنێ
بە جاڵجاڵـۆکەی لاوازی بـێ ڕەوت — پەردە ئەتەنێ بۆ دەرگای ئەشکەوت
هەتا ڕۆژگار بێ سـەروەری عالـەم — بێ بـە ڕۆژی ڕۆن بـۆ بەنێ ئـادەم
دەمـۆکە ئـەکا بـە مەمـەی دایە — تـا منـاڵ بـژێ بـێ لایـە لایـە
بژنی کـوێ ئـەکا بـە دایەی مـاڵێ — گوانی ئەخاتـە دەمی ( قۆچـاڵێ )

★ ★ ★

سوێند بە ( والعصر ) مەعنای وەهایە — گەردشی گـەردون لەدەست ئەوایە
خودا ئـەم چەرخە وەهـا ئەگۆڕێ — عاقڵ سەرسام بێ و سەری بسوڕێ
ئەقلەب ڕوداوی چەرخی کائینـات — وەك نمونـە وان لە بۆ موعجیـزات
یەعنی هەر خـودا پشت و پەنایـە — پەنـا خودایـە بـۆ گشت قەزایـە
جا تۆ بە هەرجۆر خـۆت دایە پەنا — ئەو بە حـاڵی تۆ بەصیـرە و بینـا
ئەمەتـە دەرسم تـا ئاخـر زەمـان — هیچ‌کەس مەناسن بە غەیری یەزدان
هەر ئـەوە پشت و پەنـا و ئەمانە — کلیل بـە دەسـتی دەرگای ژیانـە
لە غەیـری خـودا کەس کـارا نیە — هیچ‌کەسـێ هیچـی لەبـارا نیـە

## گوڵی پەنجاویەك ــ گوڵی ڕەوشتی ناو مزگەوت

مزگەوت لـە ئـەرزا ماڵی خـودایە
( بيت المعمور )ی صەفحەی سەمایە
قـەڵای پـەنایە بـۆ موسـوڵمانان
ماوای طاعـەت و حـەمد و ثەنایـە

خوای تەعالا لە قورئانا فەرمویەتی :

وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا

واتە : لەلاینی خواوە خەبەرم دراوەتێ کە مزگەوتەکان بـۆ عیبادەت و طاعەتی خوا دروست‌کراون ، کەواتە لەگەڵ ناوی خوادا ناوی کەس مەهێنن .

جا هەر لەبەرئەوە کە مزگەوت ماڵی خودایە و کەسێ خانوویەك بۆ خواپەرستن بکاتەوە شایانی ئەوەیە خوایش خانوویەك بۆ ئەو بکاتەوە، پێغەمبەر، درودی خوای لێ بێ ، فەرموویەتی : « مَنْ بَنَى لِلّٰهِ مَسْجِداً وَلَوْ كَمِفْحَصِ قَطاةٍ ، بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ » واتە : کەسێ لەبەر ڕەزای خوا مزگەوتێ بکاتەوە هەرچەند ئەوەندەی قەفەزی قەتییەکیش بێ ، خوای تەعالا لە تۆڵەی ئەوەدا ماڵێکی بۆ ئەکاتەوە لە بەهەشتدا . جا مادەم مزگەوت بە ساغێ ماڵی خوایە و بۆ عیبادەت دروستکراوە ، پێویستە لەسەر موسوڵمان بەشێوەی ئیحتیرامەوە بڕواتە ناو مزگەوتەوە ، واتە دەسنوێژ بگرێ و لەش و پۆشاکی پاك بێ ، بەڵکو هەر بەرگێکی خاوێن و بەنرخی هەبێ ئەوە بکاتە بەری، وەکو خوای تەعالا فەرموویەتی : « وَخُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ » واتە : هۆی پاك و پوختەیی و جوانێ خۆتان هەڵبگرن لەگەڵ خۆتان کە ئەچنە ناو هەر مزگەوتێکەوە . یەکەم لەبەرئەوە کە ئینسان تا پاك و خاوێنتر و جوانتر بێ ئاسایشی لەشی زۆرترە و ئەتوانێ بە خۆشی و شادمانییەوە خواپەرستی خۆی بکا . دۆهەم لەبەرئەوە کە لەبەر چڵك و بۆنی ناخۆش نابێ بەهۆی ئازاردانی موسوڵمانانیتر . سێهەم لەبەرئەوە کە فریشتەی ڕەحمەت بێزارن لە بۆنی پیس و شادمانن لە بۆنی خۆش .

سوننەتە ئینسان کە ڕۆیشتە مزگەوت پێی ڕاستی پێشبخا و گورج نییەتی ئیعتیکاف بێنێ ، یەعنی نییەتی ئەوە بێنێ کە بۆ عیبادەت لە مزگەوتدا ئەمێنێتەوە و بەرلەوە دانیشێ دۆ ڕکات نوێژی ( تحية المسجد ) بکا واتە ئەو دۆ ڕکاتە نوێژە دیارییە بۆ مزگەوتی هێناوە . پاش ئەوە سوننەتی ڕاتیبەی نوێژی ئەو کاتە بکا و پاش ئەوە خەریکی نوێژە فەرزەکەی بێ . لەپاش فەرزەکەشی تا لە مزگەوتا ئەمێنێتەوە خەریکی قورئان خوێندن و ذیکری خوای تەعالا و ئەو ویردانە بێ کە سوننەتن . هەروەها بەگوێرەی حاڵ خەریکی صەلەوات دان بێ لە حەزرەتی فەخری عالەم درودی خوای لێ بێ ، چونکە هەرکەس تاقە صەلاواتێ بدا لە حەزرەت خوای تەعالا دە ڕەحمەت ئەڕێژێ بەسەریدا ، بەڵکو زیاتریش هەرچەند خۆی بیەوێ ، چونکە صەلاوات دان لە حەزرەت درودی خوای لێ بێ ئەبێ بەهۆی خۆشویستنی و خۆشویستنیشی ئەبێ بەهۆی پەیڕەوی لێ کردنی و ، پەیڕەوی لێ کردنی ئەبێ بەهۆی ئەوە کە خوای تەعالا ئەوکەسەی خۆشبوێ کە پەیڕەوی لە پێغەمبەر ئەکا و ئەمەش عەینی سەعادەت و پیرۆزییە بۆ ئادەمیزاد . خوای تەعالا فەرموویەتی : « قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ » واتە : بڵێ بەو خەڵکە ئەگەر ڕاست ئەکەن . خواتان خۆشئەوێ ، شوێنی من بکەون خوا خۆشی گەرەك ئەبن .

دروست نیە بۆ کەسێ لە مزگەوتدا بێ بە قەطعێ قسەی ناشیرین و

نارەوا و قسەی دنیایی رووت و قسەی گاڵتە و گەپ و هیچ کردەوەیەکی ناپەسەند بکا . هەروەك دروست نیە تف دابکا لە مزگەوتدا و بە پێڵاوی پیس یا بە هەر شتێکی پیسی‌تر پیسی بکا . دروستیش نیە بە لەشی پیسەوە تیا بمێنێتەوە . ئەگەر لە کاتی نوێژی جەماعەتیشدا لە مزگەوتا بۆ سوننەتە بڕوا لە ڕیزی پێشەوە شوێنی خۆی بگرێ . ئەگەریش شوێن لە ڕیزی پێشەوە نەمابوو دروست نیە هەنگاو بەسەر خەڵکدا بنێ و دروست‌نیە بەپێش دەمی نوێژکەردا هاتوچۆ بکا . هەروا پێویستە ڕێك ڕاوەستێ لە ڕیزدا و بلکێ بەو خەڵکەوە کە لە ڕاست و چەپیەوە وەستاون ، بەڵام وانەکا کە ئازاریان بدا . جا ئەگەر ئینسان بەم‌شێوەیە مزگەوتی ئاوەدان کردەوە ئەوە مەعنای وایە ئەوکەسە موسوڵمانە وەکو خوا فەرمووێـەتی : « اِنَّما یَعمُرُ مَساجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالیَوْمِ الآخِرِ » واتە : بەڕاستی کەسێ مزگەوتی خوا ئاوەدان ئەکاتەوە کە باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی قیامەت بێ . پێغەمبەریش فەرمووێەتی : « اِذا رَاَیتُمُ الرَّجُلَ یَعْتادُ المَسْجِدَ ، فاشْهَدُوا لَهُ بِالایمانِ » واتە : کە دیتان پیاوێ عادەتی گرتوە بە مزگەوتەوە و هەمیشە ئەچێ بۆ مزگەوت ، شایەتی بۆ بدەن کەوا موسوڵمانە ، چونکە دەوام‌کردن لەسەر کرداری چاك نیشانەی ئەوەیە ئەوکەسە پیاوی چاکە .

سوننەتە بۆ موسوڵمان ئەگەر پاش نوێژ لە مزگەوتدا مایەوە ئەو ویردانە بخوێنێ کە سوننەتن وەکو ( سبحان الله ) و ( الحمد لله ) و ( الله اکبر ) یەکی سێ‌وسێ جار ، دواییشیان بێنێ بە (لا اله الا الله). سوننەتیشە (آیة الکرسي) بخوێنێ . لەپاش نوێژی بەیانی و مەغریبیش دە جار دە جار بڵێ ( لا اله الا اللهُ وحدَهُ لاشریكَ لهُ، لهُ الملكُ و لهُ الحمدُ یُحیي ویُمیتُ ، بیدِهِ الخیرُ ، وهو علی کلِّ شیءٍ قدیر ) . سوننەتیشە لەپاش نوێژەکان لە خوا بپاڕێتەوە بۆ خێری دنیا و قیامەت بۆ خۆی و بۆ موسوڵمانان . هەروا سوننەتە ئینسان ئیحیای (بین الطلوعین) و (بین الغروبین) بکاتەوە ، واتە پاش بەرەبەیان تا خۆر دەرئەکەوێ و پاش ڕۆژاوابوون تا سوورایی کەناری ئاسمان ون ئەبێ و نوێژی عیشا دێتە پێشەوە ڕووبەڕووی قیبلە دانیشێ خەریکی عیبادەت و ذیکری خوا بێ .

**ڕۆڵەی دلبەندی مایل بە طاعەت — تێکۆشەری ڕێی بەخت و سەعادەت**
**مزگەوت لە ئەرزا ماڵی خودایە — جێگای طاعەت و ذیکر و دوعایە**
**واتە سکاڵا و پاڕانەوەی تۆ — لەلای خالیقی هەموو کۆنە و نۆ**
**بۆ پاراستنت لە فیتنەی زەمان — لە شەڕی ئینس‌و لەنەفس‌و شەیتان**
**لەبۆ یارمەتیت بۆ بەختیاری — بۆ سەرکەوتن و بۆ پایەداری**
**ماڵی کە ماوای ئەم باسانە بێ — کۆمەڵگای ئەم گشت خواناسانە بێ**
**ئەبێ بە ئەدەب بە دەس‌نوێژەوە — بە ڕووی شەرمینی شەونم ڕێژەوە**

بێدەنگ و صـەدا بڕۆیتـە نـاوی
دەس‌نوێژێ بگرێ لە حەوز و ئاوی

جا دوو ڕکات نوێژ دیـاریێ مزگەوت
جێ‌بەجێ بکەی بەگوێرەی ڕێکەوت

واتە بە نوێژی سوننەت یاخود فەرز
سەری بەندەگی دانێی لەسەر ئەرز

لەپاش نوێژەکان هەرچێ دەست‌ئەدا
قورئـان بخوێنـە یا ذیـکر و دوعا

جـا ئەگـەر کـاتی ئامـۆژگارییە
بۆ ئەو ڕێ کـە ڕێـی بەختیـارییە

فەرموو بەئـەدەب بە یاسـای دانا
گوێ بگـرە لەبۆ مامۆسـتای زانـا

ئەگەر لە لەفظی بـاش حاڵێ نەبۆی
پرسـیار بکە بـە ئەدەب لـە خۆی

مامۆستایش ئەبێ دڵ پڕ لە نوور بێ
لە فیز و هەوا و تەکەبور دوور بـێ

لـە ڕێی خـودادا بـە میهـرەبانێ
ڕابگـرێ حـالی دانیشـتوانی

بە واتەی سادە و صـاف و بێ‌گرێ
ئیرشادیان بـکا بـۆ کاری بـەجێ

قەدری هەرکەسێ بەقەد شانی خۆی
ڕابگرێ هەتـا گوێ ڕابگـرێ بۆی

بە وتاری وشك هەرکەس بـواردی
ئاسن ئەکـوتێ بـەڵام بە ساردێ

با واتەی نەرم و گەرم و جوان بێ
جارجاریش قسەی‌خۆش لەنێوان بێ

ڕۆبـکاتە هەموو بە نۆبـە و مۆڵەت
ئەگەر طالیبـە بۆ یومـن و دەوڵەت

کەس وا تێ‌نەگا گوێی پێ نەدراوە
بـە ئینسـانێکی هیچیـان داناوە

بوە بـە عادەت لـە گشت جیهـانا
مادّە وا لەپێش مەعنـای ئینسانا

پایەت بۆ قسـەت بەڕەواج ئـەبێ
پایەت بۆ خەلکت پێ موحتاج ئەبێ

هەرچۆن کـە ژیان بە نان و ئـاوە
ئەو شـتە شتە کە لە بەرچـاوە

واقیع خۆی دەرسی واقیع دائەدا
بە غەیـری واقیع مەکـەوە سەودا

جارێ تـۆزە بـۆی تـۆ لە نەزانـێ
جارێ‌تر هەنـگاو بـۆلای تـۆ نانێ

گەلێ پەیمانی چەند سـاڵە بەسراو
دای بـە فەنادا قسـەی دوو ناپیاو

گەلێ جار ئینسان بـە خۆشێ وتار
ئیشی وائـەگا نایـکا صـەد هەزار

وتارتان نـۆش بـێ لە لێـو و دەما
ڕوخسارتان خۆش بێ لەگەڵ عالەما

هۆش لەناو دڵا و نـۆش لەناو دەما
وتـارت ئـەدا بـە گـوێی عالـەما

★ ★ ★

لۆمەی کەس مەکە بە شێوەی دیارێ
گەر سـوودت ئەوێ لە ئامـۆژگارێ

ڕەهبەری نازار بـە شێوەی گشتێ
وەعظی دائـەدا بۆ دەور و پشـتێ

گـەلێ بریـنی قـەدیمی نابـار
بـە دەردی وتـار دێتـەوە ئـازار

★ ★ ★

وتارێ بدە کە خـاوەن سـوود بـێ
کورتا و پوختە بێ و ڕوو لە مەقسود بێ

بەڵکو حـازران لـە مەعنـای بگەن
نەك بـە نەفـامێ لـە ڕێ لابـدەن

ئەگـەر ئیشـکالێ لە وتـارا بـوو
زوو بییـکەرەوە بـا تێبـگەن زوو

شەرم نەتگرێ و حـەق نەدەیتەوە
ئەگینـا بـۆچێ دەم ئەکەیتـەوە

هەرچەند پایەیان زیـاتر بێ لە تۆ
ئیستا وەك شـاگرد لێت کۆبوونەتۆ

★ ★ ★

بەم پێیە مزگەوت ئەبێ بە کەشتی	تیا کۆئەبنەوە دەستەی بەهەشتی
پێغەمبەران و فریشتەی خوا	ستایش ئەکەن بۆ مزگەوتیوا
کۆمەڵ کە دوور بێ لەم ئادابانە	مزگەوت ئەگۆڕێ بە قاوەخانە
کە مزگەوت کرا بە جێی قڕەفڕ	خواپەرستی تیا ئەچەقێتە قوڕ
دوورە لە خێر و فەیض و بەرەکەت	نادا بەسەریا بارانی ڕەحمەت

★ ★ ★

ڕەحمەت لە کەسێ تەمێ وەرئەگرێ	بە تەمێ و تەسکین ئەژیێت و ئەمرێ
( نامێ ) وا ئەڵێ بە ڕۆڵەی زانا	تەمێ زینەتە لە ڕوی جیهانا
خوایە من تەمێی خاسانم ئەوێ	سولوکی ڕێگای ئیحسانم ئەوێ
ڕێگای ئەو ذاتەی پێتوت بۆ تەکریم	( انـّكَ لعَلى خُلُقٍ عظيم )
بڕژێ بەسەریا صەلات و سەلام	بەدرێژایی هەمو صوبح و شام

## گوڵی پەنجاودو ـ گوڵی ژیانی بەختەوەر

پێویستە ئینسان بۆ ماوەی ژینی
دو هێزی هەبێ دنیایی و دینی
قەت بە چاوێك و دەستێك و پێیەك
نە باش کار ئەکەی نە باش ئەبینی

پێغەمبەر ، درودی خوای لێ بێ ، فەرمویەتی :

**لَيْسَ الرَّجُلُ رَجُلَ الدُّنْيا ولا الرَّجُلُ رَجُلَ الآخِرَةِ ، بَلِ الرَّجُلُ رَجُلُهُما .**

واتە : پیاو ئەو پیاوە نیە کە بەس خەریکی دنیا بێ . هەروەها ئەو پیاوەیش نیە کە بەس خەریکی قیامەت بێ . پیاو ئەو پیاوەیە پیاوی دنیایش و قیامەتیش بێ .

ئادەمیزادیش وەك هەر گیانلەبەرێکیتر ماوەیەکی تایبەتی هەیە لە دنیادا و کە ئەو ماوەیەی بەسەرچو ئەمرێ . ئەو ماوەیە بریتییە لەو ئەندازەیەی خوای تەعالا بە خواستی خۆی بۆی داناوە بژێ و لەوەش تێناپەڕێ ، ئیتر خواه تەواو بونی ئەو ماوەیە بەهۆی ڕوداوێکەوە بێ وەك ئاگر و ئاو و گەستنی مار و دڕندە و کوشتن و شتیوا ، یا بەهۆی مردنی سروشتییەوە بێ وەك نەخۆشی و هێزی ژیان پێوەنەمانی لەش کە سروشتناسەکان بڵێن ئەم لاشەیە توانای ژیانی لەوەندە زیاتری پێوە نەماوە .

بەپێی ڕێوشوێنی شەریعەتی ئیسلام و لەسەر بەراورد و لێکدانەوەی زانایانی جیهان ، پێویستە لەسەر ئادەمیزاد چەند شتێك بکا بە خەتی جوڵانەوەی خۆی لە ژیاندا . یەکەم : ئەوەیە ئینسان لەکاتێکەوە تەمیز و هۆش پەیدائەکا دەس بکا بە فێربوونی زانست و هونەر و پیشە و فرمانی وا کە لەگەڵ دین و دنیا و ڕۆژگاری ژیانی خۆی بگونجێ بەجۆرێ کە ئینسانێکی ڕەسای وای لێ پەیدا بێ بە کاری ئیشی دین و دنیا بێت تا لە دنیادا بە سەربەرزی بژێ و لە قیامەتیشدا بە سەرفەرازی بگا بە قەرارگای خۆی و بە لیقای ذاتی خوا شادمان بێ . دوهەم : ئەوەیە کە پشت و پەنای ڕاستەقینەی ئینسان لە ماوەی ژیانیا هەر ذاتی خودا بێ ، چونکە ئەو دروستی کردوە و ئەو چارەنوسی بۆ داناوە و ئەو هەمو سود و زیانێکی وا لە دەستدا و هەر ئەو ئەتوانێ قازانج بگەیەنێ و زیان لابەرێ .

لەپاش ذاتی خوا ئەبێ پشت و پەنای یەکەمی ئینسان نەفسی خۆی بێ و بە شان و باڵی خۆی بنازێ و هیممەتی قایم و دڵی ئەستور بێ و قیمەتێکی موناسب بۆ خۆی دابنێ . ئیتر ئەگەر بەهۆی خزمایەتی و ژن و ژنخوازەوە لەگەڵ چەند کەسێکدا پەیوەندییەکی هەبێ یا لە هەڵسوڕانی ژیاندا چەند کەسێك بوبون بە هاوڕێی ، ئەبێ سوپاسی خوا بکا لەسەر ئەوە و بەگوێرەی توانا کەڵك لەو پەیوەندییە وەربگرێ و گەشەی پێ بکا ، بەڵام نابێ بیانکا بە بنکەی یەکەمی بەڕێوەچونی کاروباری چونکە تەنانەت باوك و دایکیش کە دڵسۆزترین کەسن بۆ ئادەمیزاد ، بۆئەوە ناشێن جێگەی ئینسان خۆی بگرنەوە بۆی . سەرەڕای ئەوە بەشێکی زۆری پەیوەندی خەڵك بە بێوەفایی و لێکبڕان دوایی دێ ، بەجۆرێ هەندێ کەس هاتونەتە سەر ئەو باوەڕە کە وەفا شتێکی نایابە و کەم دەس ئەکەوێ . سەعدی شیرازی لە حیکایەتێکدا بە ناوی یەکێ لە قارەمانانی حیکایەتەکەوە ئەڵێ :

**یـا وەفـا نەبـوە لـەم جیهـانەدا**
**یـا هیچکـەس نـایکـا لـەم زەمـانەدا**

زۆرتری بناغەی بێوەفایی ئەگەڕێتەوە بۆئەوە کە ئەوکەسانەی جاران برادەر بون و پاشان بەرابەر بە یەك بێوەفایان لێدەرچوە ، دۆستایەتییەکەیان لەسەر ئەساسی سودی تایبەتی دامەزراندوە و بە نەمانی ئەو سودە تایبەتییە دۆستایەتییەکەیان تێکچوە . ئەگینا ئەگەر دو کەس لەسەر ئەساسی یەکێتی بیروباوەڕ یەك بگرن و بین بە دۆست ، قابیل نیە تا مردن لە یەك جوێ ببنەوە . بەڵکو ئەتوانین بڵێین ئەوانەی جاران دۆست بون و ئیستا لەیەك جوێ ئەبنەوە ، هەر لە سەرەتادا دۆستی ڕاستەقینە نەبوون .

سێهەم : ئەوەیە ئینسان لەسەر بناغەی پێویستی واقیع بڕوا بە ڕێدا و

پێچەوانەی ئەو پێویستییە نەجوڵێتەوە . ئینسان لە زستـاندا بە ڕۆتی و لـە هاوینا بە قاپۆتەوە نازێ . ماڵ و خێـزان بە بـێ‌ژیواری ڕەسـا بە خۆشـێ ڕانابوێرن . میوان بێجگە لە قسەی خۆش نان و ئاوی ئەوێ . دوژمن بە هێز ئەبەزێنرێ . سوپا بە دڵدانەوە و پـارە بۆ خەرج‌کردن دڵی خـۆش ئەکرێ . ئینسانی بێ‌شەرم پێویستی بەتەمێیە و کوڕ و کچ کە گەورە بۆن ئەمیان ژن و ئەویان شوی ئەوێ . قەرەبـاڵغی وڵات کە زۆر بۆ ئیش‌وکـاری ئەوێ . بـۆ ئیدارەی وڵات پیاوی بە کیفایەت پێویستە .. تاد .. ئەم باسە باسـێکی زۆر بەئەهمیەتـە .

چوارەم : ئەوەیە ئینسـان لەوکاتانەدا کە حورمەتی هەیە و خەڵك دەستی ماچ ئەکەن پێویستە تێ‌بگا کەوا ئەو خەڵکە گەلێکیان لەبەر گومانی قازانجێك و گەلێکی‌تریان بۆ دەفعی زیانێك و هەندێکیان بۆ چاولێ‌گەرێ و هەندێکی‌تریـان بۆ فێڵ و تەفرەدان و کەمێکیشیان لەبەر ساغێ و شوعوور و پێوەند دەستی ماچ ئەکەن . کەواتە نابێ لە خۆی بایێ ببێ و بەو دەستماچ‌کردنە بنازێ و لە خـۆ قایم‌کردن و خەریك‌بۆن بە ئەسبابی مانەوە و بەختەوەرێ خۆیەوە غافڵ ببێ ؛ چونکە کاتێ کە چەرخی گەردۆنی لێ هەڵگەڕایەوە دوژمنان سـواری سـەری ئەبن و ، چـاو لە خەڵك کردوەکانی ئەوسـا ئەکەوئە پـاڵ دوژمنەکـانی و ، قازانج‌خوازەکانیش مادەم بە قازانجی خۆیان نەگەیشـتبن جنێـوی ئەدەنێ و ئەگەر پێیشی گەیشتبن بە ئامانجی خۆیان گەیشتۆن . ئیتر مەبەستیان نیـە ئەو چێ بەسەردێ . تەنها دڵسۆزەکان ئەمێننەوە . ئەمانیش ماوەیێ هەوڵی بۆ ئەدەن یاخود هەر لە سەرەتاوە ڕائەکـەن و خۆیـان ئەشـارنەوە ، یـاخود بۆ پاراستنی خۆیان ئەچنە لای دوژمنەکانی و لەگەڵ ئەم ئەبن بە دوژمن و ئەمە بە بەراورد دەرکەوتوە .

پێنجەم : ئەوەیە پێویستە ئینسان ئەوەندەی پایە و مایەی خۆی هوشیار بێ و ئاگادار بێ لە بیروباوەڕی کەسانی دەوروبەری خۆی و گۆڵ نەبێ بەئاسانێ هەڵێ‌خەڵەتێنن . ڕەوا نیە ئینسان نەتوانێ دۆست و دوژمنی خۆی لەیەك جوێ بکاتەوە و پێویستی یەکەم کە پیاوەتێ و پێویستی دۆهەم کە بەرگرێ و پێویستی سێهەم کە مودارایە جێ‌بەجێی نەکا . ئینسـان نـابێ هەرگیز ئەمین بێ بەرابەر بەوکەسانە کە بەدخۆییان بۆ بوە بە خۆ . ئەگەر جارێکیش هەڵخەڵەتا و بەهەڵەدا چۆ نابێ جارێکی‌تر هەڵخەڵەتێ . هەروەها پێویستە هەمیشە بـە ماڵ و بە حاڵ و بە خامە و نامە دۆست بۆ خـۆی زۆر و دوژمن کەم‌کاتەوە .
شەشەم : ئەوەیە ئینسان هەرگیز لە وڵاتی بێ‌قانۆن و بێ‌گەورەدا دانەنیشێ . وڵات کە قانۆن و گەورەی هەبۆ ئینسـان ئەتوانێ لـە هـەر ڕێگەیەکەوە بێ حورمەت و شانی خۆی تیا بپارێزێ. بەڵام شوێنی بێ‌قانۆن و بێ‌گەورە وانیە و ڕزگاربۆن تیا زەحمەتە .

حەوتەم : ئەوەیە لە شوێنێکدا کە گەورەی تیابێ ، ئینسان مادەم بیەوێ بمێنێتەوە ، ئەبێ لەگەڵ ئەو گەورەیەدا ڕێك‌بکەوێ ، ئەگینا ئـەگەر گەورەکە زوێر ببێ لێی فەرمانئەدا دەست و پێوەندی ئەوەی نەشێ پێی‌بکەن ، چونکە دەست و پێوەند وەك حەیوانی بێ‌هۆش وان . گەورە کە وتی فلانکەس ئینسانی چاکە دەستی ماچ بکەن ، دەستی ماچ ئەکەن و ئەگەر لە هەمانکاتدا پەشیمان ببێتەوە بڵێت فلان پیاوی خراپە بیکوژن ، ئەیکوژن . ئەم حاڵە حاڵێکی گشتییە بۆ هـەر گـەلێکی نەخوێنـدەوار و نیمچـە خوێنـدەوار و بێ‌نەگەیشتوو و بێ‌نەگەیشتوو ، ئەگینا ئەم هەموو پشێوییە لەنێوان دوو برای گەورەدا بـۆچی و لەسەرچی پەیدا ئەبێ ؟ هەشتەم : ئەوەیە ئینسان چەند پێویستە خـۆ بـە ئەخلاقی بەرزەوە بگرێ ، ئەوەندەیش پێویـستە تێبکۆشـێ بـۆ پاراسـتنی حورمەت و ئابڕووی خۆی بەتایبەتی ئەگەر پیاوێکی گەورە و بەسوود بـێ بـۆ کۆمەڵ . ئەم پاراستنی حورمەتە زووربەی بە ماڵی دنیا صەرف‌کردن و بەشێکی بە ئەخلاق و ڕەوشتی پیاوانە و بە ڕاستی و پاراستنی ڕاز و سڕی هاوڕێیان و دۆستان ئەبێ .

| | |
|---|---|
| ڕۆڵەی دڵبەندم ، مایـەی ژیانـم ! | ڕۆناکی دیـدە و شەوقی بەیانم ! |
| لەبەر نزیـکی بە دەرسی ئەنجـام | چەند پەندێ ئەڵێم بەسوود بۆ ئەییام |
| بیکەن بە ئەڵقەی گوشەوارەی دڵ | بۆ ئاسانی ژین ، بۆ حەللی موشکول |



| | |
|---|---|
| گیانلەبەر بەرگەی گـەردوون ناگرێ | هەزار سـاڵ بژی ، نەڵێ نامـرێ |
| کەواتـە بـژێ ژینێـکی بەسـوود | بۆ دیـن و دنیا بگەی بـە مەقسوود |
| بێ‌دنیا دینت بـۆ ناچێتـە سـەر | بێ دینیش دنیـا زیانـە و خەتـەر |
| قەت سەرناکەوێ پیاوی بێ‌ئیخلاص | بێ‌ئیخلاص بۆخواو بێ‌خزمەت بۆناس |
| تا لە ئیخلاصدا نەبێ بـە قەقنەس | نابێ بـە مایـە بۆ ژیـانی کـەس |
| دەستووری مەردان مـەرگە بۆ ژیان | نامەردیش ئەژێ هەر بـۆ ئاو و نان |
| جا ئەگـەر مەردی بمرە تـا بژیت | گەر نامـەردیشی خـوا بکا بمریت |



| | |
|---|---|
| پشتیوان تەنها دوان بەسـوودن بۆت | یەکەمیان خودا و ئەوی‌تریان خۆت |
| هەرکەسێ خـودا نەناسێ بـە دڵ | زینهار قەت ناوی نەبەی بە عاقڵ |
| کەسێ قەدری‌خۆی بەڕاستێ نەگرێ | لێی دڵنیـا بە بـە جەفا ئەمـرێ |
| قەدری ئەوەیـە لەسـەر تێکۆشین | چاری خۆت بکەی بە بێ نەخۆشین |
| لەش‌ساغیت ئەوێ بە دەوا و دەرمان | یا بە صەدەقە و دوعای موسوڵمان |
| چاری دوژمنێ کـە خاوەن دەستە | یا ملی پەستە یـا شیری دەسـتە |

بەڵام کێ مەرد بێ ڕازییە بە مردن   نەك گەردن لەبۆ دوژمن کەچ کردن
بۆ هەر مەبەستێ کە تۆ بۆی ئەچێ   کە دەستت نەکەوت نائومێد نەبێ
دەرگای ذاتی حەق هەمیشە وازە   بۆ میهرەبانی هەمیشە سازە
ئەوکەسەی کاتی تەنگانە پەستە   نازانێ خودا دنیای بەدەستە
هەتیوێکی ڕۆت بێ ڕەنگ و بێ بۆ   بێ شافە و شۆرەت لەلای من و تۆ
ئەیکا بە سەردار بە سەر سوپادا   پاڵ ئەداتەوە لە خەیمەگادا



باوەڕت بە خۆت ئەبێ ئەستوور بێ   هێزی دەروونت لە پەستی دوور بێ
مەبە بە تەمای دۆست و ئاشنا   کەڕەتێ دیارن صەد کەڕەت پەنا
زوربەیان تویان بۆ خۆیان ئەوێ   بەڵکو سوودێکیان لە تۆ دەس کەوێ
کە سوودت نەبوو ئاشنا و ئەحباب   بەجێت ئەهێڵن تا ( یوم الحساب )
برادەر لە صەد یەکیان بەسوودە   صەد یەك بۆ حیساب وەکو نابوودە
بەش بە حاڵی خۆت خەڵکی ناناسێ   تا لێت نەقەومێ بە شێوەی ڕاستێ
کاتێ لێت قەوما بۆت دەرئەکەوێ   کێیە بۆ تۆیە و کێیە خۆی ئەوێ
کاتێ لافاوی مەینەت و بەڵا   بڵێی ئەمناسێ ؟ ئەڵێ : نەوەڵڵا
ڕۆژێ وا دۆستی ڕاس گەر هەڵکەوێ   هەزار نامەخوا و ماشەڵڵای ئەوێ



هێ وا ئەناسم بە جۆرێکی وا   لەگەڵ واقیعدا ئەیکەن بە هەرا
لە شاخی شەیتان قەت نایەنە خوار   لێك نادەنەوە قازانج و خەسار
زۆرداری کەوا بەدەسەڵات بێ   گەورەی بێ پرسی خەڵك و وڵات بێ
توخنی ناکەوێ ئەوەی وریا بێ   نەوەك لێیەوە تووشی بەڵا بێ
ئەوەی ئەزانێ ئەتدا بە عەرزا   پیا هەڵ مەشاخێ لە شوێنی بەرزا
کەسێ مەشهوور بێ بە ڕەوشتی بەد   مەیکە بە هاوڕێ تا ڕۆژی ئەلحەد
دڵت بە دۆستێ ئەوکەسە فێر بێ   کە بۆت دەرکەوێ نییەتی خێر بێ



مودارا لەگەڵ پیاوی بەدئەندێش   دڵێکی ئەوێ قایم و بە کێش
ئیدیعای شتێ ئەبوو بێ سوودە   شتی بێ دەلیل دوور لە مەقسوودە
خەنەی دوژمنان پزیسکی بەرقە   لەگەڵ بەرقی شیر کەمێکی فەرقە
ئەویان لەسەر لێو ئەم لە دەستایە   ئەو لە بەرزایێ و ئەم لە پەستایە
پزیسکێ ئاگر بەسە بۆ شارێ   قسەیەك بەسە بۆ فیتنەکارێ
تاقە یەك پیاوی قسەزان بەسە   بۆ وەفدێ کەوا کاری بەدەسە
مشکێ بگاتە ناو کۆگای دەفتەر   دەفتەری ساغی لێ نایەتەدەر

نە خۆشیی زستان نە هۆشی مەستان نە هیوای مەردیی لە دەستەی پەستان
بەکورتیی هەرکەس مـادّە پەرستـە بیشگاتە میرزیخ هێشتا هەر پەستە

★ ★ ★

دەستوپێی گەوران بێفام و هۆشن بو سەلب و ئیجاب دائیم پەرۆشن
گەورە چـی بلـێ حـازر بـەدەستن لایان چونیەکە بـەرزن یـا پەسـتن
چونکە بێمایە و بێهـۆش و فـامن صەدسالّ ببرژێن هێشتا هەر خامن
جا یا دۆرکەوە لـە دەور و بـەریان یـا بـە مـودارا بڕۆ بـۆ سـەریان

★ ★ ★

دەخیل صەد دەخیل بەقەدری ئیمکان بە مونافەسە قـەت وەرمەگرە نـان
ئەو ( بەرانبەرکێ ) بـۆ دنیـا ئەکرێ نەقصە و زیانە لـە ئاین ئـەدرێ
نە ژین بە مەرام نـە دین بـە ئارام بـە مونافەسـە نایـەنـە ئـەنجام
بێ بەرانبەرکێ پیـاز و نـانی سوێر چاترە لە هەڵپە بـۆ کەرە و پـەنێر

★ ★ ★

پیاوی بـەختەوەر نیشـانەی وایـە تاوێ عومری خـۆی نـادا بـە زایە
ڕۆژ ئەڕوا و شەو دێ و ڕۆژ ئەبێتەوە کـاتی ڕابـوردوو نـاگـەڕێتـەوە
کات بە ثانیە و دەقیقـە و سـەعات لەئەستۆیایە چـەند مەسئولییات
ئەختێکی بـەنرخ بـە وێنەی ژیـان نـابێ ڕێ بـدەی بـڕوا بـە تـالان
ژین ئـەو ژینەیە کـە بەهرەمەند بێ کە بەهرەی نەبێ یاخوا بـە پەند بێ
شـەو موتالاتکرد سـبەینێ مـەلای ڕۆژ کاسبیت کرد لـە مـالا ئاغای
چیت نووسی لەسـەر لاپەڕەی ژیـان ناکوژێتـەوە بـە تـوولی زەمان
وەخت لای ئینسـانی بەوێڵ و بەفام ئەختێکە نرخی قـەت نـابێ تـەمام

★ ★ ★

کـارێ بـە نامـە بکاتـە ئەنجـام نامەی تیـا بەسە بـو کەسبی مەرام
ئەگەر پێویسـتی بـە پەیامبـەر بێ ئەبێ پەیامبـەر زۆر هونەروەر بـێ
ئەگەر پێویستی بـە نەفسی خۆت بێ پێویستە ئاگات لە قورسیی خۆت بێ
جیهـان سـەرانسەر ئـەوە ناهێنێ کە لەپێناویا پایـەت ژەنـگ بێنـێ
با لەگەڵتا بـێ بـەگوێرەی ئیمـکان یارمـەتیت بـدا یـەکێ لـە یـاران

★ ★ ★

هەموو گیانداری گیـانی خۆشئەوێ هەموو هوشیاری شـانی پێ ئـەوێ
مادەم هەولّی مەرد بۆ گیان و شـانە حـەرامە هـەوڵت بـە نامـەردانـە

# گوڵی پەنجاوسێ ـ گوڵی گەڕانەوە بۆ لای خوا

**عافیبەت لەسەر پایەی تەقوایە**
**عاقیبەت خەیریش لەلای خودایە**
**بۆیە پێویستە بگەڕێینەوە**
**بۆلای ئەو خودای تاق و تەنیایە**

خوای تەعالا فەرموێەتی :

**وَمَنْ تابَ وعَمِلَ صالِحاً فَاِنَّهُ يَتوبُ اِلى اللهِ مَتاباً .**

واتە : ئەوکەسەی بگەڕێتەوە بۆلای خوا و دەس‌بەرداری ئەو تاوانانە بێ کە کردوونی و دەس‌بکا بە کردەوەی باش باش بەجێ هێنانی ئەوەی فەرمانی پێ دراوە بیکا و باش دەس‌بەرداربوون لەو کردەوانەی کە مەنعیان لێ کراوە ، ئەوە بەڕاستی گەڕاوەتەوە بۆلای خوای میهرەبان و گەڕانەوەکەی لێ قوبوڵ ئەکرێ و بە ڕەحمی خوا شاد ئەبێ .

تەوبە ، واتە گەڕانەوە بۆ دەرگای خودا بریتییە لەوە کە ئادەمیزاد هەرچەند بەهۆی سەرکەشێ نەفس و غرووری جوانێ و بەهۆی بەدخوویێ سروشت و هێرشی کینەی شەخسییەوە گوناهی کردبێ و حەقی خوا و خەڵکی کەوتبێتە سەر، پێویستە بیربکاتەوە و پەشیمان ببێتەوە لەو تاوانانەی کردوونی و هەر حەقێکی غەیری بەسەرەوەیە بیانداتەوە ، یاخود کارێك بکا کە گەردنی ئازاد بکەن و لێی خۆش ببن و ، بڕیاربدا لەوەوپاشیش نەگەڕێتەوە بۆسەر وێنەی ئەو تاوانانە . جا لەبەر ڕووناکێ ئایاتی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا درودی خوای لێ بێ ئەم شەخصە خوای تەعالا تۆبەکەی لێ قوبوڵ ئەکا و بەڵکو لەسەر ئیخلاص و پاکێ دڵی لە تاوانە پێشووەکانیشی خۆش‌ئەبێ و بۆی ئەگۆڕێتەوە بە کردەوەی چاك و پاداشی چاکی بۆ ئەنووسێ .

ئادەمیزاد مادەم بە دڵ بیربکاتەوە لەم بارەگای جیهانە و لەم نەخش و نیگارە جوانە ، باوەڕێکی تەواو پەیدا ئەکا بەوە کە ئەم عالەمە پێویستە پەروەردگارێکی ببێ و نیظام و یاسایەکی ببێ بۆ ئەوە کەس تەجاوز نەکاتە سەر حەقی کەس و ئەو فرمانانەی کە ئینسانیان پێ ئەبێ بە ئینسانێکی تەواو بەگوێرەی حاڵی خۆی جێ‌بەجێیان بکا . لەم‌لایشەوە بەهۆی تەماشاکردنی قورئان و سەیرکردنی مێژووی ڕەوشتی پێغەمبەرەوە درودی خوای لێ بێ و ئەو موعجیزانەی کە بێ‌گومان و بە شێوەیەکی ڕاست گەیشتوون بە ئێمە ، ئینسان بەڕاستێ ئیمان پەیدا ئەکا بە خودا و پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ و بە هەر ئایین و نیظامێ کە لەلایەنی پێغەمبەرەوە بە ئێمە گەیشتبێ . لەو ئایین و نیظامانەشە کە لەوەوە بە ئێمە گەیشتوون ئەمە کە پێویستە ئینسان لە

بیروباوەڕ و وتار و کردەوەدا لە سنوری شەرع دەرنـەچێ و ، ئـەگەر هاتو بەهۆی ئارەزوبازێ یا ڕەذیلەی نەفسەوە لایدا زوبەزو بگەڕێتەوە بـۆ سـەر ڕێگای ڕاست و عوزر بێنێتـەوە لای بارەگای پـەروەردگار . بـەمە ئـەڵێن ( تەوبە ) .

لە گەلێ ئایەتی قورئاندا باسی تەوبـە کراوە و هانی موسوڵمانان دراوە کەوا تەوبە بکەن و پێغەمبەر فەرموێەتی ئەگەر ئینسانێکی شەل و کوێر و کەڕ سواری وشترێ بێ و هەمو پێویستێکی ژیانی لەسەر پشتی وشترەکە قایم کرابێ و ئەو وشترە بەهۆی ڕوداوێکەوە لەو کابرا شەل و کوێر و کـەڕە ون بێ ، جا کابرا پاش ئەوە کە زۆر هـاواری کرد و کـەس بەفریای نەگەیشت نائومێد بێ لە وشترەکەی و لە ژیانی خۆیشی و ، لەم کاتی ماتێ و نەهاتییەدا وشترەکەی بێتەوە بەردەستی ، چەند شـادمان و کەیفخۆش ئـەبێ ، ( بلا تشبیە ) خوای تەعالایش لەوە زیاتر بە تەوبـەکردن و گەڕانەوەی بەندەیەکی تاوانباری شادمان ئەبێ و وا لەو کابرا خۆش ئەبێ و تاوانەکانی ئەبەخشێ وەك هەرگیز تاوانی نەکردبێ ، وەکو حەزرەت درودی خـوای لێ بێ فەرموێەتی : « اَلتّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ کَمَنْ لاذَنْبَ لَهُ » واتە : ئەوکەسەی تەوبە بکا لە گوناه وەك کەسێکی لێ دێ کە هەر گوناهی نەکردبێ ، بەڵکو لە نەصصی ئایەتدا هەیە کە خودا لەجیاتێ تاوانەکانی کردەوەی چاکەی بۆ ئەنوسێ . خـوا لـە قورئاندا فەرموێەتی : « فَأُولٰئِكَ يُبَدِّلُ اللهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ » واتە : ئەوکەسـانە کە تەوبەیـان کردوە لە بیروبـاوەڕ و کرداری تاوانبـارێ ، خوا تاوانەکانی ئەوسایان بۆ ئەگۆڕێتەوە بە چاکە .

تاوانبار ئەگەر تەوبە نەکا لە تاوانەکانی ، ئەگەر تاوانەکانی بچوکیش بن ئەبن بە تاوانی گەورە ، چونکە تا تەوبە نەکا لەو تاوانانـە خـوای تەعالا تەوبە نەکردنەکەشی بۆ ئەنوسێ بە تاوانیتر و ئەیخاتە پاڵ تاوانە پێشوەکانی و پێکرا ئەبن بە تاوانی گەورە . بۆیە واجبە ئینسـانی تاوانبار گورج تەوبـە بـکا لـە تاوانەکانی و مادەم ئەم واجبەی فەوتاند تاوانبار ئەبێ . مـادەم بنیادەم سور بێ لەسەر تاوانی بچوك تاوانە بچوکەکەی بە بچوکێ نامێنێتەوە و گەورە ئەبێ ، بۆیە حەزرەت فەرمـوێەتی : « لا صَغِيرَةَ مَعَ الاصرارِ ولا کَبِيرَةَ مع الاِستِغفار » واتە : لەگەڵ سوربوندا لەسەر تاوان ، تـاوان تـاوانی بچوك نابێ و لـەگەڵ تەوبـە و داوای لێبوردنیشدا تاوانی گـەورە بـە گـەورەیی نامێنێتەوە .

( بزانن ) پێویستە ئادەمیزاد هەمیشە لەبەینی ترس و ئومێد ( خوف و رجاء )دا بێ . واتە ترسـی ئەوەی لە دڵدا بێ کـە خـوا سزای گوناهەکانـی لێبسێنێتەوە و هیوای ئەوە کە لە هەمو گوناهەکانی خۆش ببێ ، چونکە هەردو

سەرەکەی لای خوا ئاسانە . خوا لە قورئاندا فەرمویەتی : « نَبِّیءْ عِبادی اَنّی اَنَا اَلغَفُورُ الرَّحیمُ وَاَنَّ عَذابی هُوَ العَذابُ الاَلیمُ » واتە : ئەی پێغەمبەر بە بەندەکانمی ڕابگەیێنە کەوا من خوایەکی بەخشندە و میهرەبانم و کەوا سزایشم سزایەکی سەختە . پێویستە ئادەمیزاد بێباك و چاونەترس نەبێ لەئاست خوادا و ئاگای لە خوا هەبێ و بەهۆی نەفسانیەتەوە دەوام نەکا لەسەر تاوان ، وابزانێ بەسەر خوادا تێئەپەڕێ و تۆڵەی لێ ناسێنێ ، چونکە بنیادەم بەوە کافر ئەبێ . خوا فەرمویەتی : « فَلا یَاْمَنُ مَکرَ اللهِ اِلاّ القَومُ الخاسِرُونَ » واتە : کەس ئەمین نابێ لە عاجزبون و ئازاری خوا مەگەر ئەوکەسانەی کە ڕەنج بەخەسارن . هەروەها ناشبێ ئینسان نائومێد بێ لە ڕەحمەت و عەفو و چاوپۆشی خوا ، ئەگینا کافر ئەبێ . خوا خۆی فەرمویەتی : « اِنَّهُ لایَیْاَسُ مِنْ رَوْحِ اللهِ اِلاّ اَلقَومُ الکافِرونَ » واتە : ئەوانە نەبێ کە لە زیاندان ، کەس لە ڕەحمەتی خوا ئائومێد نابێ .

**ڕۆڵەی دڵبەندم ئەگەر تۆ ژیری — زانا و هوشیار و خاوەن تەگبیری**
**بڕوانە تاق و هەیوانی کەیوان — خەیمە و بارەگا و میزانی جیهان**
**نەخش و نیگاری ڕۆژ و ئەستێران — کێو و دەشتی پان شیاوی سەیران**
**کانیاو و چەم و ئەرز و بێشە و باخ — مێرگ و مێرغوزار گوڵباخی پەرداخ**
**هەمو بە هێزی قودرەت کراون — بۆ ئاسایشی تۆ دانراون**
**خوا تۆی دروستکرد تا خۆت بناسی — ئەمجار دەستبکەی بە خوداناسی**
**بە بیروباوەڕ بە کردەوەی چاك — پایەت بگاتە بەرزتر لە ئەفلاك**
**بە ئینسانییەت وێنەی فریشتە — لادەی لە هەرچی ڕەوشتی زوشتە**
**تا ئەم جیهانە بە تۆ ئاوا بێ — نەك پەڕەی مێژو بە تۆ ڕسوا بێ**
**زۆر عەیبە کە تۆیش وا بێوەفا بێ — لەبەر سەرکێشی ڕۆ لە جەفا بێ**
**ئاخر پێم بڵێ بۆچی ناسازی ؟ — بۆچی بێباکی و بە چی ئەنازی ؟**
**دڵت ئەوەستێ بە یەك هەناسە — ئەمری و ئەزانی قسەی من ڕاسە**
**یا بە قومێ ئاو گیرایە گەروت — ئەمری و ون ئەبێ سوراێ لە ڕوت**
**لەپاش مردنیش بەرزەخ مەقەڕە — بۆ چاکان نەبێ ئاگری شەڕە**
**لەپاش بەرزەخیش ڕۆژی ڕەستاخێز — نیە مەیدانی بەرتیل و گوریز**
**بۆ حیساباتت دیوانێ هەیە — بۆ چاك و خراپ میزانێ هەیە**
**خودای تەعالایش بینا و زانایە — بە نێك و بەدی تۆ ئاشنایە**
**لای ئەو ڕونە کە سەراسەر جیهان — یەکسانە لای ئەو ئاشکرا و پەنهان**
**کە خەبەرداری لە زمانی خۆت — بیر بکەرەوە بۆ دەرمانی خۆت**
**ئیستە فرصەتە وای لە ژیانا — خۆت بۆ نوقمئەکەی لەناو تاوانا**
**لە کردەوەی بەد بگەڕێرەوە — لەلای خودای خۆت بپاڕێرەوە**
**وەکو مەسینەی ئاسنی حەوجۆش — لە ترسی خودا ساتێ بێرە جۆش**

تۆبـەیێ بکـە بـە ئیخلاصـــی دڵ | تا دڵ بە ئیخلاص بێتـە کەفوکوڵ
هەرچیت کردوە گونـاه و تـاوان | ئەسری بۆ هەڵکە وێنەی شـەتاوان
داوێنەی خەڵکێ بگرە بـە دۆ دەسـ | بەڵ بۆ ئازادیت بـن بـە فریادرەس
پەیمـان ببەستە تـا هێـزت مـاوە | تـاوان و گونـاه بخـەیتـە لاوە
بـەمجۆرە بڕۆی بـە ڕێـگەی ڕاسا | ڕۆ بکەیتە خـوا لـەگەڵ ئیخلاصـا
بـە هێمنێ دڵ ئـەحـەسـێتەوە | دەرگای ئیحسـانت بـۆ ئـەکرێتەوە
خوایە صـەد تەوبە بە ئیخلاصی دڵ | بمبەخشـە بـە شای (سید الرّسل)
برژێ بەسەریا صـەلات و سـەلام | بە تاوی ( بەهار ) تـا کـاتی ئەنجام

## گوڵی پەنجاوچوار ـ گوڵی پاڕانەوە

ئەوەی بـۆلای حـەق بگەڕێتـەوە
پێویسـتـە بـەکوڵ بپاڕێتـەوە
ڕۆحـی عیبـادەت پاڕانـەوەیە
نـابێ بـە هـەوا بسـوڕێتەوە

خوای تەعالا لە قورئاندا فەرمۆیەتی :

**ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ**

واتە : بانگم لێ بکەن دێم بە دەنگتانەوە . مەبەستی لەوەیە دوعاکەتان قوبوڵ ئەکەم و مرازتان ئەهێنمەدێ .

پاڕانەوە ئەوەیە ئادەمیزاد دڵخوازی خۆی بە کزێ و دامـاوێ و لارەملێ لە خوای تەعـالا داوا بکا ، خواه دڵخوازەکەی دەسکەوتنی قازانجـێ بێ یا لابردنی زیانێك . دیارە هەر خودا خاوەنی کائیناتە و هەرچێ خواستێکی هەبێ ئەتوانێ بیکا . پاڕانـەوە بە مۆخ و ناوکورۆکی خواپەرستێ دانـراوە ، چونکە مەعناکەی بریتییە لـە ئیعتیراف کردن بە توانایێ خوا و دەسـەڵات شکانی بەسـەر هەمۆ شتێکدا و ، مل کەچکردنە بۆی . بەندەییش بەڕاستێ ئەمەیە ، بۆیە پێغەمبەر درۆدی خوای لێ بێ فەرمۆیەتی : « الدُّعاءُ مُخُّ العِبادَةِ » واتە : پاڕانەوە لە خوای تەعالا مۆخی عیبادەت و بەندەییە بۆ خوا .

بناغەی دوعا و پـاڕانەوە ئەوەیـە خوای تەعـالا ئەم دنیـایەی لەسەر ئەسباب داناوە و هەر شتێکی بەستوە بە سەبەبێکەوە . بەڵام سەبەب و هۆی هەندێ شت تەنهـا لە عیلم و زانستی خۆیدایە و ئادەمیـزاد مەجـاڵی نیـە تێیبگا . ئەم جۆرە بابەتانە بەر قەضا و قەدەری موبرەم واتە قەزا و قەدەری پێویست و بڕیار لەسەر دراو ئەکـەون . ئەسبابی گەلێ شتیش وا دانراوە

دەستی گیانلەبەریان پێ ئەگا بەتایبەتێ ئادەمیزاد ، جا ئەگەر هۆیەکەیان بێتەجێ ئەبن و ئەگەر نەیەتەجێ نابن . ئەم جۆرە بابەتانە بەر قەزا و قەدەری موعەللەق ئەکەون یەعنی جێبەجێبونیان بەسراوە بە بونی ئەسبابەکانیانەوە ، هەرچەند لە عیلمی خوا خۆیدا کە پێیئەڵێن ( امّ الکتاب ) ڕابوردوە ئەو شتە ئەبێ یا نابێ و بڕاوەتەوە چونکە خوا ئاگادارە لەو سەبەبە کە ئەبێ بەهۆی بونی یا نەبونی .

جا ئــەم ئەسبابانە هەندێکیان مــادّی و مەحسوسن وەك خــواردن و خواردنەوە و دەرمانکردن و شتیوا . هەندێکیشیــان مەعنەوین و بــە چــاو نابینرێن و لــە مەعقولاتن وەکو صەدەقەکــردن بۆ چاری دەرد و بــەلا وەکو حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرمویەتی : « الصَّدَقَةُ تَسُدُّ سَبْعِينَ باباً مِنَ السُّوءِ » واتە : صەدەقە و خەیراتدان بە داماوان ، حەفتا دەرگای ڕوداوی خراپ ئەبەستێ و مەجالی دەرکەوتنیان نادا . هەروەها فەرمویەتی : « الصَّدَقاتُ بالغَدَواتِ يَذْهَبْنَ بالعاهاتِ » واتە : صەدەقە و خێرکردن بە سبەینان ئافات و بەلا و ئازار ئەڕەوێنن . هەروەها هۆی مەعنەویێ وەکو دوعا و پاڕانەوە لە خوای تەعالا ، وەکو خوا لە قورئاندا فەرمویەتی :« أَمْ مَنْ يُجِيبُ المُضْطَرَّ إذا دَعاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ » واتە : یا ئەوکەسە کێیە لە خوا بەولاوە کە دوعای داماوی ناچار قوبوڵ ئەکا کە لێی بپاڕێتەوە و هاواری بۆ بەرێ و ئــەو دەرد و مەینەتەی بەسەریا هاتوە لەکوڵی ئەکاتــەوە ؟ دیارە ئەوکەسە هــەر خودایە . یا وەکو حــەزرەت فەرمویەتی : « الدُّعــاءُ يَرُدُّ البَلاءَ » واتە : پاڕانەوە لە خوای تەعالا دەرد و بەلا ئەگێڕێتەوە بە خواستی خوا . هەروەها فەرمویەتی : « الدُّعاءُ يَنْفَعُ مِمّا نَزَلَ وَمِمّا لَمْ يَنزِلْ ، فَعَلَيْكُمْ عِبادَ اللهِ بِالدُّعاءِ » واتە : دوعا و پاڕانەوە لە خوا قازانج ئەگەیەنێ بەرابەر بەو دەردەی هاتوەتە خوارەوە یا دێتە خوارەوە . بۆ یەکەم ئەبێ بەهۆی سوكبونی ئەو دەردە و بۆ دوهەم ئەبێ بە چارە و حەسار و نایەڵێ بێتە خوارەوە .

جا تەماشائــەکەین وەك چۆن کشتوکاڵ و ئاڵوویــڵ و پیشەسازێ ئەسبابی سود دەسکەوتنن لە ژیانا و ، دەرمانکردن و خزمەتی نەخۆش ئەبن بەهۆی شــیفا و چاكبونەوەی نەخۆش ، هەروەها صەدەقە و خەیــرات و دەست و دەهەندەیش هۆی مەعنەوین بۆ شیفای نەخۆش و بۆ چاری دەرد و بەلا و ئازار . ئەمە بۆ ئەوکەسانەی کە ئیمان و باوەڕیان بە ئایەت و فەرمودەی پێغەمبەر هەیە ئاشکرایە و جێگای گومان نیە . جا ئەم صەدەقە و دوعایە خاوەن دەردەکە خۆی بیانکا وەك عادەتوایە لای ئێمە ، یا یەکێکیتر بیانکا مەسەلا کە بیستت ئاشنایەکت نەخۆشە صەدەقەیەك بکەی بەنیازی چاكبونەوەی یا دوعای خێــری بۆ بکەی ، هەر بەســودە ، یاخود یەکێ پەنا بەرێتــە بەر

پیاوێکی دڵ و دەروون پـاك کە دوعای خێر بکا بۆ نەخۆشێ ، ئـەوەیش هەر بەسوودە . ئەوەتە مەشهوورە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێ ئەمری فەرموو بە حەزرەتی عومـەر خوای لێ ڕازی بێ بڕوا بۆ مەککە بۆ ئاگاداری لـە وەزعی حاجییەکان و کە کەوتەڕێ پێیفەرمـوو فەرامۆشمان مەکە لە دوعای خێر . مەشهووریشە هەروا بە حەزرەتی عومەری فەرموە : هەروەختێ لەمەوپاش کۆمەڵێ یەمەنی هاتن بۆ لات کوڕێکـی گەنجیـان تیابوو ناوی ( أُوَيْس ) بـۆ ، سەلامی منی پێبگەیەنە و داوای دوعای خێری لێ بکە . هەروا مەشهوورە حەزرەت دوعای خێری بۆ گەلێکەس کردوە لە ساغ و نەخۆش و گەورە و مناڵ و ئەوانەیش سوودیان لەو دوعای خێرە وەرگرتوە .

هەروا ڕەوایـە و سوننەتی دینە ئینســان داوای دوعای خێـر بکا لە پیاوچاکان و لە پاشملەیش دوعای خێر بکا بۆ برای دینی خۆی وەکو حەزرەت فەرمویەتی : « أَرْجَى الدَّعَوَاتِ دُعَاءُ الأَخِ لأخِيهِ بِظَهْرِ الغَيْبِ » واتە : نزیکترین دوعا لە گـیرا بوونەوە دوعای برایە بۆ برا لە پاشـملە . هەروا لە ڕیوایەتی صەحیحـدا دەستگیرمـان بوە کەوا خوێندنەوەی ئـایەت بەسـەر ناساغ و برینـدارا سوودی هەیە وەکـو مەسەلەکەی ( أبوسـعیدی خدری ) و دەشتەوانە عەرەبە پیرەکە کە ابوسعید سوورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند و خوا بە بەرەکەتی ئەوەوە شیفای بۆ نارد . لەم ڕووداوەدا ابوسعید چەند سەری حەیوانیشی لە عەرەبەکە وەرگرت . کە هەواڵەکەشیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ناڕەزایی خۆی لێ پیشان نەدا و تەقریری کرد .

ئەوەی کە هەندێ کەسی بێئاگا لە کاروباری دین ئەیڵێن کەوا خوا خۆی ئاگای لە هەموو شتێك و لە هەموو کەسێ هەیە ، ئیتر بۆچی ئینسان خۆی دوعا نەکا بۆ خۆی و بۆچی یەکێکیتر دوعای بـۆ بکا ، لەگەڵ ڕێوشوێنی دیندا ڕێناکەوێ چونـکە بە ئایـەت و حەدیث و مێـژووی گەورە پیـاوانی ئیسلام دەرکەوتوە کەوا حەزرەت درودی خوای لێ بێ بەو شێوە دوعاکردنە ڕازی بوە و ئەمری بـە موسوڵمانان کردوە کـە دوعایوا بۆ یەکتری بکـەن و زانـا گەورەکانی ئیسلامیش لەسەر ئەم ئوسوڵە بەڕێدا ڕۆیشتوون . ئیتر هەرکەس بەپێچەوانەی ئەوە قسە بکا قسەکەی بێجێیە .

حەزرەت درودی خوای لێ بێ فەرمـانیداوە بەخەریکبوونی ئەسبابی ئاشکرایش ، وەك ئەوە کە ئەفەرموێت : « دَاوُوا مَرْضَاكُمْ ، فَإِنَّ لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءً إلاَّ السَّامَ » واتە : تیماری نەخۆشەکانتان بکەن چونکە بەڕاستی هەموو دەردێ دەرمانی هەیە مردن نەبێ . کەواتە پێویستە ئادەمیزاد بە هەموو جۆرێ هەوڵبدا بۆ ڕزگاربوونی خۆی و پەیوەندی و باقی موسوڵمانان بە هەر شێوەیەك بۆی ڕێکەوێ ، بەهۆی ظاهیری و بەرچاوی یا بەهۆی پەنامەکی و مەعنەوی و ئەمە ڕێ و شوێنی ئایینی ئیسلامە .

